
چاپی پانزەیەم
عەزیز نەسین
گێلە پیاو
وەرگێرانی
عەبدوڵڵای حەسەن زادە

# گێلە پیاو

عەزیز نەسین

وەرگێرانی
عەبدوڵڵای حەسەن زادە

٢٠١٣

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

# ڕۆژهەڵات

خاوەنی ئیمتیاز

**کەژاڵ رەفیق**

سەرنووسەر

**حەسەنی دانیشفەڕ**

Email: rojhalatpress@yahoo.com

Mob: ٠٧٥٠ ٤٤٩ ٣٥٦١

**هەولێر ـ (١٠٠) مەتری ریزی شەقامی کارگەی دەرمانی ئاوامیدیکا**

♦ ناوی کتێب : گێله پیاو
♦ ناوی نووسەر :عەزیز نەسین
♦ وەرگێڕانی :عبدالله حسن زاده
♦ دەرهێنانی هونەری ناوەوەو بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
♦ له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانه گشتییەکان ژمارەی سپاردن
( ٦٤٧ ) ساڵی ٢٠٠٩.
♦ نرخ: (٥٠٠٠) دینار
♦ نۆرەی چاپ : چاپی پانزەیەم 2015
♦ شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلات-هەولێر

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

**سەلام محەمەد رەسول**

شوێنی دابەشکردن:

**ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاْوکردنەوە**

با زۆر لەسەر ئەوە نەڕۆین کە چۆن تووشی بەندیخانە بووم. هەرچۆنێك بوو کەوتمە داوو هەر ئەوەندەم زانی لە پلیکانەکان بردیانمە خوارو بە (ئاخ...تف) و مۆرە مۆرەوە وێنەیان گرتم و پەنجەمۆریان پێکردم و دایانکردمەوە بەندیخانە ! ! نازانم ئێوەش ئەم دیمەنەتان دیتوە یان نا؟ جاران منداڵی شەیتان و قوماربازی پشیلەیەکیان داویشتە ناو تورەکەیەك و ماوەیەك لەسەر سەری خۆیان هەڵیان دەسووڕاند. ئەمجار دەریان دێناو مشکێکیان بۆ فڕێ دەدا. پشیلەی بەستەزمان ئەوەندە گێژوکاس دەبوو تا ماوەیەك تەنانەت ئاوڕیشی لە مشکەکە نەدەدایەوە. ئەو ڕۆژەی چوومە دالانی بەندیخانە ڕاست خۆم وەك ئەو پشیلە دەهاتە بەرچاو. ئەوەندە گێژو وڕ بووم تەنانەت گوێم لە دەنگی ئەو دووسێ کەسەش نەبوو کە لەدەورم هالابوون و دڵخۆشییان دەدامەوە، بەڵام چونکە مرۆڤ لە بەرامبەر پێشهاتەکان دا زۆر نەرمەو زوو خۆ بەدەستەوە دەدا، منیش زۆر لەوەی بیرم لێ کردبۆوە زووتر ڕاهاتم. بەتایبەتی ڕووداوێکی تازە زیاتر بوو بەهۆی ئەو گۆڕانەم.

وەك هەتیوان ئامێزم بە ئەژنۆی خۆم دا کردبوو، بە خەم و خەفەتی خۆمەوە خەریك بووم، لەپڕ هەراو هۆریایەك لە دالانەکان بەرز بۆوەو کۆمەڵێك لە بەندیەکان بەرەو دەرگای دەرێ غاریان دا. هێندێك بە پێکەنین و هێندێك

بەتەوس‌وپلار هەرکەسە شتێکی دەگوت. لەو ناوەدا من تەنیا لە وشەی " گێلە پیاو" حالی دەبووم. ئەوەندە تێگەیشتم کە گرتوویکی تازەیان هێناوە، زۆربەی کوڕەکان دەیناسن. هەر کەسە قسەیەکی دەکرد... کوڕینە "گیلەپیاو"یان هێنایەوە.

ـ ئۆی، بڕوانە سەرو گوێلاکی!

ـ بۆتە چۆن پیاوێك!

ـ هێشتا جێگاکەی کۆ نەکراوەتەوە هاتەوە!

ـ بەوەی دەڵێن پیاوی تەواو.

ـ تەماشای کاکی موهەندیس!

خەم وخەفەتی خۆم لە بیر چۆوە، وێڕای خەڵکەکە چوومە بەردەرگاو چاوەڕێ بووم بزانم ئەو "گیلە پیاوە" کێیە کە کوڕەکان وا بەگەرمی پێشوازی لێدەکەن. "سولەیمان دایکی خۆفرۆش" بە دەنگێکی بەماناوە گوتی: بزانین ئەمجار چی کردوە؟

"مراد ورچ خنکێن" لەپشتەوە وەڵامی دایەوە: یان بۆتە قایمقام یان بۆتە پارێزگار.

"گێلە" تازە گەیشتبووەجێ "بابا زەکەریا" خەریك بوو گیرفانەکانی دەپشکنی. بە تانووتەوە گوتی: سەگباب کوێرا ڕۆیشتی و کوێرا هاتیەوە؟.

"گێلە" بەو تەشك ودیمەنە تایبەتیەی خۆیەوە قاقایەکی کێشا: بە ڕاستی بێئێوە ناژیم.

یەکێك لە مووچەخۆرەکان لە پشت مێزەکەیەوە هەرای کرد: ـ بلیتی ئەم سەرئەو سەری کڕیبوو!!.

"بابـا زەکـەریا" پشـکنینەکەی تـەواو کـرد. کاتێـك پارەکـەی ئـەژمارد بـە مۆڕەیەکەوە گوتی: ـ ئەمە هەمووی سەد لیرەو دە پازدە قڕوشە!

ـ هەر ئەوەیە لە بەر چاوانە.

ـ سەگباب ئەوەکەی ترت لەکوێ داناوە؟

ـ بەخوا هەر ئەوەندەیە.

ـ وادیارە ئەمجارە هیچت بۆ دەداو نەکەوتوە!

"بابازەکەریا" جزدانەکەی دایەوە دەست "گێلە" و بردیە ژوور!!

کەسێك "گێلە"ی نەناسیبا دەیگوت پیاوێکی تەواوە! بە پاڵتۆی تووکە وشترو دەسـتەوانەی قـایش و چـاکەت و پـانتۆڵی ڕەش و کەوشـی بریقـەداری هـەر وەمیلیۆنێران دەچوو.

کاتێك گەیشتە ژووری بەندیخانە دەستی دەنـاو دەسـتی کوڕەکـان نـاو چـاك و چۆنی لەگـەڵ کـردن و پاشـان وەك لـە سـەفەرێ هاتبێتـەوە یەکسـەر چـووە هۆدەکەی خۆی جلکەکانی داکەندو چووە حەمام!!!

من هەروا لە قوژبنێك دانیشتبووم و سەیری ئەو دیمەنەم دەکرد. زۆرم پێخۆش بوو بزانم بۆ بەو پیاوە دەڵێن "گێلەپیاو" بەڵام سەرم لـێ دەرنەدەچوو."

"گێلە" وەك تازە زاوا بە تاس و لووسـی لـە حـەمام هاتـەدەرو لـەکاتێك دا بـە سەرلەقاندن چاك وخۆشی لەگەڵ کوڕەکان دەکـرد ڕاسـتەڕێ چـووە چـاخانەی بەندیخانە. هەر وەك موقنـاتیس ڕامکیشـێ، ڕۆیشـتم بـۆ چـاخانە. "گێلـە" لـە ناوەڕاستی کوڕەکـان دا دانیشـتبوو، سـەری قیـت ڕاگرتبـوو و زۆر بـە مەنـدیەو سەنگینی چای دەخـواردەوەو بەسـەرهاتی دووسـێ ڕۆژی بەرەڵابوونەکـەی بـۆ دەگێڕانەوە. لەناکاو چـاوی بـە مـن کـەوت. نـازانم بـە چیـم تێگەیشـت کـە بـە زمانێکی تایبەتی و بە ئەدەبەوە بانگی کرد:

ـ کاکە فەرموو بۆ ئێرە.

هەموو بەندیەکان تەماشایەکیان کردم، منیش وەك منداڵ نامۆییم دەکردو لە قوژبنێك ڕاوەستابووم نەم دەزانی چبکەم. "گێلە" بە دەنگێکی بەرزتر بانگی کرد:

ـ فەرموو کاکە! لێرە هەموومان براین... وەرە لای ئێمە... بۆچی نامۆییمان لێدەکەی؟

خەریك بووم بگەڕێمەوە شوێنەکەی خۆم، بەڵام کوڕەکان قۆڵیان گرتم و بردیانمە لای گێلە. ئەویش بە پەرۆزێکەوە فەرمانی دا:

ـ "قەدری" چایەکی جوانی بۆ بێنە.

دوایە رووی کردە من:

ـ تۆ تازە هاتووی بۆ ئێرە؟

لە سەرەخۆ وەڵامم دایەوە:

ـ بە... لێ.

یەکێك لە کوڕەکان بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ هێشتا نمەکی بەندیخانەی نەکردوە!

کوڕەکان دایانە قاقای پێکەنین و گێلە بە چاوە چکۆڵەکانی مۆڕەیەکی لێکردن و لە منی پرسی:

ـ کارت چیە؟

بۆخۆم بێدەنگ بووم بەڵام یەکی تر وەڵامی دایەوە:

ـ ڕۆژنامەنووسە.

گێلە بە چاوی گاکرین سەیرێکی سەرتاپای کردم و لەگەڵ کوڕەکان کەوتە قسە:

وەختی شێوخواردن گێلە منی بردە هۆدەکەی خۆی و دووبەتانی و سەرینێکی لە برادەرەکانی بۆ وەرگرتم.

بەکورتی ئەوەندەی دڵنەوازی کردم کە ئێش و ئازاری بەندیخانەم لە بیر چۆوە، کاتێك دوو جگەرەی بۆنداری داگیرساندو یەکێکی دایە دەست من، بێ سێودوو کردن لێم پرسی:

ـ جەنابت بۆ گیراوی؟

ـ لەسەر شامیکەباب!

زۆرم پێ سەیر بوو، گێلە قاقا پێکەنی و گوتی:

ـ بەڕاستیمە، تەواوی بەدبەختی و چارەڕەشی من لەچەند دانە شامیکەبابەوە دەستی پێ کردوە!!

زۆر لەمێژە سزای ئەو شامی کەبابانە دەچێژم، پێنج شەش ساڵە خۆم لێ ون، بووە، هەر ڕۆژەو هەر هەفتە دەچمە کەوڵێکەوە. ئێستاش کە لەگەڵ تۆ دانیشتووم نازانم کێم. ڕۆژێك بوومە پشکنەر (مفتش)، وەختێك بوومە پزیشك، ماوەیەك موهەندیس بووم. بەکورتی بوومە هەموو شتێك خۆم نەبێ. ئەگەر یەکێك لە پشتمەوە بانگ بکا عەلی، ئەحمەد، حەسەن، من پێم وایە لەگەڵ منیەتی، چونکە سەد ناوم هەیە.

بە سەرسوڕمانەوە پرسیم:

ـ یانی چی؟

ـ وەڵامی ئەم پرسیارە هەروا سووك و هاسان نادرێتەوە، دەبێ سەرەتایەکی دوورو درێژی بۆ دابنێین. بەکورتی چارەنووس پیاوی تووشی زۆر بێنەوبەرە دەکا. کەس نازانێ سبەینێ چی بەسەردێ. دەبینی بە ڕێگادا دەڕۆین، لەناکاو لەبەردێك هەڵدەنگووین یان لە جۆگەلەیەك دەکەوین و هەر ئەمە لە پێشهاتێکی

گەورە ڕزگارمان دەکا. بەیانی لە ماڵ دێینە دەرەوە وەدوای کارێکی خۆمان دەکەوین، لە ڕێگا تووشی برادەرێك دەبین و دەمانباتە جێگایەك کە لەوێ ئاشقی کیژێکی جوان دەبین دەیخوازین. بە باوەڕی تۆ پیاو دەتوانێ ئەمە ناو بنێ چی؟ ها؟ ئەگەر لە بەردەکە هەڵنەنگووتباین، یان دەجۆگەلەکە نەکەوتبیان؟ یان ئەو برادەرەمان لێ پەیدا نەبوایە ژیانی ئێمە جۆرێکی‌تر دەبوو. بەسەرهاتی منیش شتێکی لەو بابەتەیەو لەسەر خواردنی چەند شامی-کەبابێك ڕووپەڕی ژیانم وەرگەڕا.

وردە وردە لەو سەرەتایە وەڕەز دەبووم و دەمویست زووتر دەست بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی بکا! گێلە مژێکی توندی لە جگەرەکەی داو گوتی:

ـ ئەودەم لەقوتابخانەی ناوەندی عەسکەری بووم.

لەناکاو بێدەنگ بوو چاوی بڕیە میچی خانووەکە. لە ڕووکاریدا دیاربوو کە بیرکەوتنەوەی ئەو بەسەرهاتە زۆری ئازار دەدا. هەناسەیەکی هەڵکێشاو لەسەرەخۆ گوتی:

ـ لەوماوەیەدا چیم بەسەر هاتوەو لە کوێوەو گەیشتوومە کوێ؟! داخی بەجەرگم لاوێتی و نەفامی بەرۆکی گرتم و بەدەستی خۆم قوڕم وەسەری خۆم کرد. هەر مەپرسە چەند قوتابییەکی زرینگ بووم. هەموو ساڵێك یەکەم یان دووهەم دەردەچووم. لە وەرزش دا هاوتام نەبوو. ساڵی دواییم بوو، پاش مانگ ونیوێکی دیکە دەچوومە کولێجی عەسکەری.

ئەودەم ئێمە نۆرە ئێشکمان هەبوو، هەرشەو یەکێك لە قوتابییەکان دەبوو ئێشك بگرێ. ئەرکی ئێشك گرەکان چاوەدێری دابەشینی خواردەمەنی بوو. هەر وەختێك خواردنی باشمان شك بردایە هەوڵمان دەدا بە هەرجۆر بووە یەکێك لە هاواڵەکانمان ئێشك بگرێ.

"چنگاڵ شاهین" ناوێکمان تێدابوو، هەرکاتێك نۆرە نێشکی بووایە هەمووماني خەنی دەکرد. بەڵام من بە پێچەوانەی هەموو کوڕەکان لەوبەشەدا دەستوپێسپی بووم و هەروەختێك ویستبام قاپەچێشتێك پاشقول بدەم هەموو گیانم دەلەرزی، ڕەنگم دەبزڕکاو ئارەق بەمووروەگەی پشتم دا دەهاتە خوار. هەر لەبەر ئەوەش ناویان نابووم "گێلە پیاو"و هەروەخت کەیفیان ساز بوایە سەریان داویشتە سەرم و گاڵتەیان پێدەکردم. شەوێ کاتی خەوتن یەکێك بەتانی لێدەرفاندم، یەکێك تنۆکەکەمی دادەکێشا. "بورهان شەیپووری" گووپی پڕ لەئاو دەکردو بەسەروچاویدا دەکردم، بەکورتی ئەوەندەیان ئازار دەدام کەناچار بووم منیش ئاکاری ئەوان ڕەچاوکەم. شەوێك کە نۆرە نێشکی من بوو کوڕەکان داوایان لێکردم کە بچمە مەتبەخ و خواردنی زیادی‌یان بۆبێنم. ئەمە ئەو کارە بوو کە من لێی دەترسام. گوتم:

- کوڕینە ئەمشەو "هەقی باڵیۆز" ئەفسەر نێشکە، بەڕاستی شتی وام لەدەست نایە. کوڕە هەست پێبکا ڕیشەم دەردێنێ. بەڵام ئەوان وازیان لێ نەهێنام "هەرکەس هەیە بەجەهەننەم".

- "ئەگەر دەترسی دەنگ بکە". هەرچونێك بوو وەسەر تەڵەیان پەڕاندم. هەرچەندە دەمزانی "هەقی باڵیۆز" پیاوێکی تووڕەو تۆسنە ڕۆیشتم بۆلای مەتبەخ. "هەقی باڵیۆز" ئەفسەرێکی کۆنەکار بوو. لەگەڵ ئەوەش کە خوێندەواری کەم بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی کارامەو دنیادیدە بوو کوڕەکان زراویان لێ چووبوو.

سەرو سیمایەکی سەیری هەبوو، لەسەر گۆنای کۆنە برینێك هەبوو هێندەی تری بەسام کردبوو. لە ئاکاری سووك بەتایبەتی پێکەنینی قوتابیەکان زۆر ڕقی هەڵدەستا. هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین "سەرباز دەبێ هەموو وەختێك

نێوچاوانی سێبەر بکا". ئەو هەرگیز لە قوتابییەکانی نەدەدا، بەڵام هاوار بۆ ئەو ڕۆژە کە تووڕە بوایە. ساڵی دوووسێجار تووشی ئەو نەخۆشی‌یە دەبوو، لە هەر کەس تووڕە بایە ئەندامی ساخی لە لەشی دا نەدەهێشت.

جارێکیان ئەوەندی لە "بورهان شەیپووری" دابوو بەستەزمان وەك تۆپ لەم دیوار بۆ ئەدیوار هەڵدەبەزیەوە.

لێم پرسی:

ـ ئەو برادەرەت بۆچی ناوی "بورهان شەیپووری" بوو؟

"گێلە" بەدەنگێکی بەرز پێکەنی و گوتی:

ـ هەر کام لە ئێمە ناوێکی هەبوو. هەمووی ئەو ناوانەش هۆی تایبەتی خۆیان هەبوو. بورهان شەیپووری هەمیشە گوێی بۆشەیپووری نان خواردن هەڵدەخست.

ئەمجار نەختێك ڕاماو گوتی:

ـ ئەو ئەفسەرەی ئێمە خاسیەتێکی باشیشی هەبوو. هەرکەسی تەمبێ کردبایە لە کۆتایی ساڵدا بە هەرفێڵێ و تەڵەکەیەك با دەری‌دەچوواندو لێدانەکەی بۆ تێ هەڵدێنایەوە.

"صالح شەمع" لە دەرسی جەبردا لە پاش بوو. هەمیشە سەری داویشتە سەر نەقیب، بەڵکوو لێدانێکی بەربکەوێ و نمرەی تاقیکردنەوەکەی بۆ مسۆگەر بێ. بەڵام "هەقی باڵیۆز"فێڵی لێ‌نەدەکرا. صالح شەمع لە پشتەوە خۆی لێ‌دەشاردەوەو وەك کاریلە دەیهێڕاند بەڵکوو نەقیب تووڕە بێ، بەڵام ئەو وەسەر خۆی نەدێنا.

ڕۆژێکیان نەقیب تووڕە بوو، صالح شەمع لە خۆشیان شاگەشکە بوو، وای زانی ئێستا لێدانێك دەخواو نمرەی تاقیکردنەوەکەی مسۆگەر دەبێ، بەڵام نەقیب

باڵیۆز ئەمجاریش لێی نەدا، گوێچکەی گرت و بردیە ژووری عەمبارودەرگای لەسەر داخست. ئێمە هەموومان لە پشت دەرگا وەستابووین دەمانەویست بزانین لە ژوورەوە چ باسە؟

ورتە لە ژوورەکە نەدەهات، یەکێك لەکوڕەکان گوتی "پێم وایە کوشتی".

پاش چەند دەقیقەیەك صالح شەمع هاتە دەرێ، سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەگیرا. گوتمان چ بوو؟ بە گریانەوە گوتی: "هەرچی کردم وکراندم لێی نەدام".

گێلە دوو جگەرەی تری داگیرساندو گوتی:

بۆ نەگبەتی شەوێك نۆرە ئێشکی من هات کە ئەو "هەقی باڵیۆز"ە ئەفسەرئێشك بوو. خۆ ئەگەر هەستی کردبا لە مەتبەخ خواردنی زیاد پاشقول دەدەم بۆحەوت پشتمی ئاقڵ دەکردم.

بەڵام چار نەبوو نۆرە ئێشکم وەرگرت، هاواڵ ئێشکی من لاوێك بوو بەناوی "بصری کتفی" ئەو ناوەمان بۆیە لێنابوو، چونکە لە کاتی توورەبوون دا شانی چەپی هەڵدەتەکاند. "بصری" تەمبەڵی ڕۆژگار بوو. هەر چۆنێك بوو ژوورەکانمان خاوێن کردەوە و بڕیارمان دا ئەو ئاگای لە بەشی ناوخۆیی بێ و منیش بەسەر مەتبەخ ڕابگەم و شەش دانە شامی کەبابیشی سەرڕا بدەمەوە!

بەم چەشنە رێك کەوتین و هەر کەس چووە سەر کاری خۆی.

دەڵێن بەرد لە ئاسمان بەر بێتەوە وەسەری پیاوی کلۆڵ دەکەوێ. هێشتا ڕۆژ ئاوا نەببوو خەبەریان هێناکە ئەفسەرێکی گەورە هاتوە بۆ پشکنین.

دەسبەجێ کوڕەکان چوونەوە پۆلی خۆیان و منیش چوومە مەتبەخ. ئەو ئەفسەرە گەورە لە پایتەختەوە هاتبوو، لە بەرئەوەی زۆر ماندووبوو چاوێکی

بە وڵات دا گێڕاو بڕیاردرا ئەو شەوە بحەسێتەوەو بەیانی کارەکانی جێبەجێ بکا.

"کەماڵ زەنگولە" هاتە لام گوتی:

ـ دەزانی ئەو ئەفسەرە چەند وەك تۆ دەچێ؟ لە پێشدا باوەڕم نەکرد، بەڵام دوایە کە "شاهین"و "بورهان شەیپووری"و چەند برادەری دیکەش باسیان کرد زانیم بەڕاستیانە.

تەنانەت یەکێك لە ئەفسەرەکانیش لێی پرسیم: "تۆ خزمایەتیت لەگەڵ ئەم ژەنراڵە هەیە؟" ئەم قسانە ئەوەندەیان خورتە خورت خستە دڵمەوە کە خەریك بووم بەو شەوە بچم چاوم بە ژەنراڵ بکەوێ. شەیپور لێ دراو هەموو قوتابیەکان لە حەوشەی کۆبوونەوە.

رەئیس "تەحسین" بانگی کرد:

ـ "رەئیس عورەفا ئێشك بێتە ئێرە؟".

دەسبەجێ چوومە پێش، پرسی: "کارەکانت رێك خستوون؟".

ـ "بەڵێ سەروەرم".

ـ "باشە زوو نان ساز بکەن".

پاش نان خواردن قابلەمەیەکی پڕ لە شامی کەبابم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ لای کوڕەکان. دڵنیا بووم ئەفسەرئێشك خەوتوە، بەڵام دیسان تێبینیم کردو بەبن دیوارەکەدا ڕۆیشتم، دەمەویست لە دەرگای پشتەوە بچمە ژوور. ئەو دەرگایە ڕیگای هاتوچۆی کوڕەکان نەبوو، پێم وانەبوو لەو کاتە درەنگەدا تووشی کەس دەبم. ئیتر چووزانم ئەو ڕێگا گۆرینە ڕێبازی ژیانم دەگۆڕێ!

ئەگەر بە پلیکانەکانی پێشەوەدا چووبام ئێستا لە جیاتی درزێکی بەناوبانگ ژەنراڵێك دەبووم. گێلە بێدەنگ بوو، خەمێکی قووڵ دایگرت. وەك کچۆڵەیەك کە بووکە شووشەکەی لێ ستێندرابێ تووڕە بوو. من بۆدڵخۆشیدانەوەی گوتم.

ـ هەر کەس چارەنووسێکی هەیە، پاشەڕۆژ لە دەست خۆمان دا نیە. بەڵام دیار بوو گێلە ئەم جۆرە قسانەی بە گوێدا ناچێ، بریسکەیەك لە چاوەکانی هەڵستاو سەری هەڵێنا قسە بکا. منیش کەدیتم باسەکەمان گەیشتۆتە شوێنی زۆر ناسك پێشدەستیم کردو پرسیم:

ـ باشە، دوایە چ بوو؟

ـ کاتێك گەیشتمە دالانەکە دیتم یەکێك بەرەو من دێ.

کوڕەکان هەقیان نەبوو پاش شەیپووری خەو لە ژووری خۆیان دەرکەون. لەوەڕا زانیم یەکێك لە ئەفسەرەکانەو بە تایبەتی لە سیڕەی چەکمەکانی ڕا زانیم نەقیب باڵیوزە.

بەجۆرێك سەرم لێشێوا وەك مشکێك پشیلەی دیتبێ لە جێگای خۆم وشك بووم. تەنگانەیەکی گەورە بوو، ئەگەر نەقیب بەشامی کەبابەوە دیتبامی کارم تەواو بوو.

لەو گێژی و سەر لێشێواویەدا لە ناکاو بەسەرم دا هات کە ئەو دەرگایەی تەنیشت خۆم بکەمەوەو بچمە ژوور. لەدیوی ژوورەوە دەرگام لەسەر خۆم داخست. هەستی پێی نەقیب هەروا نیزیك دەبۆوە کەگەیشتە دەرگاکە ڕاوەستا.

بەندی جەرگ ودڵم پسا "خوایە ئەگەر منی دیتبێو بێتە ژوور تەگبیرم چیە؟" ئەوی دوعای دەمزانی خوێندم و فووم لەخۆم کرد کە لەدەستی نەقیب ڕزگار

بم. دوعایەکەم گرتی، پاش ماوەیەك نـەقیب وردەوردە دوور کەوتەوەولـە کۆڵم بۆوە.

کاتێك هۆشم هاتەوە بەر، گوێم لە پرخ و هۆڕێکی سەیر بـوو کـە هـەتا ئـەودەم لەبەر پەرتی و پەرێشانی خۆم گوێم لـێ نەببوو. کە ئـاورم دایـەوە دیـتم یـەکێك لەسەر قەرەوێڵەکە نوستوەودەستێك جل و بـەرگی ژەنـراڵیش لەسـەر کورسـی نیزیك قەرەوێڵەکە دانراوە.

هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشا "توخوا وەرە لەم ڕۆژ ڕەشییە! ئاخر من چی و ئێرە چی؟".

پـرخ و هۆڕەکـەی دەتگـوت تیپێکـی چـل کەسـی موسـیقایەو ڕێکخسـتنی ئاهەنگەکـەی لەدەسـت بەڕێوەبەرەکـە دەرچـووە. گـوێم بـە دەرگاکـەوە نـا، دەمەویست بزانم نەقیب بۆ کـام لاچـووە. دەمزانـی سـەرێکی بەشـی نـاوخۆیی دەداو پـاش چـەند دەقیقـە دەگەڕێتـەوە. مـن دەبـوو تـا ئەوکاتـەی نـەقیب کارەکانی تەواو دەکاو دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی لەو هۆدەدا بمێنمەوە.

زۆر دەترسام: "خوایـە گیـان! نـەکا ژەنـراڵ خەبـەری بێتـەوە؟". بەئەسپایی قابلەمەکەم لەسەر کورسییەکە دانا. وەرە بمکوژە لەوبەدبەختی و ماڵ وێرانی-یەدا پێکـەنینم بەلێفەکـەی ژەنـراڵ دەهـات. کاتێـك هەناسـەی دەهـات لێفەکـە دەپـازدە سـەنتیمەتر بـەرز دەبـۆوەو وەختێـك هەناسـەی هەڵدەکێشـا وەك هەمبانەدەمەی کون دەپووکایەوە.

نازانم چ نەگبەتییەك بەرۆکی گرتم کە لەخۆوە بەدڵم دا هـات جلـەکانی ژەنـراڵ لەبەربکەم. لێکم دابۆوە ئەگەر نەقیب سەری ئەم ژوورە بداو من بەجل و بەرگی ژەنراڵییەوە ببینێ نازانێ مەسەلە چیە و وا تێدەگا ژەنراڵ خـۆی بەخەبـەرەو

خەریکی خوێندنەوەیە. بەپەلە جلەکانم داکەندو جلەکانی ژەنڕاڵم لەبەرکرد، کڵاوەکەشم لەسەرناو جلەکانی خۆم لە ژێر کورسی‌یەکەدا شاردەوە.

خەریك بووم کڵاوەکەم لەسەر دەکرد کە نەقیب باڵیوز بەئەسپایی دەرگای کردەوە و سەری بەژوورەکەدا گرت. کە چاوی بەمن کەوت سڵەمیەوە، دەرگاکەی بەرەڵا کردو سڵاوێکی سەربازی لێکردم. دەرگا وا بەتوندی پێوەدرا تەقەی گەیشتە ئەو سەری داڵانەکە "ئەی دادو هاوار! ئەم بەدبەختی‌یە چۆن چارەسەر بکەم؟".

نەقیب هەروا دەستی بە حەواوە گرتبوو زۆر بە ئەدەبەوە پرسی:

ـ ئەمرێکتان هەیە؟

نەم دەزانی چی جواب بدەمەوە، ئەگەر زۆرمان قسە کردبا هەم ترسی ئەوەم هەبوو بمناسێتەوەو هەم دەش ترسام ژەنڕاڵ خەبەری بێتەوە. هەروا بەسەرلەقاندن تێم گەیاند کە کاری دەرەوەم هەیەو دەسبەجێ وەدەر کەوتم. ڕۆیشتم بۆ ئەو سەری داڵانەکەو نەقیب بەدوامدا .

مەپرسە چەند تەنگاو بوو. ئەقڵم لەکار کەوتبوو، هەرچیم دەکرد نەم دەزانی چۆن خۆم دەرباز بکەم. نەقیب کە لای وابوو کاری ئاوێم هەیە، بەداڵانەکەدا غاری داو گورج دەرگای ئاودەستەکەی کردەوە:

ـ ئێرەیە قوربان!

هیچ گوێم نەدایەو هەروا بەتوندی چوومە پێش.

بۆ ئەوەی باشتر بەسەرهاتەکە تێبگەی نەخشەی قوتابخانەکەت بۆ باس دەکەم.

قوتابخانەکەمان لە ناوەڕاستی چوار دیوارێکی گەورەدا بەشکڵی شەشگۆشە دروست کرابوو. لە هەموو بەشەکانی‌دا دالآنی گەورە گەورە هەبوون کە لە هەر چوار لاوە بە پلیکانێکی کورتدا دەچوونە دەرێ.

ئەم بەر ئەو بەری دالآنەکان ژووری قوتابییەکان بوو. نەقیب کاتێك دیتی من بەرەو بەشی ناوخۆیی ملم پێوە نا وا تێگەیشت بەو نیوەشەوە نیازی پشکنینم هەیە .پرسیاری کرد:

ـ قوربان تەشریفت دەچێتە بەشی ناوخۆیی؟

نەم دەزانی چی جواب بدەمەوەو چۆنی خۆ لەدەست ڕزگار بکەم؟ دەمزانی ئەگەر بکەومە داوی دەردێکم دەداتێ تاماوم لە نەخۆشخانەدا بکەوم "خوایە خۆت ڕۆحمم پێبکە". هەروا بەدەم ڕێگا ڕۆیشتنەوە خەریك بووم نەخشەم دەکێشا. بێجگە لەئێمە کەس لە دالآنەکان دا نەبوو، دەمزانی کوڕەکان هەموو خەوتوون یان خۆیان دەخەو کردوە .

کاتێك بەرەو دالآنی لای چەپ وەرسووڕاینەوە بیرم کردەوە کە گەیشتمە بەر دەرگای ژوورەکەی خۆمان خۆی تێڕاکەم و لە بن بەتانیەکەم دا خۆم بشارمەوە، بەلآم ئەوەش نەدەکرا، چونکە کوڕەکان وەخەبەر دەهاتن و کارەکە پیستر دەبوو "خوایە چ بکەم؟! خۆ ناکرێ تا بەیانی لەم دالآنەدا ڕاوێچکە بکەم!".

لەپڕ تەگبیرێکم بۆ هات، چۆنە دووبارە بچمەوە ژووری ژەنڕاڵ و دەرگاکە لە سەرخۆم دابخەم! لەوێ نەقیب لە کۆڵم دەبێتەوە. ئەمە تەگبیرێکی باش بوو. لەڕاست خۆم بام دایەوە بۆ لای ژووری ژەنڕاڵ.

بەئەسپایی دەرگای هۆدەکەی ژەنڕاڵم کردەوەو لە کەلێنی دەرگاوە سەیرێکم کرد.بەلآم وەك شوولم لە لووت بدرێ پاشەوپاش کشامەوە و دەرگاکەم پێوەدا.

ژەنڕاڵ وەخەبەر هاتبوو و دانیشتبوو شامی کەبابی دەخوارد، هەر بۆیەش هەستی نەکرد. ئەگینا جافر لە کارەکە دەڕیا.

دووبارە نەقیب بالّیۆز کەوتە دوام و دیسان بەڕێگای خۆم دا گەڕامەوە. سەرلەنوێ نەقیب دەرگای ئاودەستەکەی کردەوە. نەختێك پێم هەڵێنایەوە ئەویش توندی کرد. خێراتر ڕۆیشتم، ئەویش توندتری کرد.

لە ناکاو نازانم لە چی وەشك کەوت، دەستێکی خستە سەر شانم. ئیتر وەك ماسیی لووس لەبن دەستی دەرپەڕیم و ڕام کرد. هەر من غارم دەداو نەقیب بە دوام دا. لەو غار غارێنەدا جلەکانی ژەنڕاڵم دادەکەندو بۆ ئەم لاوئەوا فڕێم دەدان. لەو هەڵاوهەنگامەدا کوڕەکان وەخەبەر هاتبوون و لە بەر دەرگا کۆببونەوە.

یەکێك دەیگوت:

ـ ژەنڕاڵ چی کردوە کەوا نەقیب ڕاوی دەنێ؟ ئەویتر دەیگوت:

ـ ژەنڕاڵ و نەقیب بالّیۆز میاو میاوێن دەکەن.

هەتا یەکێك لە جلەکانی ژەنڕاڵم دادەکەند وفڕێم دەدا. نەقیب دادەهاتەوەو هەڵی دەگرتەوە، بۆیە توانیم مەودایەکی زۆری بەجی بهێڵم. لە ترسان ئەوەندە پەشۆکابووم هیچ بیرم لەوە نەکردبۆوە کە هەتا کەوشەکان دانەکەنم شەڵوارەکەم بۆ داناکەندرێ.

بەدەم غاردانەوە دوگمەی شەڵوارەکەم ترازاندو لەپڕ شەڵوارەکەم دەلینگان کەوت، بەڵام لەبەر کەوشەکانم بۆم فڕێ نەدراو لەپەوڕووکەوتم، نەقیبیش کە بەتاو بەدوام دا ڕای دەکرد لە من هەڵەنگوت وسێچوار میتر ئەولاتر زرمەی لە هەردی هێنا. هەر چۆنێك بوو شەڵوارەکەم داکەندو پێش ئەوەی نەقیب

وەخۆکەوێ ڕاست بوومەوەو تێم تەقاند. نەختێکش بەتنۆکـەوە ڕام کـردو وەك باکوت خۆم بەژووریدا کردو چوومە ناو جێگاو بەتانیەکەم بەسەرخۆم هەڵکیشا. چـەند دەقیقـە پاشـتر لەکاتێکـدا نـەقیب جلـەکانی ژەنراڵـی هـەر بەدەسـتەوە بووخۆی کوتایە بەشی ناوخۆیی‌یەوە.هەر لەدەرەوە ڕا هاواری کرد:

ـ ئەوە کێ بوو؟

دەمزانی کوڕەکان ڕاستیم لـێ ناڵێن، بەڵام دیسانیش حەجمینم نەبوو.

ـ نەقیب پرسیارەکەی دووپاتە کردەوە:

ـ زووبن دەنگ بکەن!

کەس متەقی نەکرد، دەتگوت زەلامـی بەخەبـەری تێدا نیـە. نـەقیب جـارێکی تریش پرسیارەکەی دووپاتە کردەوە. هەمووومان باش شارەزای ئاکاری بـووین. ئەگەر کابرا ڕاست و ڕەوان لەگەڵی هاتبایە پـێش هـەر تـاوانێکی کردبایـە لێـی خـۆش دەبـوو بـەڵام یـەکێك درۆی لەگـەڵ کردبایـە هـەتا دنیادنیایـە لـەکۆڵی نەدەبۆوە.چەند جار بۆم دەهات بەتانیەکە لەسـەرخۆم لادەم و ڕاسـت و ڕەوان بڵێم من بووم، بەڵام تاوانەکەم لەوانە نەبوو لێم خۆش بـێ. بۆیـە زیـاتر سـەری خۆم دەبردەوە ژێر بەتانیەکەو هەوڵم دەدا هەناسەشم نەیەتەدەر.

نەقیب چەند جنێوێکی تەڕو تازەی بۆ دایك و باوکی ژەنراڵی ساختە بەڕێ کردو پاشان بۆ دۆزینەوەی تاوانبار دەستی کرد بە پشـکنینی قەرەوێڵـەکان. بەنـدی جەرگ ودڵم پسا، هەموو گیانم دەسـتی کـرد بـە لـەرزین، زیـاتریش خـۆم لـەبن بەتانیەکـەدا کـۆکردەوە. (باصـری بـێ مێشـك)لە سـەر تەختەکـەی تەنیشـتم خەوتبوو، نەقیب لێی پرسی:

ـ دیتت کێ بوو؟ باصری بەدەنگی بەرز وەڵامی دایەوە:

ـ نا گەورەم نەوەڵڵا نەمدیت!

بۆ بەدبەختی فریا نەکەوتبووم کەوشەکانم داکەنم و لەبەر نەگبەتیش لاقێکم لە بەتانیەکە دەرچوو بوو. بۆیە کلکم بەتەڵەوە بوو نەقیب لاقی گرتم و توند ڕای کێشا:

ـ هەستە بزانم هەی دایك سەگ!

بەتوێی تنۆکەو فانیلەوە لەبن بەتانیەکە هاتمەدەر، کوڕەکان پێکەنین گرتبوونی، بەهەزار زەحمەت خۆیان بۆ ڕاگیر دەکرا. نەقیب نەڕاندی:

ـ جلەکانت لەبەرکە.

ـ جلم نیە.

ـ یانی چی ؟جلەکانت لە کوێن؟

ـ لە ژوورەکەی ژەنڕاڵ بەجێ‌ماون!

چاوەکانی نەقیب لە ڕقان هەر هێندەی کونە سووژنێکیان لێ مابۆوە، هاواری کرد:

ـ نەگبەت! بۆچما ژووری ژەنڕاڵ شوێنی خۆگۆڕینە!؟

متەقم لەخۆم بڕیبوو، سەرم داخستبوو و چاوەڕوانی سزایەکی زۆر سەخت بووم!

نەقیب هەتا هێزی تێدا بوو تفێکی لێ‌کردم:

ـ تفوو هەی... ! وەرە بە دوام دا!!!

ئەو فەرمانەی ئەوەندە توندو عەسکەرییانە بوو بۆنی خوێنی لێ دەهات.

چار نەبوو ئاوڕێکی پڕ لە ناهومێدیم وەسەر کوڕەکان دا کە سەریان لە بەتانیەکان هێنابووە دەرو بە پەرۆشەوە سەیریان دەکردم لە پاشان کەوتمە دوای نەقیب تا بزانم چارەنووسم چ دەبێ؟

بەڕاستی دنیا سەیرە، چەند دەقیقە لەمەوبەر نەقیب سڵاوی عەسکەری لەمن دەکردو بە ئەدەب بەدوام دا دەڕۆیشت، کەچی ئێستا من ناچار بووم دوای ئەو بکەوم.

یەکسەر چووینە ژوورەکەی خۆی. لەسەداسەد دەمزانی بە کوشتن لێم دەدا. بیرم کردەوە لەبەری بپارێمەوە، بەڵام دیتم سوودی نیە، بۆ خۆم شارەزای خوو و ڕەوشتی بووم، هەتا زیاتر پاڕابامەوە پتری لێ‌دەدام، قسەی خۆمان بێ پاڕانەوەش لەو سەرو سیمایەی من نەدەوەشایەوە.

خوا خوام بوو کاتی لێدانەکە زوو بێهۆش بم و زۆر ئازار نەچێژم. پشتم بەدیوارەکەوە دابوو ڕەق ڕاوەستابووم نەقیبیش تاوێك لە ژوورەکەدا پیاسەی کردو لەناکاو ئاورێکی لێ‌دامەوەو مۆڕەیەکی لێ‌کردم. مۆڕەکەی ئەوەندە دڕندانەو بەڕق‌و کینە بوو لە پشتێن بەرەژێرم مرد! "خۆزگە زووتر لێی‌دەدام و ڕزگاریم دەهات!".

نەقیب بەدوو لۆق خۆی گەیاندە من وهەردوو دەستی وەك دوو کوتك هەڵێنانەوە بەڵام فریا نەکەوت دایان وەشێنێ. بەپەلە پەل لە دەرگایان داو بێ‌ئەوەی نەقیب بڵێ فەرموو ئەفسەری ئێشك بە پەشۆکاوی وەژوور کەوت و بە شاکە شاکەوە گوتی:

گەورەم ژەنڕاڵ. ژەنڕاڵ.

باڵێوز هەقی پیاوێکی زۆر مەندو لەسەرەخۆ بوو، تائێستا هیچ کەس پەشۆکانی پێوە نەدیتبوو. بەڵام ئەوجارە هەر بەبیستنی ناوی ژەنڕاڵ بەجۆرێك تێك چوو کە زمانی گۆی نەدەکرد:

ـ ژەنڕاڵ چی؟ چ بووە؟

ـ حاڵی زۆر شڕە.

باڵیۆز هەقی نەیهێشت ئەفسەر ئێشک قسەکەی تەواو بکا، وەك کێچ دەرپەڕیو چووە دەر.

دەنگی هاتوچۆی کۆمەڵێکم لەسەرپلیکانەکان و لە ناو داڵانەکە دا گوێ لێبوو، ئەم دەزانی ئەگبیرم چیە؟ هەر لەوێ ڕاوەستم تا نەقیب دێتەوە؟ بچمەوە ژوورەکەی خۆم؟ یان منیش وەدوایان کەوم؟! دەترسام هەرچی بکەم نەقیب پتر پێی تووڕە دەبێ.

نەختێك ڕاوەستام، پاشان سەرم لەدەرگاکە هێنایە دەرەوەو سەیرێکی داڵانەکەم کرد، دیتم هێندێك هەروا تێکەوە داوێن و بەم لاو ئەولادا ڕادەکەن.

هاتمە داڵانەکەو لە پلیکانەکان وەسەر کەوتم. دوکتۆرێکی تەنگە ئەستوورمان هەبوو دیتم بەغاردان دەیەوێ خۆی بگەیەنێتە ژووری ژەنراڵ. منیش بە دوای دا ڕۆیشتم، دیمەنێکی سەیرم دی،خەریك بوو لە پێکەنینان بپسێم.

ژەنراڵ بە تۆیی کراس و دەرپێیەك ڕاکشابوو، زگی بەقەدەر دەهۆڵێك ئاوسا بوو دەیناڵاند. لەدڵی خۆم داگوتم "مردووت مرێ! کایەکە هی خۆت نەبوو کادێنەکە هی خۆت بوو". نەقیب باڵیۆز کە بە پەلە چاوەڕوانی دوکتۆر بوو، هەر کە چاوی بەمن کەوت گوێچکەی گرتم و ڕایکێشام بۆ دەرەوە:

ـ بۆهاتوویە ئێرە باوکم!

ـ جلەکانم لێرەن! لەبن کورسیەکە بەجێ ماون. نەقیب جلەکانی بۆ فڕێ دام:

ـ بڕۆ لاچۆ لەبەر چاوم، بەیانی وەرە کارم پێتە.

خوا ماڵی ژەنراڵ ئاوەدان کا کە بەو نەخۆش کەوتنە گیانی منی ڕزگار کرد. هەرچەند نیوەشەو بوو بەڵام کوڕەکان هەموو بەخەبەر بوون و چاوەڕوانی منیان دەکرد، لەگەڵ چوومە ژوور هەموویان دەورەیان دام، هەر کەس پرسیارێکی دەکرد:

ـ چۆن دەرچووی؟

ـ زۆری لێ‌دای؟

ـ بەچی لێی دای؟

ــ هیچ بابە! بەختی من ژەنراڵ نەخۆش کەوت و ڕزگارم بوو. بورهان شەپیووری پرسی:

ـ ژەنراڵ بۆ نەخۆش کەوت؟!

ـ نازانم.

پاشان بەسەرهاتەکەم لەسەر هەتا پیواز بۆ گێڕانەوە. ئەوەندە پێ کەنین هەموویان کەفەزگ بوون.

بەیانی کە لەخەو هەستام وەك نە بام دیبێ و نە باران هەموو شتێکم لە بیر چووبۆوە. لە پاش مەشقی بەیانیان سەعاتێك پشوودانمان هەبوو.

هاوڕێکانم هەریەکە خەریکی کارێك بوون، منیش خەریك بووم نامەیەك بۆ باوکم بنووسم. دایك وبابم لە قەیسەریە بوون. بابم لە پێشدا لە بەشی دەفتەرداری سوپا کاری دەکرد، بەلام لەمێژ بوو خانەنشین کرابوو. بێجگە لە من حەوت منداڵی تری هەبوون، لەبەر ئەوەی من لە هەمووان گەورەتر بووم هەموو چاویان لە دەستی من بوو کە زووتر پێ‌بگەم و بەخێویان بکەم!!!

بابم هەموو مانگێك سەد لیرەی بۆ دەناردم. هەرچەند ئەمە پارەیەکی کەم بوو، بەلام باشم دەزانی ئەوەندەشی چەند بە گران لەسەر دەوەستێ. بۆیە هەمووجارێ کە نامەی دەنووسی زۆری ئامۆژگاری دەکردم کە زۆر تێ‌بکۆشم و ئاکارو کردارم باش بێ!

منیش بەدرێژی وەلامم بۆ دەنووسیەوەو دڵنیام دەکرد کە شەووڕۆژ خەریکی خوێندنم! و زۆر خۆم ماندوو دەکەم بۆ ئەوەی لە تاقیکردنەوە (امتحان)

دەربچم! تەنانەت چەند جار بۆم نووسیبوو کە دڵنیا بێ لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵدا یەکەم دەردەچم!!!

خەریك بوو نامەکەم تەواو بێ چزەیەك لە پشت ملم هەستا وام زانی زەرگەتەیە دەستم بۆ پشت ملم بردو (شرینگ ها شەقەزلەیەکم لە خۆمدا):

قاقای پێکەنینی کوڕەکان بەرز بۆوە، تازە تێگەیشتم کە (صالح شەمع) لە تەنیشت قەرەوێڵەکەیەوە سیمێکی درێژ کردوەو لە پشت ملی ڕاکردووم. ئەوە باو بوو هەر وەخت یەکێکمان زۆر بەشتێکەوە خەریك بووایە کوڕەکان سەریان داویشتە سەرو ماوەیەك بە کەیف و پێکەنین رامان دەبوارد.

نازانم ئەو رۆژە بۆچی هێندە تووڕە بووم، وەك شێرێك کە بێچوویان لەبەر هەڵگرتبێ دەرپەڕیم وئامبازی (صالح شەمع) بووم. دەنگی هادان و بیکوتەبیکوتەی کوڕەکان لە هەموو لایەك بەرز بۆوە:

ـ هەی روحم بی!

ـ ئافەرین پاڵەوان!

ـ بیکوژە!

صالح لە پێشدا کەمێك پێکەنی، بەڵام دوایە کە زانی من بە ڕاستیمە لێم ڕاست بۆوە. لەناوەراستی ژوورەکەدا دەگژێك ڕاچووین، هەموو هێزی خۆم کۆکردەوەو بە کەیفی خۆم صالحم بە دیوارەکە دادا.

ئێستا من لەسەرەوە بووم و کوڕەکان هانیان دەدام.

لەو کاتەدا یەکێك خەریك بوو دەرگاکە بکاتەوە، بەڵام صالح شەمع پاڵی بە دەرگاکەوە دابوو نەیدەهێشت بکرێتەوە.

من هەروا لە بیری دەرگاکەدا بووم صالح شەپێکی لێدام و هەردووکمان وەك دارێك ڕنوو لێی دابێ لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا مەلاسی زەوی بووین.

هەروا بەپشتەوە کەوتبووم و صالح لەسەر سنگم دانیشتبوو کە لەسەر شانی صالح ڕا روخساری قەڵس وقۆڵ و سوورهەڵگەڕاوی نەقیب باڵێوز هەقیم بەر چاو کەوت. دەنگی هات و هاواری کوڕەکان بەجارێك کپ بوو، دەمەویست ڕاست بمەوە، بەڵام صالح شەمع کە نەیدەزانی مەسەلە چیە نەیدەهێشت هەستمەوە.

لەو گێڕەو کێشەدا صالح شەڵوارەکەمی گرت و ڕایکێشاو بە جارێك هەموو دوگمەکانی ترازاند وشەڵوارەکەم دەلینگان کەوت!!

نەقیب بەنووکی چەکمەکەی شەپێکی وای لە پشتی صالح دا کە وەك تەپاڵە بەهەردیەوە پان بۆوە.

صالح ئاوڕی دایەوە وکاتێك چاوی بە نەقیب کەوت لەسەر سنگی من هەستاو منیش دوگمەکانم داخستەوەو هەستامە سەرپێ. نەقیب گوێچکەی صالحی گرت و وەك جلکی شۆڕاو ڕای پازنی. دیتم کارەکە خەریکە پیس دەبێ، گوتم:

ـ گەورەم!

پرسی: "چیە؟".

سەرم داخست و بە سپایی وەڵامم دایەوە:

ـ صالح تاوانی نیە، ئەو خەریکی دەرسەکانی بوو، من ئازارم دا.

نەقیب گوێچکەی صالحی بەرداو هات بۆلای من!

ـ ئەتۆ قەت نابیە بنیادەم.

هیچ دەنگم نەکرد، چاوەڕێ بووم راست و چەپێکم تێ سرەوێنێ. بەڵام لێی نەدام، ددانەکانی دەچیڕەوە بردو گوتی:

ـ وەرە بەدوام دا.

نەقیب وەدەرکەوت و ڕۆیشت بۆ دالآنەکە. منیش وەك مەحکومێك کە بچێتە بن داری ئیعدام بەسپایی و بێدەنگ وەدوای کەوتم. هەر خوا بزانێ لە ڕێگادا حاڵم چۆن بوو. قەتم نەدیبوو ئەوەندە تووڕە بێ. کەچووینە ژوورەکەی خۆی دەرگاکەی توند داخست و گوتی:

ــ بۆچی وات کرد؟ شەوێ ئەو دەستە گوڵەت بەناو داداو ئەمەش ئاکاری ئەمڕۆت! من هەروا بێدەنگ بووم نەقیب نەڕاندی:

ــ بۆچی لاڵ بووی؟

ــ بڵێم چی! بەدبەختی بەرۆکی گرتووم.

ــ ئاخر بۆ وا دەکەی کوڕم!؟

لەم وشەیە "کوڕم" سەرم سوڕما. یەکەم جار بوو نەقیب بەم زمانە قسە لەگەڵ یەکێك بکا، بەسپایی سەرم هەڵبڕی و سەیرێکی سەروچاویم کرد. چاوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك. ورەم هاتە بەرو گوتم:

ــ شەیتان فریوی دام، نەمزانی!

ــ دوێنێ شەو شەیتان فریوی دای، ئەمڕۆ چی؟

نەم دەزانی چی جواب بدەمەوەو نەقیب زۆر هێدی و لەسەرەخۆ گوتی:

ــ زۆرم هەوڵ دا بەرێوەبەری قوتابخانە ڕازی بکەم لێت ببوورێ، بەلام بەداخەوە نەکراو لە قوتابخانە دەریان کردی. سەرم گێژبوو، تاریکاییم بە چاوان دا هات، دەتگوت خانووەکەم بەسەردا رووخاوە. ئیتر گوێم لەقسەکانی ئەویش نەماو هەرچی دەیگوت تێ نەدەگەیشتم.

لەپڕ لە بانگی گریانێم دا. نەقیبش گریان بەری ئەوکێی گرتبوو، بەدەم گریانەوە گوتی:

ـ تۆ ئەفسەرێکی پاش دەبووی، بەڵام بەداخەوە ژەنراڵیش مەسەلەکەی زانیوەو تازە پینە ناکرێ.

ڕەنگە کاری چارەنووس بێ، ئێستا هەتا نامەکەت تەواو دەبێ برۆ کەل وپەلی خۆت کۆبکەوە.

گەڕامەوە بۆلای هاورێکانم، هەموویان بەبیستنی مەسەلەکە زۆر تێك چوون و هەریەکە بەجۆرێك دڵخۆشی دامەوە. ئەگەر یەکێك تەرفیعی بۆ بێ، لانی کەم دووسێ هەفتەی پێ دەچێ تا پێی ڕادەگەیەنن، کەچی حوکمی دەرکردنی من دووسێ سەعات زیاتری نەخایاندو ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو هەموو شتێك تەواو کراو لە کاتێك دا دایك و بابم چاوەڕێ بوون پاش مانگ ونیوێکی تر کوڕەکەیان بچێتە زانستگای ئەفسەری، خەتەکانیان لێ کردمەوەو وەدەریان نام:

"پیاو هەتا نەمرێ نازانێ چی بەسەر دێ".

لێرەدا گێلە بە چەشنێك دڵی پڕبوو کە نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدا. جگەرەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا، دایگیرساندو بۆ ماوەیەك بێدەنگ بوو.

دەنگی "قەدری" لە دالانەکەوە بەرز بۆوە:

گێژی نەفام! هەر بەرەکەی پێنسەد لیرە دێنێ. یەکێکی تر هاواری کرد:

ـ من بەدووسەد "دار" موشتەریم، ئەگەر کەس نەیکڕی دەستیشت ماچ دەکەم.

دەرگای ژوورەکەی ئێمە کرایەوەو "قەدری" پاڵتۆیەکی کە بەسەر دەستی دا دابوو، بۆ گێلەی فڕێ دا:

ـ سەد لیرە زیاتری پێ نادەن.

گێلـە کـە حـەزی نـەدەکرد مـن لەمەسـەلەکە تێبگـەم زۆر تێـك چـوو بـە بێموبالاتیەوە گوتی:

ـ داینێ کاکە، بۆخۆم پترم کار پێیە!

"قەدری" لیچێکی لێهەڵقرچاند:

ـ ترخێنـەی لەسـەر هەڵخـەی باشـترە. پاشـان تونـد دەرگاکـەی پێـوەداو دەرکەوت. گێلە بە ناڕەحەتیەوە گوتی:

ـ ئەمانە زۆر بێ ئەخلاقن، هەموویان نەخۆشـن، هـەر لەبـەر ئـەوەی کـە چـەند ڕۆژێك زیاتر نامێنمەوە ویستم پاڵتۆیەکەم بفرۆشم.

تێگەیشتم زۆر ناڕەحەتە، ویستم باسەکە بگۆڕم:

ـ باشە، تۆ لەوە گەڕێ، بەسەرهاتەکەت بگێڕەوە.

ـ بەڵێ، دایك و بابم چاوەڕێ بوون کوڕەکـەیان بـە جـل و بـەرگی ئەفسـەریەوە بگەڕێتەوە! کەچی خۆشەویستەکەیان دیت کـە تەنانـەت دەسـتێك چاکەت و پانتۆڵیشی نیە!!

لـەو کاتـەدا شـێویان هێنـا. مـن و گێلـە جیرەمـان نـەبوو، شـەوی یەکـەم هـیچ بەندییەك جیرەو نانی نیە.

گێلە پێشنیاری کرد بچینە "بوفیەی" بەندیخانـە شـتێك بخـۆین. منـیش داوای لێبووردنم کرد چونکە نە برسی بووم و نەحەزیشم لـە خواردنـەکانی بـوو. گێلـە چـووە دەرێ وچـەند دەقیقەیـەك بـەو بـیرە ئـاڵۆزەوە بـەجێی هێشـتم. کاتێـك هاتەوە بەچیلکە ددانی دەکۆڵیەوە. دەیەویست وا بنوێنێ کـە گۆیـا گوشـتێکی قەڵەوی خواردوە. بەڵام من دڵنیا بووم کـە هـەر خۆڕانانـە، ئـەگینا هیچـی بـەر ددان نەکەوتوە. ئەمجار داوای دووقاوەی کردو گوتی:

ـ دوای نان خواردن قاوەیەك خراپ نیە!

منیش حەزم دەکرد قاوەیەك بخۆمەوەو نەختێك دەمارەکانم بحەسێنمەوە.
گێلە لەسەر بەسەرهاتەکەی ڕۆیشت و گوتی:

ـ دیارە دایك و بابم بەم خەبەرە زۆر تێك چوون، بەڵام هەر چۆنێك بوو ددانیان بە جەرگی خۆیان داگرت و کەوتنە دڵخۆشی دانەوەی من "ڕۆڵە دنیا سەری بە پووش نەگیراوە، خۆ هەموو کەس نابێتە ئەفسەر، بۆ پێت وایە ئاسمان ڕووخاوە؟ دەتوانی کارێکی تر پەیدا بکەی. ئێستا کاسبی لە هەموو کارێك باشترە" چار نەبوو، هەردەبوو بڵێم وایە! لەدڵی خۆم دا گوتم "ئێستا کە لە قوتابخانەی عەسکەری دەرکراوم، دەبێ لە قوتابخانەی ژیان دا دیپلۆم وەرگرم". بڕیارم دا لە ماڵێ بابم بڕۆم و هەتا لە قوتابخانەی ژیان دا خوێندنەکەم تەواو نەکەم نەگەڕێمەوە.

دووسێ ڕۆژ دواتر بەو نیازەوە باری سەفەرم تێك ناو ئەستەمبووڵ بگرەو هاتم. ڕۆژێکی بەهاری بوو، تازە دار سەوز دەبوون و شار دیمەنێکی زۆر جوانی پۆشیبوو.

ماوەیەك لە شەقامەکان دا خولامەوە، دەمەویست کارێك پەیدا بکەم، جا هەر کارێك بێ. بیستبووم زۆر کەس لە هیچەوە بوونە هەموو شتێك. بۆ من چیم لەوان کەمترە؟ ئەگەر نەش بوومە ژەنراڵ خۆ دەتوانم ببمە میلیۆنێر! کاتێك بە بەردەم خانووبەرەکان دا تێدەپەڕیم لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "ڕۆژێك ئەمانە هەموو هی تۆ دەبن"!

هەروا دەستم لە گیرفانم نابوو بە فیتوو لێدان شەقام و کۆڵانەکانم دەپێواو بیرم لە دواڕۆژی خۆم دەکردەوە. لە برسان دڵم پێك دا دەهات، بەڵام هومێدم وەبەر خۆم دەناو لەبەر خۆمەوە دەمگوت: پیاو دەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی هەموو جۆرە نارەحەتیەك بچێژێ. گەیشتمە بەر دوکانێکی گەورەو قەڵەباڵغ. بە

دڵمدا هات ڕاستەڕێ بچمە لای خاوەنەکەی و بڵێم کارێکم بدەیە، بەڵام دەسبەجێ پەشیمان بوومەوە "بابایەکی نەدیوو نەناسیاو کێ کاری دەداتێ؟". بەو حاڵەش چوومە بەردەرگای چێشتخانەیەك(مطعم)، دەمەویست لەوێ کارێك بدۆزمەوە، هەر کارێك بێ قاپ شوشتن، گەسك لێدان، کاشی سڕین، هەر ئەوەندە نانێکم دەست کەوێ. بەڵام هەرچی دەمکرد لاقم لە دوا نەدەهاتن. دووسەعات لەپشت جامخانەکەوە ڕاوەستام و سەیری خواردنەکانم کرد، هەتا دەمەویست بچمە ژوورێ قەڵەمی دەست و پێم دەشکا. سەرەنجام بڕیارم دا. "یا گاڵ دێ یا پەمۆ". چوومە ژووری چێشتخانەکە، شاگرد بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد:

"فەرموون!"

هێندەی نەمابوو لەقاقای پێکەنینێ بدەم، دەمزانی شاگردەکە بە موشتەریم تێگەیشتوە. ویستم حاڵی بکەم بەڵام دەرەتانی نەدام، وەپێشم کەوت لە ناوەڕاستی ساڵۆنەکەدا مێزێکی پێنیشان دام. نەدەکرا بڵێم کاکە بەهەڵە چووی من هاتووم کارێك بۆ خۆم پەیدا بکەم؟. خۆم وبەختم لە پشت مێزەکە دانیشتم. شاگردسەرێکی دانەواندو گوتی:

ـ چ دەفەرموون؟

"خوا کوێرت کا، چ بفەرمووم!" شاگردەکە دووبارەی کردەوە:

ـ چ ئەمر دەکەی؟

پرسیم:

ـ چیتان هەیە؟

ـ سوپ، کەباب، تکە، کفتە، قووزی.....

ئەو ناوی خواردنەکانی بۆ هەڵدەدام و منیش چاوم بە نرخەکان دا دەخشاندو لەگەڵ پارەکەی گیرفانم پێکم دەگرتن. تەنیا سەدو حەفتا قرۆشم پێبوو. لەبەر ئەوەی دەمێك بوو ڕاوەستابوو گوتم:

ـ جاری سووپێك بێنە. دوایەش کفتەیەك ودەورییەك شیرنیات. لە دڵی خۆم دا گوتم با زگی خۆم تێرکەم، بۆ پارەکەش خوا کەریمە.

کاتێك نانەکەم خواردو زگم تێربوو کەوتمە بیری ئەوەی کە چ بکەم؟ پارەی خواردنەکە حەوت هەشت لیرەی دەگرت و منیش نەك هەر ئەو پارەم نەبوو، چاکەت و پانتۆڵەکەشم فرۆشتبان ئەوەندەی نەدەگرتەوە!!

زۆر دانیشتم دەمەویست چێشتخانەکە چۆڵ بێ. کاتێك هەموو ڕۆیشتن شاگردەکە هات بۆلام. بەجارێك دڵم داتەپی و لەبەرخۆمەوە دەستم کرد بە دوعاخوێندن "خوایە خۆت ڕوحمم پێ بکەو ئابڕووم بپاریزە". لە لێدان نەدەترسام، پێم خۆش بوو بە بێدەنگی چێنێکی باشم بکوتن و بەڕێم بکەن، بەڵام کوا؟

شاگرد لەبەردەم مێزەکە ڕاوەستاو وەك ئەوەی بۆنێکی کردبێ، نەختێك بەتەوسەوە گوتی:

ـ قوربان دای دەخەین.

ـ کاکە من چاوەڕوانی برادەرێکم پارەم بۆ بێنی.

شاگرد قاقایەکی کێشا سەد جنێوی دێنا. دووسێ جاری سەر ڕاوەشاند، دیار بوو زۆری ئەو فرت وفێڵانە دیتبوو "هێلکە لە قەلێ نادزرێ". چاوەڕێ بووم ڕاست و چەپ دووسێ زللەم لێبدا، بەڵام ناپیاوە نەیکرد، دەستی خستە سەر مێزەکەو سەری هێنا پێشەوە گوتی:

ـ سەعات و ئەنگوستیلەو قوتووە جگەرەشمان دەوێ. ئەمجار نۆرەی من بوو پێبکەنم:

ـ هە... هە... هە...

قورپەسەرە نەیدەزانی جلەکانی بەر خۆشم بفرۆشم پارەی نیو ڕۆژەکەی ئەوی تێنابێ. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتم:

ـ کاکە ڕاست و ڕەوان پێت بڵێم نە پارەم هەیە نە شتی بایی‌دار .هەموو مووی لەشی بوونە نەشتەرو بەسەریدا نەڕاندم:

ـ کەوا بوو نا ماقووڵت کرد هاتیە ئێرە.

ـ وەڵڵا من هاتبووم کارێك پەیدا بکەم، تۆ ناچارت کردم نان بخۆم.

ـ چما ئێرە ماڵی پوورتە؟ بەسپایی گوتم:

ـ مەردی خوا بە ئابڕووم مەبە، سبەو دووێکی پارەکەت بۆ دێنم.

ـ چ دێنی کوڕی باش. ئەگەر هەموو ڕۆژێ دووسێ میوانی وەك تۆمان هەبێ قازانج سەری مایەی دەخوا.

ـ دڵنیابە لەو جۆرە کەسانە نیم. ئامادەم لە جیاتی پارەکە کارتان بۆ بکەم. کابرا دەیزانی تازە نانەکەم خواردوەو کار لەکار ترازاوە گوتی:

ـ هەستە وەرە پێشانت بدەم نانی خۆڕایی تامی چۆنە!

وەك بەرخی دەستەمۆ دوای کەوتم. نەم دەزانی چ نەخشەیەکی بۆ کێشاوم. دڵەکوتەم گرتبوو "خوایە گیان! نەکا بەڵایەکم بەسەر بێنێ؟!".

لەو سەری چێشتخانەکە چووینە ژوورێکی تاریك و بۆگەن. بۆنی گۆشتی کۆن مێشکی سەری گرتم. دووسێ کەس لەپشت ئاورگەکە خەریك بوون چێشتیان بۆ موشتەرییەکان ساز دەکرد. شاگردەکە بردمیە لای پیاوێکی قەڵەو کە خەریك بوو برنج وگۆشتی تەسلیمی مەتبەخ دەکرد. گوتی:

ـ ئەم پیاوە نانی خواردوەو پارەی نیە. دەیەوێ لە جیاتی پارەکە کارمان بۆ بکا.

خاوەن چێشتخانەکە سەیرێکی قەڵافەتی منی کردو پاشان دەفرو ئامانێکی زۆری پێشان دام گوتی: زووکە، خەریك بە. پێت وابوو لێرە لە تووکی قوودا دەخەوی؟ وڵاتەکەش خاوێن بکەوە، جا دوایە پێت دەڵێم.

زۆر دڵم خۆش بوو کە شتەکە بەخۆشی بڕایەوە، بڕیارم دا ئەوەندە گورج و گۆڵ بم کە خاوەن چێشتخانە کارێکم بداتی.

دەفرەکانم وا خاوێن کردەوە هەر دەبریسکانەوە. مەتبەخەکەشم شوشت و وشکم کردەوە.

بۆ نەگبەتی لای ئێوارە لۆرییەك برنجیان هێنا، منی قوڕبەسەریش بۆئەوەی نیشان بدەم کە لەهەموو کرێکارەکان ئازاترم، لەگەڵ ئەو هەموو ماندوویی و شەکەتیەدا بەشی زۆری گونیە برنجەکانم لە چواردە پلیکان وەسەر خست و لە عەمبارێ لەسەریەکم دانان.

رۆژ ئاوا بوو تاریك داهات، ئیتر کارێك نەمابوو بیکەم. چوومە لای خاوەن چێشتخانەکە گوتم:

ـ قوربان کارەکان تەواو بوون. بەپێکەنینەوە تەماشایەکی کردم و بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

ـ ئافەرین نانەکەت حەڵاڵ کرد.

زۆر سوپاس قوربان! ئەگەر ڕێگا بدەن هەمیشە ئامادەم لێرە خزمەت بکەم.

وەك قسەیەکی خراپم کردبێ، خاوەن چێشتخانە پێکەنینەکەی خواردەوە وچاوی لێدەرپەڕاندم:

ـ ئێ، ئەوە بۆیە وەك سەگی هاهایە هەڵدەسووڕای! دیارە تامی نانی نیوەڕۆ هەر لەبن ددانت دا ماوە؟!

ـ قوربان! من بیکارم، هەر کارێك بێ ئامادەم بیکەم .

ـ نا، بابە، برۆ خوا ڕزقت بدا، ئێمە جێگامـان نیـە، ئەوانـەی لێرەشـن زیـادین. بەخێرچی، خوات لەگەڵ.

ماندوومردوو سـەیرێکی چرچچـاویم کـردو لـەدڵی خـۆم دا هـەزار جنێـوم پـێدا "حەیف بۆ ئەو هەموو خۆماندوو کردنە، تفوو هەی، بێشەرەف".

لە چێشتخانەکە دەرکەوتم و لە شـەقامەکان دا دەسـتم بەپیاسـە کـرد "خوایـە گیان! بچمەکوێ؟ چ بکەم؟ شەو لە کوێ بخەوم؟".

هەروا دەسووڕامەوە لە کۆڵانێك دا تووشی کارگەیەکی گەورەی خـانوو دروسـت کردن بووم. دووسەد سێسەد کرێکارو وەستا دەستیان لە کار هەڵگرتبوو، وەك مێش هەنگوین لەدەورەی حیسابدارەکە ئاپۆرەیان دابوو.

ماوەیـەکی زۆر ڕاوەسـتام و سـەیرم کـردن، هـەر لـەبیرم نـەمابوودەبێ زووتـر مشوورێك بخۆم کارێك بدۆزمەوەو جێگایەك بۆخەوتن پەیدا بکەم. کرێکارەکـان پارەیان وەردەگرت و بە پێکەنینەوە بـەرەو مـاڵ دەبوونـەوە. لەبـەر خۆمـەوە گـوتم:"ڕەنگـە لێـرە کـارێکم دەسـت کـەوێ". ڕاسـتەڕێ چـوومە ئـەو ژوورەی ئەنـدازیارو بـاش وەسـتایەکانی لـێبوون. ئێـرە وەك چێشـتخانەکە نـەبوو کـە شـاگرد فـەرمووم بکـاو تووشـی چەرمەسـەری بم. خانووبەرەکـە دوو دەسـتە کرێکاری هەبوو، دەستەیەك بەڕۆژ کاریان دەکردو دەستەیەك بەشەو. هەر لـەو کاتەدا کە دەستەیەك پارەیان وەردەگرت و دەڕۆیشـتن لـە دەرگایـەکی تـرەوە شەوکارەکان دەهاتنە ژوور.

لە ژووری مەکتەبەکەدا هەموو سەرقاڵ بوون، کەس سەری هەڵنەبڕی تەماشای من کا. ماوەیەك ڕاوەستام، نەم دەزانی بەکامەیان بڵێم هاتووم کار بکـەم. لـەو کاتەدا ئوتومبیلێکی ئاخر مۆدیل لـەپێش دەرگـای مەکتـەب ڕای گـرت، هـەموو ئەندازیارو مووچـە خۆرەکـان کەوتنـە جموجـۆڵ و لەپشـت مێزەکانیـان ڕاست بوونەوە.

شۆفێر بەپەلە دەرگای ئۆتومبیلەکەی کردەوەو پیاوێکی تەرپۆش کە تەمەنی دەوری ٥٠ ساڵ دەبوو دابەزی و هات بۆ مەکتەبەکە.

ئەندازیارو وەستایەکان سەریان بۆ دانەواندو یەکێکیان کە دیار بوو سەرۆکیانە هاتە پێش، نەخشەیەکی گەورەی لەسەر مێزی ناوەڕاستی ژوورەکە پان کردەوەو بۆ ئەو میوانە تازەی لێك دایەوە. من هەروا ڕاوەستابووم و سەیرم دەکردن، لەپڕ ئەو پیاوە سەری هەڵبڕی و پرسی:

ـ تۆ چ کارەی؟

ـ هیچ.

ـ چۆن هیچ؟

ـ عەرزم کردی هیچ .

ـ کەوابوو لێرە چ دەکەی؟

ـ هیچ ناکەم.

کابرا زۆر تووڕە بوو، لای وابوو گاڵتەی پێدەکەم. رووی کردە سەرۆکی ئەندازیارەکان و پرسی:

ـ ئەوە کێیە؟

ئەویش وەك جنۆکەی دیتبێ ئاوڕێکی بۆ لای من دایەوەو تاوێکی چاك تێمەوە ڕاما.

که دیتم کارەکە خەریکە پیس دەبێ بەترس و لەرزەوە گوتم:

ـ گەورەم، بەگم هاتووم کارێکم پێبسپێرن. کابرای سەرۆکی هەموان پرسی:

ـ چ کارێك دەزانی؟

ـ هەر کاریك بێ.

ـ ها؟ دیارە زۆر پیاوێکی خوێڕی کە ئامادەی هەموو کارێك بکەی!

سەرم داخست و دەنگم نەکرد. پرسی:

ـ خوێندەواریت هەیە؟

ـ بـەڵـێ.

ڕووی کردە سەرۆکی ئەندازیارەکان و گوتی:

ـ لە جێگای وەسڵ نووسەکەی پێشووی دابنێن، کوڕێکی خراپ دیار نیە!

ـ بەسـەر چـاو. سـەرۆکی ئەنـدازیارەکان چـاوی لـە یـەکێك داگـرت و کـابراش بەسرتە بەمنی گوت:

ـ وەرە بەدوامدا.

کاتێك دەرکەوتین لە خۆشیان خەریك بوو باڵ بگرم، بەسەر ئەو خیـزو چـەوەدا هەروا بازبازێنم بە دوای کابرادا دەکرد. کاری شەوکارەکان دەستی پێ کردبـوو خەریك بوون بە تەناف چیمەنتۆی گیراوەوەیان هەڵدەکێشا.

یەکێك لەسەر تاقەکە ڕاوەستا بوو فـەرمانی بـە کرێکارەکـان دەدا. کـابرای کـە منی بردبوو بە سەر کرێکارەکەم بناسێنێ هەر لە خوارێ ڕا بانگی کرد:

ـ وەستا حەسەن! ئە مـە ئاغـا ناردوویـەتی. وەسـتا حەسـەن بێئـەوەی ئـاوڕ بداتەوە پرسی:

ـ کاری چیە؟

ـ لـە جێگـای وەسـڵ نووسـەکەی جـارانی دابنـێ. هـەروا بـەدەم فەرماندانـەوە گوتی:

ـ ها! زۆر باشە، با بێ خەریك بێ!

کابرای چاوساغم چۆوە مەکتەب و منیش چوومە لای وەسـتا حەسـەن. وەسـتا بێ ئەوەی هەر تەماشام بکا، پرسی:

ـ تا ئێستا ئەو جۆرە کارانەت کردوە؟ دەمزانی ئەگـەر بڵـێم نـا، وەرم نـاگرن. بۆیە بێ سێدوو گوتم:

ـ بەڵێ چەند ساڵێك وەسڵ نووس بووم.

ـ زۆر باشە، کەوابێ ئەرکی خۆت باش دەزانی. هەر شتێکی دێتە کارگە وەسڵێکی بۆ دەنووسی دەی‌نێریە لای عەمباردار.

ـ بەڵێ دەزانم. پاشان وەستا لە نەکاو نەڕاندی:

ـ ها سەگباب! قالبەکەت بەهەڵە هەڵگرت، ئەو قالبە هی ئەوێ نیە.

ـ حیساب باش دەزانی؟

ـ بەڵێ قوربان.

ـ لیستی ڕۆژانەی کرێکارەکانیش دەبێ خۆت بینووسی.

ـ بەسەرچاو.

ئەمجار بای داوە سەر کرێکارەکان و قیژاندی:

ـ هۆی جاشەکەر! قالبی ژمارە چوارت لە کوێ دانا؟ بڕۆ ئەوبەر، نەکەوی، ئەتۆش وریا بە بەهەڵە نەچی.

لەبەر ئەوەی هیچ ئاوڕی نەدایەوە نەمزانی لەگەڵ منیەتی یان فەرمان بە کرێکارەکان دەدا. پرسیم:

ـ لەگەڵ منتان بوو؟!

ـ بەڵێ، ڕۆڵە گیان بە شاوڵ کار بکە.

پێم وابوو شاوڵ ناوی یەکێك لە کرێکارەکانە لە وەڵام دا گوتم:

ـ بەسەرچاو.

ـ لەگەڵ تۆم نیە، هۆی لەگەڵ تۆمە، تەنافەکەت بسووڕێنە. ئەتۆ دەبێ حیسابی تەواوی ئەو کەرەستانە ڕابگری کە دێنە ئێرە!

ـ مـن؟

ـ ئەولانا هەتیو، بۆ ئەم لای بسووڕێنە. خەریك بوو شێت بم، سەرم لە قسەکانی دەرنەدەچوو. لێم پرسی:

ـ چ بسووڕێنم؟

ـ لەگەڵ تۆم نیە. تۆ دەبێ حیسابی چیمەنتۆ و خشت و گێچ بە جیاجیا ڕابگری.

ـ هۆی کوڕە بەکرەکە ڕاکێشە. ئەوەی دێ لەلایەکی تر. لەولانا هەتیو!

ـ ئەی لەکام لای بنووسم؟

بۆ یەکەم جار تووڕە بوو، ڕووی کردە لای من و گوتی:

ـ بۆچی لە تۆ بەولاوە زەلامی لێنیە؟

ـ ببوورە پێم وابوو لەگەڵ منتە!

ـ نا، بڕۆ زووتر دەست بەکار بکە.

نەم دەزانی ڕوو ڕوو لە کوێ بکەم "خوایە، پاش ئەو هەموو چەرمەسەریە ئەمە چ کارێك بوو دەستم کەوت؟".

وەستا حەسەن ڕووی دەلای کریکارەکان بوو، خەریك بوو فەرمانی دەدا:

ـ قالبە بەتوونەکان بنێرنە خوارێ. کوڕە هێشتا ڕاوەستاوی؟ دیسان نەمزانی لەگەڵ منیەتی یان لەگەڵ کرێکارەکان هەروا بێدەنگ ڕاوەستام.

وەستا حەسەن نەڕاندی:

ـ زووکە چاوی خۆت دەرێنە، بڕۆ خەریك بە. پرسیم: بچمە کوێ؟

ـ بڕۆ عەمبارێ، دەفتەرەکان وەرگرە. لە خوار خوارێ. وەڕێ کەوتم بڕۆم، دەنگی وەستا حەسەن بەرز بۆوە:

ـ گێژی نەفام بۆ کوێ دەچی؟ گەڕامەوە بزانم بۆ جنێوم پێدەدا، بەڵام دیتم لەگەڵ کرێکارەکانیەتی.

ڕۆیشتمە عەمبارو خۆم بە عەمباردار ناساند. ئەویش قاقایەکی درێژی کێشاو گوتی:

ـ کێ تۆی ناردوە؟

ـ وەستا حەسەن.

ـ بۆلای ئەو کێ ناردی؟

ـ ئاغا.

ـ خزمی ئاغای؟!

بریا زمانم لاڵ بایەو وەڵامم نەدابایەوە. ئەگەر ئەم زمانە سەگباب خێوە نەختێك بەولادا گەڕاباو درۆیەکی بەسوودی خۆم کردبا ئێستاچارەنووسی من شتێکی تر بوو. لەبەر بێ ئەقڵی ڕاست و ڕەوان گوتم:

ـ نا، بابە، بەزەیی پێمدا هات و فەرمانی دا کارێکم بدرێتێ. هەر کەئەمەی بیست دەسبەجێ تامی زاری گۆڕاو زۆر بە سووکایەتیەوە گوتی:

ـ بڕۆ هۆ لەوێ دەفتەرەکانت هەڵگرە خەریك بە. دەفتەرەکانم هەڵگرت، بەلام هیچ سەرم لێیان دەر نەچوو، لێم پرسی:

ـ ئەم دەفتەرانە هی چین؟ بەتانووتەوە پێکەنی:

ـ بابە وەڵلا جوانە! بڕوانە ئێمە لەگەڵ هی چۆن پێوە دەبین: کوڕی چاك وادیارە تازە لە قوتابخانە دەرچووی! گوێم نەدا تانووت وتەشەرەکانی، گوتم:

ـ نا، دڵنیابە، زۆر باش سەرم لەو حیساب و کیتابە دەردەچێ!

دەفتەرەکانم لەبن هەنگڵم ناو لە عەمبارێ وەدەر کەوتم:

" خوایە چار چیە؟ باشە چۆن بوو ئەوانە بێ ڕاسپاردەی کەس کاریان دا بە من؟ نەکا کەڵەکێکم بۆ دروست کەن. بەڕاستی، بۆچی مووچەی منیان دیاری نەکرد؟ ئەمە بەجێگای خۆی، چۆن بوو باوەڕیان پێ کردم؟".

بەو بیرو خەیالانەوە خەریك بووم، وەك سەرخۆشان دڵم دەشێواو سەرم دەسووڕا. هەستم دەکرد ئەم ماستە بێمووو نیە "خوایە ئاخری خێر بێ".

سەرلەنوێ چوومەوە لای وەستا حەسەن. ئەو هەروا خەریك بوو فەرمانی دەدا. ماوەیەك ڕاوەستام و لە دەرفەتێك دا کە وەستا حەسەن دەمی لە کالان کەوت گوتم:

ـ قوربان! ئێستا چ بکەم؟ دیسان بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە وەڵامی دامەوە:

ـ لەسبەینێ ڕا خەریکی کاری خۆت بە، سەعات حەوت ونیو دەبێ لێرە بی، وریا بە هەڵنەخلیسکێی.

تەماشایەکی بەرپێی خۆم کرد، هیچی وای لێنەبوو هەڵخلیسکێم. بەوەڕا زانیم لەگەڵ کرێکارەکانیەتی. نەم دەزانی تەگبیرم چیە، جێگایەکم نەبوو تا بەیانی لێی بحاوێمەوە. هەروا بێدەنگ ڕاوەستا بووم، لەپڕ وەستا حەسەن نەڕاندی.

ـ چیە بۆ ڕاوەستاوی؟

نەم دەزانی لەگەڵ منیەتی یان لەگەڵ کرێکارەکان. نەش دەوێرام پرسیاری لێبکەم. ئەمجار توندتر قیژاندی:

ـ لەگەڵ تۆمە گێژە! بە ترس و لەرزەوە گوتم:

ـ چ جێم نین بیان چمێ.

زۆر تورە بوو، وەرسووڕایەوەو بۆ یەکەم جار تەماشای کردم و لە بن لێوانەوە گوتی:

ـ لەگەڵ تۆم نیە، لەگەڵ کرێکارەکانمە. پاشان ڕووی کردەوە ئەولاو گوتی:

ـ بڕۆ لە زمانی منەوە بە عەمباردار بڵێ جێگایەکت بداتێ لێی بخەوی.

تێگەیشتم ئەمجارەیان لەگەڵ منیەتی. بەخۆم و دەفتەرەکانمەوە چووومە لای عەمبادار. کابرا بە مۆرەیەکی پڕ لە سووکایەتیەوە دالانێکی درێژ و تاریکی پێ نیشان دام:

ـ بڕۆ لەوێ لە تەنیشت کرێکارەکان درێژ بە.

دالانەکە شەدار بوو. دەپازدە کەس لە کرێکارەکان هەر یەکە دووسی لەتکەدارو تەختەیان دانابوو لە سەریان ڕاکشابوون. دەنگی پرخ وهۆڕیان مێشکی پیاوی دەبرد: "خوایە گیان! منێك کە تا ئێستا هەر لە جێگای گەرم و نەرم دا نوستووم چۆن لەسەر ئەمانە خەوم لێدەکەوێ؟". سەرما لەلایەك و ناڕەحەتی

و پرخ و هۆڕی کرێکارەکان لەلایەکی تر ئەوەندەیان ئازاردام هەتا مەلا بەنگدان چاوم لێك نەنان. بەو حاڵەش لە بەیانیەوە دەست بە کاربووم.

کاری من راگرتنی حیسابی خیزو چەوو چیمەنتۆو ئەو جۆرە کەرەستانە بوو کە لە عەمبارەوە تەسلیمی وەستاکان دەکران. بۆ هەر کامەی دەفتەرێکی تایبەتیم هەبوو. بێجگە لە نووسینی چەشن و ڕادەی کەرەستەکان، لە گوازتنەوەی گوونییەکان و کیسە چیمەنتۆو گێچەکان و ئەو جۆرە شتانەش دا یارمەتی کریکارەکانم دەدا. سەرەڕای ئەمانە دەبوو لیستەی کرێکارەکانیش بگرم و ڕۆژانی شەممە هەقدەستەکەیان بدەمێ.

بەهەر کوێرەوەری و چەرمەسەرییەك بوایە کارەکانم ڕادەپەڕاندو بەرە بەرە لە کارەکەم دا سەر ڕاست دەبووم و خەڵکیشم دەناسی. ڕۆژی شەممە مووچەی ئەو هەفتەیان دامێ کە ڕۆژی دوولیرەو نیو بوو.

هەر کەسێکی دیکە لە جێگای من بوایە لە داخان دەتەقی، بەڵام من باکم نەبوو. هەر ئەو ڕۆژە لە دڵی خۆم دا دەمگوت: "بەزوویی نیوەی خانووبەرەکانی ئەم شارە دەبن بەهی تۆ".

بڕیارم دا هەر لەو پارەیە ڕۆژی پەنجا قڕۆش پاشەکەوت بکەم. شەوانە دەچوومە سەربان و پارە وردەکانم دەژماردو لەوێ ڕا سەیری دیمەنی شارم دەکردو نەخشەم دەکێشاو خەیاڵ پڵاوم دەکرد. سێ هەفتە بوو،کارم دەکرد.

پاشەکەوتەکەم گەیشتبوە چاردە لیرە. بە دڵم دا هات حەوت هەشت لیرەیەك بۆ دایکم بنێرم و باسی خۆمی بۆ بنووسم. پاش نیوەڕۆ چوومە لای وەستا حەسەن و نیو سەعات ئیجازەم داوا کرد.

وەستا حەسەن لە دوورەوە کە چاوی پێم کەوت ڕووی وەرگێراو لەگەڵ کرێکارەکان کەوتە نەڕەو گوڕە:

ـ کوڕە ئەو ئاسنانە چەند سانتی میترن؟ سیمەکان توند ببەستن! لەچی دەگەڕێی؟

تێگەیشتم ئەو ڕستەی دوایی لەگەڵ منە، نەگەیشتم جوابی بدەمەوە کە دیسان بەسەر کرێکارەکانی دا نەڕاند: کوڕە ئەو ئاسنەی باش جۆش بدە... سەری ئاسنەکە بقرتێنە، دەبڵێ! بۆقسە ناکەی؟

دیسان مۆڵەتی نەدام قسە بکەم کە ڕووی وەرگێڕا. ئەوەندەم ڕق هەستابوو کە وەك مێژۆك هەڵدەلەرزیم، بەغاردان چوومە بەردەمی و ویستم قسە بکەم کەچی دووبارە پشتی تێکردم. "وەرە تەختە هاتوە وەری بگرە".

لۆرییەکی پڕ لەدار لەبەر دەرکی عەمبارێ ڕاگیرابوو، قۆنتەراتچی دارەکانیش لەتەنیشت لۆرییەکە ڕاوەستابوو. دەسبەجێ ڕام کرد دەفتەرەکەم هێنا.

قۆنتەراتچی بەپێکەنینێکی تایبەتیەوە هاتە لام و گوتی:

ـ وەسڵی بیست و چوار میتری شەش گۆشەم بۆ بنووسە. من لە کارەکانم زۆر ورد بووم. چونکە نەم دەویست شتێکم بێتەوە سەرو دەر بکرێم. گوتم:

ـ ڕێگا بدە بیان پێوم، بەسەر چاو.

قۆنتەراتچی یەقێکی هاتەوە بەر:

ـ پێوانی چی؟ جەنابت هاتووی قانوونمان بۆدروست بکەی، زووبە وەسڵەکەم بۆ بنووسە با بڕۆم.

قامکەکانی بە چەشنێکی تایبەتی ڕێك خشاندن کە مەبەستی بەرتیل دان بوو. بەڵام من وەسەر خۆم نەهێناو وام نیشان دا کە حاڵی نەبووم گوتم:

ـ ئەندازە گرتن کارێك نیە، هەر ئێستا تەواو دەبێ! پاشان بێ ئەوەی تەماشای چرچاوی بکەم دەستم کرد بە پێوان.

ـ دیارە تۆ باوەڕت بەئێمە نیە؟

ـ خوا نەکا، بۆچی باوەڕم پێتان نیە؟

ـ ئەی بۆچی دارەکان دەپێویەوە؟

ـ چونکە دەبێ تەسلیمی عەمبارێیان بکەم.

خەنجەرت لێدابا خوێنی لێ نەدەهات، بەتەوس و پلارێکەوە گوتی:

ـ ئەمە مندالّی دوێنێیە، کێ هێناویەتە ئێرە؟

من جوابم نەدایەوە. کاتێك دارەکانم پێوا هەژدە میتر بوون، واتە شەش میتری شەش گۆشەیان کەم بوو.

قۆنتەراتچی توورە بوو چووە لای عەمبادار.

دەمەویست دووبارە بیان پێومەوە کە عـەمباردارو قۆنتەراتچی پێکـەوە هاتنـە لام. عەمباردار بەزمانێکی خۆش و دۆستانە گوتی:

ـ بۆچی خۆت ماندوو دەکەی، وەریان گرەو وەسلّی بۆبنووسە.

سەرم هەلّێناو چاوم بڕیە چاوی عەمباردار:

ـ وەسلّی چی بدەمێ؟ شەش میتری شەش گۆشەیان کەمە.

ـ بەهەلّە چووی، حەتمەن تەواون.

ـ باشە ڕاوەستە بیان پێومەوە.

ـ زەحمەت مەکێشە وەسلّی بدەیە با بڕوا.

ـ ئاخر بیست وچوار میتر نیە، کەمییەکەی لەکێ بستێنم؟

ـ ئەمن قبولّمە.

ـ یانی تۆ وەسلّی بیست و چوار میتر دەدەی بەمن؟!

ـ بەلّێ ئەرێ وەللّا!

ڕاستیشی دەکرد، پێشـتریش هەرچـی لـەمنی وەرگرتبایـە حیسـاب و کیتابێـك نەبوو، چەندم گوتبایە قبولّی دەکردو وەسلّی دەدامێ. دیـارە لـەوان دلّنیـابوو، بەلاّم ئەمەیان چی؟ قۆنتەراتچی دە لیرەییەکی بۆ ڕاداشتم و گوتی:

ـ ها بگرە بابە، کارەکەی گەورە مەکە. تۆ زۆر زوودانت هات.

عەمباردار دەستی کرد بە پێکەنین و بە قۆنتەراتچی‌یەکەی گوت:

ـ بەرێکەوت زۆر کوڕێکی باش و بە گوێیە!

مـن هـەروا ڕەق ڕاوەسـتابووم و تەماشـام دەکـردن. قۆنتەراتچـی دەسـتی بـە پارەکەوە بەهەواوە ڕاگرتبوو. عەمباردار گوتی:

ـ ئاغا دەستی ڕاگرتوە، وەریگرە. نەختێك کشامەوە گوتم:

ـ زۆر سوپاس (شیرنی) ناخۆم. دەسبەجێش دەسـتم کـردەوە بـە پێوانـەوەی دارەکان.

عەمباردار بە چپە بەقۆنتەراتچیەکەی گوت:

ـ پێم وایە دە لیرەی پێکەمە، بۆیە وەری نـەگرت. قۆنتەراتچـی بەمانایەکـەوە وەڵامی دایەوە:

ـ دیارە زۆر لەمەمانان زرینگترە! ئەمجار دەلیرەی تریشی خستە سەر!

ـ ها وەرە، دەرنگ هاتووی و دیارە دەتەوێ زووش بڕۆی.

ـ کاکە پارە وەرناگرم، لێم گەڕێ دارەکان بپێومەوە.

ـ کورە زۆر گرانت بۆ تەواو دەبێ.

دیسان گوێم نەدایەو خەریکی پێوانی دارەکان بووم. ئەم جارەیان قۆنتەراتچی بەڕق و تووڕەییەکی توندەوە گوتی:

ـ مادام وایە هۆباڵی خۆت بەئەستۆی خۆت.

پاشان هەرای کرد...

ـ وەستا حەسەن تا ئێرە وەرە.

وەستا حەسەن دەسبەجێ کارەکەی بەجێهێشت و بەغاردان هات بۆلای ئێمە.

قۆنتەراتچی وەك دەست بۆ سەگ ڕادێرێ منی پێنیشان داو گوتی:

ـ ئەم دیاری‌یەتان لە کوێوە هێناوە، چما بنیادەم قات بوون؟ وەستا حەسـەن پشتی کردە من و گوتی:

ـ بۆچی، کارێکی خراپی کردوە؟

دڵنیا بووم وەستا حەسەن ئاگای لەمەسەلەکە نیەو ئەگەر تێبگا لایەنی من دەگرێ و قۆنتەراتچی بەگۆری بابی دا دەڕپەنێ!

ویستم زۆر بەشانازیەوە مەسەلەکەی بۆ باس بکەم ، بەڵام قۆنتەراتچی مەودای نەدام:

ـ نازانم مەبەستی چیە؟ بۆچی گیروگرفتمان بۆ دەتاشێ؟ وەستا حەسەن پشتی هەر دەلای من بوو پرسی:

ـ باشە بۆچی ئەوتەختانە وەرناگری؟

ـ زۆریان کەمە، هەژدە میتری هێناوە و وەسڵی بیست و چوار میتری دەوێ.

ـ گیری مەکە، زووبە وەسڵەکەی بۆ بنووسە.

پێم وابوو پشتی دەلای من بووەو لە قسەکەم حاڵی نەبووە، بەدەنگێکی بەرز گوتم:

ـ وەستا کەمیەکەی لەکوێ بێنم؟

ـ ئەتۆ هەقت نەبێ، تەسلیمی عەمباداری بکەو وەسڵی بیست و چوار میتر وەربگرە!

وەك مەستان سەرم دەسووڕاو سەرم لەو قسانە دەرنەدەکرد. دەمزانی کەڵەکێك لە گۆڕێ دایە، بەڵام نەم دەزانی زیانەکەی بۆ کێیە.

تووشی وەزعێکی سەیر ببووم. منێك کە تا دوێنێ ناوی دزیو فزیم بیستبا موورەگەی پشتم ئارەقی دەکردو هەر لەسەر ئەوەش کوڕەکان ناویان نابووم (گێلەپیاو) ئێستا دەبوو بۆخۆم ببمە دەسکیسی دزیو فزی خەڵکی ترو سەنەدیشیان بۆ ئیمزا بکەم:

ـ وەستا حەسەن! من مەسئوول دەبم، ناتوانم شتی وا بکەم.

ـ مەسئوولی چی کوڕی باش؟ تۆ وەسڵی چەند دەدەی وەسڵی ئەوەندەش لە عەمباردار وەردەگری.

ـ وەستاگیان! ئەی ئەو شەش میتر تەختەیە چی لـێ دێ؟ وا تـۆڕە بـوو گـوتم هەر ئێستا دوو سیخورمەم تێ دەکوتێ، بەو حاڵەش گوتم:

ـ نای نووسم، ویژدانم قبوڵ ناکا فێڵ بکەم. دیار بوو ئەمجارە زۆر لەدڵی گـران هات. نەختێك دەنگی نزم کردەوە:

ـ ڕۆڵە گیان بە تۆچی؟ لێرە کەس زەرەر ناکـا. بیسـت و چـوار مـیتری شـەش گۆشە هاتوەو بیست و چوار میتر شەش گۆشەش دەچێتە دەرێ. ئـیتر زەرەرو زیانەکەی لەکوێدایە؟!

گوتم: ناتوانم وەسڵی بدەمێ.

ـ هەتیوە پێ لەکەری شەیتان بێنە خوارێ، دەرت دەکەم.

ـ ئەمنیش دەچمە لای ئاغا شکایەت دەکەم!

ـ ئێستا ئاغایەکت نیشان دەدەم تێت بگەیەنێ.

قۆنتەراتچی و وەستا حەسەن بەپەلە چوونە ژووری ئەندازیارەکان.

عەمباردار دەتگوت لەسەر تەرمی بابی ڕاوەستاوە، سەری بەلاوە نابوو و لەبەر دەرگای عەمبار ڕاوەستابوو. کاتێك ئەوان ڕۆیشتن گوتی:

ـ کارێکی باشت نـەکرد بەقسـەی وەسـتا حەسـەنت نـەکرد. سـەرەڕای ئـەوەی بیست لیرەکەت لە کیس چوو، لێرەشت دەردەکەن. پیاو نابێ هێندە کەللەڕەق بێ، ئەو بەستەزمانەش ناچارە دەرخواردی هـەمووان بـدا. دیسـانیش پیـاوێکی باش و دڵ و دەروون فراوانە کە بیست لیرەی دا بەتۆ.

لێم پرسی:

ـ باشە، لەو ناوەدا کێ زەرەر دەکا؟

ـ هیچ کەس.

ـــ قسـەی چـاك بكـە، بابـە گیـان چـۆن شـەش مـیتر دار بـەنێو قامكـان دا بەردەبێتەوەو كەسیش زەرەر ناكا؟!

ـ تەنیا یەكێك زەرەر دەكا، ئەویش تۆی كە هەم بیست لیرەكـەت لـەكیس خـۆ داو هەم لێرەشت وەدەر دەنێن. لەوكاتەدا كرێكارێك هات و گوتی:

ـ ئاغا كاری پێتە!

زۆرم دڵ پێ خۆش بوو. ئێستا هەمووشت روون دەبێتەوەو ئاغا زۆری پێخۆش دەبێ كە لاوێكی وەك من پاك و ڕاست لە دەزگایەكەی دا هەیـە قـازانجی ئـەوی لەبەرچاوە. حەتمەن مووچەكەم بۆ زیاد دەكاو بەرە بەرە رێگای سەركەوتنم بۆ دەكرێتـەوە! بـە پێكەنینـەوە چـوومە ژوورێ. وەسـتا حەسـەن و قۆنتەراتچـی لەوێ بوون. ئاغا مۆڕەیەكی لـێ كردم و پرسی:

ـ بۆچی وەسڵی ئەو دارانە نادەی؟

ـ قوربان هـەژدە مـیتری شـەش گۆشـە داری هێنـاوەو وەسـڵی بیسـت و چـوار میتری دەوێ. ئاغا زۆر لەسەرەخۆ گوتی:

ـ باشە بە تۆ چی؟ تۆ وەسڵی بدەیەو هەر ئەودارەش تەسلیمی عـەمبار بكـەو وەسڵی بیست و چوار میتر وەربگرە! زۆرم پێسەیر بوو، هەرچی دەمكرد بـۆم نەدەچۆوە سەریەك:

"كوڕە خۆ ئەمیش هەروا دەڵێ". تفم قووت دایەوەو گوتم:

ـ ئاغا پێم وایە نەمتوانی مەسەلەكەت باش عەرز بكـەم. هـەژدە مـیتری شـەش گۆشە داری هێناوە. شەش میتری كەمە، وەسڵی ئەویشی دەوێ.

ـ تێدەگەم كوڕی باش... وەك تـۆ كـەر نـیم... پـێم گـوتی تـۆ هـەقت نیـە... وەسڵی بدەیە با بڕوا!

دیسان نەم دەتوانی قبوڵ بكەم كە ئەو كارە عەیبی نیە.

گوتم:

ـ ڕێگا دەدەن بۆتان ڕوون بکەمەوە؟ ئاغا نەڕاندی:

ـ زۆر چەنە لێدەدەی. دەڵێم وەسڵی بدەیە، بڵێ بەسەرچاو و بڕایەوە. لەو گێژی و سەرسوڕمانەدا هێندەی نەمابوو بچمە ژێربار. بەڵام دەسبەجێ هاتمەوە سەرخۆم و گوتم: "قوربان ئاخر...".

ئاغا پێکەنینی بەگێژیو نەزانی من هات:

ـ برۆ بەخێرایی کارەکان مەوەستێنە وەسڵی بیست و چوار میتری بۆ بنووسە. دوایەش هیچ نابێ:

ـ قوربان شەش میترە کەمیەکەی چی لێ دێ؟

ئەمجار ئاغا بەتووڕەییەوە هاواری کرد:

گەوجە بەتۆ چی؟ چما ئەتۆ هاتووی لێرە فزوولی بکەی؟. تا ئێستا بنیادەمی وا شێت و پەتیارەم نەدیوە. پاشان ڕووی کردە وەستا حەسەن و گوتی:

ـ ئەمەتان لەکوێ پەیدا کردوە؟

ـ ئێمە پەیدامان نەکردوە، خۆتان ناردووتانە!

ـ من! قەت شتی وا نیە! وەسڵ نووسەکەی پێشوو زۆر کوڕێکی باش بوو. قۆنتەراتچی کە هەتا ئەو کاتە بێدەنگ بوو، هاتە قسە:

ـ هەتا ئەمڕۆش هێندە بەد ئەخلاق نەبوو. ئەمڕۆ نازانم بۆچی جنۆکە لەسەری داوە!

تێگەیشتم کە تا ئێستا کڵاوم چۆتە سەرو خێزو چەوو چیمەنتۆیان زیاد حیساب کردوە. ئاغا پرسی:

ـ ناوت چیە؟

ـ فەرید.

ـ خوێندەواریت چەندە؟

ـ پۆلی پێنجی ناوەندیم خوێندوە.

ـ ئەی بۆچی ناوەندیت تەواو نەکردوە؟ چونکە فێر نەبووم درۆ بکەم هەموو بەسەرهاتەکەم هەر لە سیر هەتا پیواز بۆ گێڕایەوە.

ئاغا گوتی: "ها... دیارە زۆر ناڕەسەن بووی، بۆیە لە قوتابخانە دەریان کردووی". پاشان رووی کردە وەستا حەسەن:

ـ کێ بەئێوەی گوتوە نەدیو و نەناسیاو ئەم دزە ساختەچیە ڕابگرن!! ئەمە چۆن جێگای متمانەیە؟ ویستم قسەیەك بکەم، بەلام ئاغا پێشم کەوتەوە:

ـ برۆ لاچۆ لەپێش چاوم. تۆ بۆ کارکردن دەست نادەی.

ـ قوربان ئاخر...

نەڕاندی:

ـ برۆ لاچۆ لەبەر چاوم هەتابە شەق وەدەرم نەناوی...

تێگەیشتم ئیتر ڕاوەستان بێسوودە. چوومەوە عەمبار کە جل و بەرگ و کەلوپەلەکەم هەلگرم و بڕۆم، عەمباردار پرسی:

ـ ها... چ بوو؟

ـ دەریان کردم.

ـ تۆ بەو کەللە ڕەقیە لە هیچ کوێ ناتوانی کار بکەی! لەعەمباردارم پرسی:

ـ وەختێك هەرچی بێتە عەمبارو بڕواتە دەر حیساب و کیتابێکی نەبێ، کەوا بوو منتان بۆ دامەزراند؟ عەمباردار قاقایەکی درێژی کێشاو گوتی:

ـ بوونی وەسڵ نووس هەر بۆ ڕواڵەت بازیە!

پرسیم:

ـ لە شتێکی تریش نەگەیشتم. ئاغا دەیگوت: "ئێمە پیاوی باوەڕپێکراومان دەوێ". کەسێکی هەموو شتێك بێ پێوان و کێشان وەربگرێ چۆن جێگای باوەڕە؟ وەلامی دامەوە:

ـ گاڵتە بەمن دەکەی، یان بەراستی دەتەوێ ڕاستەقینەت بۆ دەرکەوێ؟

- وەڵڵا دەمەوێ ڕاستیەکەی بزانم.

- پیاوی باوەڕپێکراو ئەوەیە کە هیچ کارێك بێ ئاگاداری لەخۆی بەرەژوورتر نەکا. لەوەتا ئەم خانوویەرە دەستی پێکراوە نۆ وەسڵ نووسیان گۆڕیوە. هەشت کەسیان دز بوون و تۆش نەفام دەرچووی!

- دەبێ ببووری پرسیارێکی دیکەشم هەیە.

- بپرسە بزانم.

- لەو بێنەویەرەی دارەکان دا کە منی لەسەر دەرکرام کێ زەرەر دەکا؟

- هیچ کەس!

- وەختە شێت دەبم، ئەی شەش میتردارەکە چی لێدێ؟ لەوکاتە دا دەنگی وەستا حەسەن لەپشتمەوە بەرز بۆوە کە دەی نەڕاند:

- تۆ هێشتا لێرەی؟ یاڵڵا شتوومەکەکانت هەڵگرەو لاچۆ لەبەر چاوم!

بە عەمبارداریشی گوت:

- زوو ئەم سەگە بکەنە دەرەوە!

کراس و دەرپێیەکی زیادیم هەبوون لە ڕۆژنامەیەکمەوە پێچان و وەبن هەنگڵی خۆم دان و وەدەر کەوتم. بۆئەوەی بزانم دەچمە کوێ ملی کووچەو کۆڵانم گرت. لەلایەك بیرم لە بەدبەختی و ئاوارەیی خۆم دەکردەوەو لەلایەکیش هەر لێکم دەدایەوە کە شەش میتر تەختەکە چی لێدێ!

چەند ساڵ دواتر وەڵامی ئەو پرسیارەم بۆ دەرکەوت. ئەوەی لەوناوەدا زەرەری دەکرد تەنیا دەوڵەت بوو. ئاغا قۆنتەراتچی گەورە بوو کە ئەو خانوو بەرەی بە قۆنتەرات لە دەوڵەت وەرگرتبوو.

تەواوی ئەو پێویستانەی دەهاتنە عەمبارو وەسڵیان بۆ دەنووسرا، لەسەر دەوڵەت حیساب دەکران و پارەکەیان وەردەگیرا. جەنابی قۆنتەراتچی سەردەستەی دزەکان بوو، لەکاتێك دا رازی نەبوو هیچ کەس ئەوەندەی

سەرەموویەك لەو هەموو دزیەی ئەو بدزێتەوە. پاش چەند ساڵ تێگەیشتم دزە گەورەکان دزی بچووك پەروەردە دەکەن، بەڵام ئەگەر لەو ڕادەیەی بۆیان دیاری دەکەن زیاتر بدزن جێگای متمانە نین!

❋ ❋ ❋

لەدالانێ دەنگی ئەفسەری ئێشك بەرز بۆوە:

"بچنەوە ژووری خۆتان"

هەستی پێی بەندیەکان بەرز بۆوە، دەنگی خشپەخشپی کەوشی هێندێکیان کە بە ئەنقەست دەیانەویست کەوشەکانیان لە زەوی بخشێنن گوێی بنیادەمی زۆر ئازار دەدا.

"یاڵڵا زووبن دەمەوێ بەسەرتان کەمەوە".

تاوێك هەراو هوریا دامرکا، بەندیەکان چوونەوە قاوشەکانیان. ئەفسەری ئێشك و مەئمووری قاوشەکان خۆیان بەژوورەکان دا دەکردو دوای ئەوەی هەموویان دارژمێر دەکردن مەئموورەکە بەتەشەرەوە دەیگوت "خوا هەمووتان رزگار بکات!". کاتێك ئەفسەری ئێشك هاتە ژوورەکەی ئێمەو چاوی بە "گێلە" کەوت قاقایەکی کێشا:

ـ لێتان پیرۆز بێ جوان ڕێك کەوتون. دەڵێی بۆیەکتر تاشراون!!!

(گێلە) سەری هەڵبڕی:

ـ چ بکەین بەگم... ئەمە ژیانە، پیاو دەبێ بیگوزەرێنێ. مەئمووری قاوشەکە بەشێوەیەکی زمان لووسانە گوتی:

ـ ئاگات لەو زاتە بێ نەیەڵی نارەحەت بێ، ئەمجا وریاش بە (پەتە)ت نەکەوێتە سەر ئاو. خۆت دەزانی کاکم رۆژنامەنووسەو رۆژنانووسەکانیش... بەڵێ... هە... هە...!!

لەجیاتی ئەوەی قسەکەی تەواو بکا پێکەنینێکی تایبەتی کردو من قسەکەم بۆ تەواو کردو گوتم:

ـ فزوولن:

ـــ نا، ببوورە، من بێ ئەدەبی وا ناکەم. ئەفسەری ئێشك و مەئمووری قاوشەکەمان چوونەدەرو بەجێیان هێشتین.

گێلە لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشا، چاوی بریە تابلۆیەك کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو و بەخەتێکی ناخۆش نووسرابوو "خوایە رزگارم بکەی"و کەوتە ناو دەریای بیرکردنەوە. دڵم نەهات لێی تێك دەم، منیش لەسەر قەرەوێڵەکەم درێژبووم و دەهۆشەوە چووم. خەریك بوو خەوم لێ بکەوێ گوێم لەهاوارێك بوو، تێك رابووم و لە جێگاکەم دەرپەریم. دیتم دەنگی گێلەیە، تومەز خەونێکی سامناکی دیوەو لەترسان قیژاندوویەتی.

بۆخۆشی زۆر نارەحەت بوو، لێم پرسی:

ـ چ بوو!

ـ هیچ، خەونێکی ناخۆشم دی و زۆر ترسام .بۆئەوەی نارەحەتیەکەی لەبیر بەرمەوە گوتم: پاشماوەی بەسەرهاتەکەت بۆ باس نەکردم.

گێلە ئاورێکی لێدامەوە:

ـــ وادیارە دڵنیای کە سبەینێ بەردەبی و دەتەوێ ئەمشەو هەمووت بۆ بگێڕمەوە.

ـ بەدەست خوایە! گێلە هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا:

ـ خۆزگەم بەخۆت کە هیوات بەژیان هەیە. بەڵام منی قوڕبەسەر چی کە ئەگەر بەریشم بدەن پاش هەفتەیەك دەبێ بێمەوە ئێرە... چونکە چ جێم نین بیان چمێ .کۆڵە گرووپەکی قورسی لەئەوکێ گیرابوو گوتم:

ـ باشە بەسەرهاتەکەتم بۆباس بکە.

ـ بەڵێ، هەروا کە سەرم بەردابۆوەو بێ ئامانج لە کۆڵانەکان دا دەخولامەوە لەپشتەوە گۆیم لەیەکێك بوو کە بانگی دەکردم "هۆی فەریدە گێل".

زۆرم پێسەیربوو، دەبێ کێ بێ وا لەقەبی من دەزانێ؟ کاتێك ئاوڕم دایەوە لەپڕدەستی کردە ئەستۆم. ناسیمەوە، "نەجدەت" کۆنە هاواڵی قوتابخانەم بوو کە پێکەوە لەپۆلێك بووین، بەڵام ساڵێك پێش من لە قوتابخانەی عەسکەری دەرکرابوو. جل وبەرگێکی پاك و تەمیزی دەبەردا بوو. هێندەم پێ سەیر بوو حەپەسام.

نەجدەت رزقی سوارو خۆی پیادە بوو، قەت نەیدەتوانی بچێتە سینەما. لەبەر نەبوونی و هەژاری رۆژەکانی پشوودانیش هەر لە قوتابخانە دەمایەوە. ئەی ئەو دەزگایەو ئەم ئوتومبیلە ئاخر مودێلەی لەکوێ هێناوە؟

نەجدەت دەستی خستە سەر شانم و پرسی:

ـ فەرید خەریکی چی؟

هەموو بەسەرهاتی خۆم بەکورتی بۆ گێڕایەوە، زۆر پێکەنی پاشان قۆڵی گرتم و گوتی:

ـ باش بوو یەکترمان گرتەوە! گوێ مەدەیە، خەفەت مەخۆ. رایکێشام بۆلای ئوتومبیلەکەی، سواربووین و پێی پێوەنا. لەرێگا من هەر قسەم بۆ دەکردو ئەویش بێپسانەوە پێدەکەنی! لەیەکێك لەشەقامە گەورەکان دا لەبەر دەرگای خانووبەرەیەکی دووقات رایگرت.

ئێرە ماڵی برادەرەکەم بوو، لەجوانی کەلوپەلی ناوماڵەکەی سەرم سوڕمابوو. خواردنەوەیەکی بۆ هێنام کە ناویشم نەدەزانی. لەبرسان وەخت بوو بەلادا بێم و ئەو خواردنەوە پتریشی شپرزە کردم. بەدیوارەکەوە تابلۆیەکم دی، کاتێک لێی ورد بوومەوە دیتم شەهادەی کۆلێجی حقوقە. هێندەی دیکە سەرم سوڕما. لەدڵی خۆم دا گوتم "نەجدەت پارەکە لەناوەندی دەرکرا، چۆن ئەمساڵ زانستگای تەواو کرد؟".

نەجدەت کە دیار بوو تێم گەیشتبوو بەفیزێکەوە گوتی:

ـ دیوتە! ئەوە شەهادەکەمە؟

ـ باشە چۆن بەساڵێك زانستگات تەواو کرد؟

نەجدەت بەگاڵتەوە پێم پێکەنی و گوتی:

ـ بەیانی شەهادەیەکی ئامادەییش بۆ تۆ وەردەگرم!!!

هەروەك بیهەوی پیاڵە ماستێك لەدوکاندار بکڕێ، وابوو. لەگەڵ ئەوەی هەر لەو ژوورەدا نموونەکەی لەبەر چاوم بوو، دیسان نەم دەتوانی باوەڕبکەم کە راست دەکا. ئەو شەوە نەجدەت لەگەڵ خۆی بردمی بۆ گەڕان، بەلێشاو پارەی خەرج دەکرد. بەتایبەتی دەیەویست دەوڵەمەندی خۆی بەمن نیشان بدا.

تا ئەو شەوە من نەچووبوومە ئەو جۆرە جێگایانەو ئەو ژنە ناسك و نازدارانەم نەدیبوون.

ئەوەندەی ئاگام بەخۆم بوو پێنج شەش "بار"مان پشکنی. دوایەش کە ئاگام لەخۆم بڕابوو، بردبوومیە هوتێلێك وخەواندبوومی.

بەیانی کە لە خەو هەستام زۆرم پێسەیر بوو. پاش چەند مانگ ئەمە یەکەم جارم بوو لەسەر دۆشەك بنووم. هێندە گێژو کاس بووم، بۆم نەدەچۆوە سەریەك لەکوێم و لەچ حاڵ دام. چەند دەقیقەیەك خۆشحاڵ بووم. دووسێجار

خۆم خاوکێش کردو لەنەکاوێك وشیار بوومەوە. تێك ڕابووم و لە جێگاکە دەرپەڕیم: "ئێرە کوێیە".

کە سەرنجم دایە دەوروپشتی خۆم هوتێلێکی دەرجە یەك بوو. بەرە بەرە هاتەوە بیرم کە دوێنێ شەو لەگەڵ نەجدەت بووم و دیارە پاش ئەوەی تێك چووم هێناومیە ئێرە: "بەڵام فکری کرێیەکەی چیە؟". هەمووخۆشی و رابواردنەکەی دوێ شەوێم لەبیر چۆوە: "ئێستا تەگبیرم چیە؟". بە سەرگەردانی و پەرێشانی وەك داوەڵی سەر خەرمان لەسەر جێگاکەم دانیشتبووم لە دەرگایان دا.

بەجارێك بەندی جەرگ و دڵانم پساو خۆم بۆ مل بەملە لەگەڵ خاوەن هوتێل ئامادە کرد. کەچی نەجدەت بوو، بەخۆشحاڵی و پێکەنینەوە هاتە ژوورو هاواری کرد:

ـ هێشتا هەر خەوتووی؟

ـ چما سەعات چەندە؟

ـ نیزیك نیوەڕۆیە، هەستە زوو خۆت سازکە با بڕۆین. کاتێك لە هوتێل دەرکەوتین نەجدەت پرسی:

ـ دوو وێنەی چکۆڵەی خۆت پێ هەیە؟!

ـ بۆچیتن؟

ـ شەهادەکەت سازە، هەر وێنە لێدانی ماوە.

ـ نەوەڵڵا وێنەم پێ نیە.

لە کۆڵانێك خێرا چەند وێنەیەکمان گرت و چووینەوە ماڵی نەجدەت.

شەهادەکەم ئامادە بوو، لەبەر چاوی خۆم خێرا وێنەکەی لێداو مۆرێکی پێوەناو ئیمزای کرد:

ـ فەرموو، ئەم شەهادەیە هەموو گرێ کوێرەیەك دەكاتەوە. ئێستا هەموو دەرگایەك بۆتۆ كراوەتەوە. تا ئێرە ئەركی من بوو، بەڵام لێرە بەدواوە دەبێ بۆخۆت بجووڵێیەوە !

ـ زور سوپاس نەجدەت! ئەو زەحمەتەی نەدەویست. نەجدەت قاقایەكی كێشا:

ـ نەكا بە شەهادەی ئامادەیی رازی نەبی و داوای شەهادەی كوللیەم لێبكەی؟

ـ نا، شتی وا نیە، راستیەكەی ئەوەیە لەو جۆرە كارانە دەترسم. دەمەوێ بەسەربەرزی بژیم و پاروە نانێكی حەڵاڵ پەیدا بكەم. نەجدەت بە سەرسوڕمانێكەوە تێمەوە ڕاما:

ـ بەڕاستیتە دەترسی! ؟

ـ ئەرێ بەگیانی تۆ. دەمەوێ لە ژیانم دا كاری خەراپ نەكەم. شانێكی هەڵتەكاندو بەگاڵتەوە پێم پێكەنی:

ـ زۆر باشە، بۆخۆت دەزانی. ئیشەڵڵا سەر دەكەوی. ئەوەندە بەساردی قسەی دەكرد كە لە رووم نەهات نەختێك پارەی لێ قەرز بكەم:

ـ خواحافیز نەجدەت.

ـ بەخێر چی.

نەجدەت رێگایەكی بۆ دۆزیبوومەوە هەر كەسێكی دیكە بایە قبوڵی دەكرد، بەڵام من نەمویست ئەو رێگایە بگرم. دەمەویست دەرگا داخراوەكان بەهێزی شان و باهۆی خۆم بكەمەوەو بچمە پێش...

دووسێ رۆژ بێكارو سەرگەردان سووڕامەوەو لەبەرئەوەی كەس ئامادە نەبوو كارم بداتێ بڕیارم دا حەمباڵی بكەم. ئەم كارە نە دەسمایەی دەویست و نە كەرەستەیەكیشی پێویست بوو. جانتاو باری موسافیرەكانم لە لەنگەرەوە دەبردە ناو كەشتی و بارەكانم دادەبەزاندو پارەی شێوو نیوەرۆیەكەم پەیدا

دەکرد. بەداخەوە زوو ئەو ڕێگایەشم لێبەسترا. حەمباڵەکان لێم وەخۆ کەوتن و نەیانهێشت حەمباڵی بکەم.

دووسێ ڕۆژ شەڕە چەقەم لەگەڵ کردن، دیتم سوودی نیە. لەم وڵاتەدا حەمباڵییش پێویستی بە واسیتە هەیەو بەبێ ئیجازە حەمباڵی کردن قەدەخەیە ! !

ئێوارەی ئەو ڕۆژە کە زۆر بەنارەحەتی لە تەنیشت لەنگەرگاکە ڕاوەستا بووم و بیرم لە دوارۆژی تاریکی خۆم دەکردەوە، چاوم بەلاپەڕەی ڕۆژنامەیەك کەوت، هەڵم گرت و خوێندمەوە. لەلاپەڕەی (اعلانات)دا نوسرابوو فلآنە بانك پێویستی بە چەند مووچەخۆر هەیە. ویستم بچم و ئیمتیحان بدەم بەڵام جلکی باشم نەبوو و بەو سەرو سیمایەشەوە کەس وەری نەدەگرتم. چوومە ماڵی نەجدەت گوتم: "دەستێکم جلك بە ئەمانەت بدەیە دەچم ئیمتیحان دەدەم".

نەجدەت دیسان پێم پیکەنی. نەڕاندم:

ـ بەچی پێدەکەنی؟

ـ بەساویلکەیی تۆ!

ـ بۆچی؟ چ بووە؟ ئیمتیحان دان ساویلکەیی نیە ! !

ـ ئەوانەی وەك تۆ بیردەکەنەوە نەك هەر ساویلکە، شێتیشن. کاکە گیان! لەو ئیمتیحانانە دا کەس قبوڵ نابێ. هەموویان لەپێشدا دیاری کراون.

ـ ئەی بۆچی لە ڕۆژنامە دا بڵاویان کردۆتەوە؟

ـ چاوەکەم، ئەوە هەمووی چاوبەستنە. بەخۆڕایی خۆت ماندوو مەکە. پێم وابوو بۆیە وا دەڵێ کە جلکەکانم وێنەدا. گوتم:

ـ قەیدی نیە. خوا حافیز. ویستم وەدەرکەوم بانگی کردم:

ـ بۆ کوێ؟ وەرە هەر جلکێکی دەتەوێ بیبەو تاقی بکەوە، بزانە من ڕاست دەکەم یان تۆ.

شەش دەست جلکی لە کەنتۆرەکەی دا بوون یەك لەیەك باشتر. دەتگوت هەموویانی دوێنێ لە بەرگدروو وەرگرتۆتەوە.

دەستێکم کردە بەرو چوومە بانك. لە رۆژی ئیمتیحان و شەرتەکانی بەشداربوونم پرسیارکرد. بۆم دەرکەوت پاش دە رۆژی دیکە ئیمتیحانە. بەراستی چاکەی نەجدەتم لەبیر ناچێ. ئەو دە رۆژە بەخەرجی ئەو لە هوتێلێکی باش مامەوە، شەوو رۆژ خەریك بووم. ئەگەر لە قوتابخانە وەك ئەو دە رۆژە خەریك بام ساڵێ دووپۆلم دەبڕی.

رۆژی ئیمتیحان ئەوەندە خەریك ببووم وەك گێژم لێهاتبوو. بۆخۆشم نەمزانی چیم لە وەرەقەی ئیمتیحان نووسی. شەوێ نەجدەت لێی پرسیم:

- ئیمتیحانەکە چۆن بوو؟

- پێم وایە خەراپ نەبوو.

پاش پازدە رۆژ لەگەڵ نەجدەت چووین بۆ وەرگرتنەوەی ئەنجامەکان. ئەو فەرمانبەرەی نەتیجەکەی دەدانەوە هەر کە چاوی پێم کەوت. گوتی:

- کاکە زۆر بە داخەوە.

هێندەی نەمابوو بگریم. دەتگوت خانووەکەم بەسەردا رووخاوە. گریان بەری قورگی گرتم. نەجدەت چاوێکی لێداگرتم: "با برۆینە دەرێ". لە دالانەکە دا گوتی:

- لێرە راوەستە هەتا دێمەوە.

پاش چارەکە سەعاتێك بەپێکەنینەوە هاتەوە گوتی:

- پیرۆزباییت لێدەکەم، لە ئیمتیحان دەرچووی. گێژو وێژ بووم. لەپێشدا پێم وابوو گاڵتەم پێدەکا، بەڵام راستی دەکرد.

لە سەدکەس تەنیا حەوت کەس دەرچووبوون کە من حەوتەمیان بووم. بەڵام چۆن بوو ناوی من کەوتە ناو لیستەی دەرچووەکانەوە جارێ ئەوەم نەدەزانی.

هەفتەیەك دواتر بەپارەی ئەودەم مانگی بە١٨٠ لیرە لە بانك دامەزرام. ئەوەندە بە دڵگەرمیەوە كارم دەكرد كە لە ماوەیەكی كەمدا سەرنجی هەموو سەرۆكانی بانكم بۆلای خۆم راكێشا. ئێستا ساڵێكم تەواو نەكردبوو. بووم بە سەرۆكی یەكێك لە دایرەكانی بانك.

لە سەرۆكی گشتیەوە بگرە تا یارمەتی دەرو بەرێوەبەری گشتی هەموویان دەیان ناسیم و خۆشیان دەویستم، بەتایبەتی جێگری ژمێریاری گشتی كە پیاوێكی پیرو بەویقار بوو، زۆر لەوانی دیكەی زیاتر روو دەدامێ و دووسێ جاریش بۆ نان خواردن بانگهێشتنی كردم بۆ ماڵی خۆیان.

وام هەست دەكرد زۆری پێ خۆشە بمكا بەزاوای خۆی. دووكچی قەیرەی هەبوون. رۆژێكیان كە چووبوومە ماڵیان رووی تێ كردم و گوتی:

ـ فەرید مزگێنیت لێ بێ، نیازیان هەیە لەلایەن بانكەوە بتنێرن بۆ ئەوروپا.

لە خۆشیان وەخت بوو گەشكەبم. ئاواتم ئەوەبوو نەجدەت لێرەبایەو ئەنجامی كارو تێكۆشان و راستی و دروستی بۆ دەركەتبایە. هەتا ئەورۆژە لەگەڵ یەكێك لە كچەكانی جێگری ژمێریاری گشتی زۆرم نێوان خۆش بوو. هەموو كەس پێی وابوو بەو زووانە دەبینە دەزگیران و زەماوەند دەكەین.

بەڵام كاتێك خەبەری چوونی ئورووپام بیست و زانیم دەبێ ساڵ و نیوێك لەوێ دەورەی تایبەتی بانكداری ببینم، بەجارێك ئەوینی كچی جێگری ژمێریاری گشتیم لەسەر چووە دەرو هەوای ناسك و نازەنینەكانی ئەوروپا لەسەر دام.

شەوو رۆژ خەونم بەئەورووپاوە دەدی و هەمیشە لەخەوو بێداری دا لەگەڵ كچەكانی ئەوێ سرتە و خەڵوەم دەكرد. بۆیە چەند رۆژێك نەچوومە ماڵی جەنابی جێگرو تەنانەت دووسێجاریش بانگهێشتی كردم داوای لێبوردنم كرد.

هەمیشە خەریکی رێك وپێك کردنی کارەکانم و ئامادەکردنی کەل و پەلی سەفەر بووم. دوای هەفتەیەك بەرێوەبەری گشتی بانگی کردمە ژوورەکەی خۆی و گوتی:

ـ دەمەوێ لە یەکێك لە قەزاکان دا لقێکی تازە بکەمەوەو بۆ ژمێریاری ئەو لقەش کەسی لەتۆ باشترمان نیە.

دووکەڵ لە کەللەسەرم هاتەدەر. ئەمن بارگەوبنەم بۆ ئەوروپا تێك نابوو، ئێستا چۆن بچمە قەزایەکی چکۆڵە. سەرۆکی بانك کە ناڕەحەتی منی بۆ دەرکەوتبوو گوتی:

ـ زۆر لەوێ نامێنیەوە. حەوت هەشت مانگ کارکردنی ئەوێ تاقیکردنەوەت زیاتر دەکاو پاشان دەچیە ئەوروپا. دوو رۆژ دواتر کەوتمە رێ. لەو شارە بچووکەدا هیچ شوێنی حەسانەوەو گوزەراندن نەبوو. سەرۆکی ئیدارەکانی ئەو شارە هەموویان مووچەخۆری بچووکی وەزارەتەکان بوون کە تەنیا دڵیان بەناوی سەرۆکایەتی خۆش بوو و لەو بوودجەی لە دەستیشیان دابوو چاپو گووپێکیان دەکرد. بەڵام بۆ من کە ئەهلی دزی و بەرتیل و شتی وا نەبووم مانەوەی ئەوێ لە جەهەندەمیش خەراپتر بوو.

لەوێ لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپا بوومە ئاشنا. کوڕێکی خەراپ نەبوو. بەشی زۆری پێکەوە تاوڵەمان دادەناو یاریمان دەکرد، یا باس و وتووێژمان بوو. شەوێك پاش نان خواردن گوتی:

ـ من ئەمشەو بۆ جێگایەك بانگ کراوم. باش نیە بە بەرگی ئەفسەرییەوە بچم. جلکەکانی خۆتم بدەیە.

ـ بەسەر چاو، بایەخی چیە؟

هاتە ژوورێ جلکەکانمی لەبەر کردو رۆیشت. بەیانی زوو لەخەو هەڵستام و سەیرێکی ژوورەکەیم کرد دیتم هێشتا نەهاتۆتەوە، سەعات بوو بە نۆ،

نەهاتەوە. بوو بە دە نەهاتەوە... بەرە بەرە نارەحەت دەبووم. وەختی ئیدارە درەنگ ببوو منی چارەڕەشیش وەك (رۆستەم) تـەنیا دەسـتێك چـەكم هـەبوو. نەمدەزانی تەگبیرم چیە.

هیچ چارەم نەبوو جگە لەوەی لـە قـوژبنێکی هۆدەکـەم دانیشـتم و چـاو ببڕمـە دەرگاکە. سەعات یازدە فەرمانبەرێکی بانك بەدوام دا هات گوتم:

"بڵێ نەخۆشە".

شـەوو رۆژی دواتـریش ئـەو دۆسـتەم سـۆراغی نـەبوو. بـۆ بـەیانی بڕیـارم دا جلکەکانی ئەو لەبەر بکەم و وەدەرکەوم. چوومە بانك دیتم هـەر ئـەو رۆژە کـە نەچوومە ئیدارە راپۆرتیان داوە بە ئەستەمبووڵ.

هێشتا چەند دەقیقە بوو گەیشتبوومە بانك کە برووسکەیەك لە ئەستەمبووڵەوە هات داوا کرابوو دەسبەجێ بگەمە ئەوێ.

نەم دەتوانی بەبەرگی ئەفسەرییەوە بڕۆم، دەستووری ئیدارەش نەدەکرا وەدوا بخـەم. گـوتم: "کاتێـك لـە قـەتار دابـەزیم دەسـبەجێ دەسـتێك جلـك دەکڕم"بێخەبەر لەوەی بەدبەختییەکی تازە چاوەڕێمە.

لەقەتاردا لەگەڵ ژنێك بوومە ناسیاو کە لە جوانی دا هاوتـای نـەبوو. جێگاکـەی لەسەر کورسییەکەی بەرامبەری من بوو.

هەر لەو کاتەوە کە چوومە ژوور چاوی لـێنەتروکاندم. زۆرم هەوڵ دا تەماشای نەکەم... بەتایبەتی سەرم لە پەنجەرەکە دەبردە دەرێ و تەماشای دیمەنەکانی دەورووبەرم دەکرد. ژنەکە لێی پرسیم:

ـ تۆ ئەفسەری سوپای؟

منیش خۆ نەم دەتوانی راستی مەسەلەکەی پێبڵێم. بەچاوی کوێرییەوە دەیـدی بەرگی ئەفسەریم لەبەردایە، کەچی نەخۆشیی بوو دەیەویست قسەیەك لە زمانی من ببیستێ. بەناچاری بێئەوەی درێژە بە باسەکە بدەم گوتم:

ـ بەڵێ.

خودا کوێری کا، ئەگەر ئەو پرسیاری نەکردباو ئەو زمانە سەگباب خێوەی منیش هێندە "هەرزەوەڕ" نەبوایە ئێستا فەرمانبەرێکی پایەبەرزو ئەورووپا دیتووی بانك بووم.

خاتوون کۆڵی نەدەداو پەیتا پەیتا پرسیاری لێدەکردم. بەهەزار سوێندو قورعان دەیەویست ئیسبات بکا کە حەز لەئەفسەران و لە جل وبەرگی ئەفسەری دەکا.

ئەوەندەی لەسەر رۆیشت کە بەسەر تەڵەی پەڕاندم. هەتا ئەستەمبوول وەك دوودۆستی چەند ساڵە خەریکی قسەوباس بووین و بەکەیف و ئاهەنگ رامان بوارد.

کاتێك گەیشتینە ئەستەمبووڵ دنیا تاریك ببوو، منیش نەدەکرا بچمە بانك و ناچار بووم تا بەیانی ڕاوەستم. "ژنە"بانگ هێشتنی کردم بۆماڵی خۆیان. ئەوە بۆمن دەرفەتێکی باش بوو، ئەگەر نەچووبام لەوانەبوو دوایە نەیدۆزمەوە.

چوومە ماڵەکەی. هەروەك لەقەتارێدا باسی کردبوو بێوەژن بوو.

مێردەکەی دووساڵ پێشتر عومری درێژی بۆ ئێوە بەجێهێشتبوو.

ئەمە یەکەم ژن بوو کە من لەگەڵی ببوومە ئاشنا. ئەوەندەم لەزەت لێدیبوو کە قەرارمان دانا چەند رۆژێکی دیکە زەماوەند بکەین ئەو ڕابواردنە کاتییەی ئەو شەوە بکەینە هەمیشەیی!

بەو خەیاڵە شیرنەوە نووستم. لەخەوم دا دەچوومە مانگی عەسەل کە بەدەنگێکی سەیر خەبەرم بۆوە.

ژوورەکە تاریك و تنۆك بوو. شۆقێك هەڵ بوو و کوژایەوەو دەنگی دەمانچەیەك هات و ئیتر ئاگام لەهیچ نەما. کاتێك چاوم هەڵێنا لە نەخۆشخانە بووم، ئەویش نەخۆشخانەی سوپا!

هەڵبەت پێیان وابووە ئەفسەرم و هێنابوویانمە نەخۆشخانەی عەسکەری. شانی چەپم بریندار بوو زۆریش دەیەشا. وەك سیستەرەکان بۆیان باس کردم دوو ڕۆژ بوو بێهۆش بووم. بەڵام بۆبریندار بووم و چ قەومابوو نەمدەزانی. لەکەسێك دەگەڕام ئەسڵی مەسەلەکەم بۆباس بکا.

ڕۆژی سێهەم کە وەهۆش خۆم هاتمەوە تەحقیقات لەمن دەست پێکرا:

ـ لە چ بەشێك دا خزمەت دەکەی؟! نەمدەزانی چ جواب بدەمەوە. سەرۆکی نەخۆشخانە پرسیارەکەی دووپاتە کردەوە:

ـ لەچ بەشێکی سوپا دای؟

ـ بڵێم چی؟ من؟ من؟

ئاخرەکەی تێ گەیشتن ئەفسەر نیم. دەسبەجێ گرتیانم و لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانەڕا تەسلیمی گرتووخانەیان کردم.

فایلێکی ئەستوور دروست بوو و چەند تاوانی گەورەیان دایە پاڵ من "کەلك وەرگرتن لە بەرگی ئەفسەری!! دەرچوون لە قانوونەکانی وڵات! دەستدرێژی بۆ نامووسی خەلك! کەلك وەرگرتن لە شەهادەی ساختە!! و هەڵبەستنی ئیمزای پیاوە گەورەکان."

زۆر درەنگ هەموو ڕاستییەکانم بۆ دەرکەوت بەڵام تازە سوودی چ بوو؟

ئەمن لەئیمتیحانی بانك قبووڵ نەببووم، نەجەدەت بەهۆی کارتی پیاوێکی گەورەو بەناوبانگەوە کە هەمیشە چوارپێنجێکی لەگیرفانی دا بوون کارەکەمی جوور کردبوو و شەهادەیەکی ساختەشی بەناوی منەوە دروست کردبوو و دابوویە بانك.

ئەو ژنەش کە ئەو هەموو بەلایەی بەسەر من هێنا، پووری کچی جەنابی جێگری ژمێریاری بانك بوو کە لەسەر ئەوەی لەهێنانی برازایەکەی پەشیمان ببوومەوە بەو جۆرە تەمبێی کردم.

تەواوی ئەو شتانە دوای ئەو شەوە ئاشکرا بوون و بوونە هۆی ڕووخانی من. مەحکووم بوونی من هەر لەسەرەتاوە ڕوون بوو، بە گەورەترین سزا مەحکووم کرام و بەندکرانەکەم قەتعی بوو.

یەکەم جار کەپیاو دەگیرێ زۆر دەترسێ! بەڵام پاش چەند ڕۆژو هەفتە خوو بە بەندیخانەوە دەگرێ. ئەو چوونە بەندیخانە بۆمنیش بوو بەدەرسێکی گەورە. زۆر شت فێربووم کە هەتا ئەو ڕۆژە نەمدەزانی.

ڕۆژێك کە لە بەندیخانە هاتمەدەر پیاوێکی بەتەجرەبەو دنیادیتوو بووم! پێتان وا نەبێ بڕیارم دابوو بەساختەبازی و فرت و فێڵ بچمەپێش، نا، قەت نیازی وام نەبوو. دیسان هومێدم هەبوو کە بەراستی و کارکردن لەژیان دا سەردەکەوم. بەڵام دەتگوت هەموو دەرگایەکم لێداخراوەو تەنیا ئەو کونە کراوەتەوە کە منی بۆ زەلکاوی بەدبەختی و چارەڕەشی ڕاکێش دەکرد.

بۆئەوەی کەسانی وەك من تووشی ئەو ریگایە نەبن دەستەو دامێنی زۆر کەس دەبین و بەدەست وپێیانیانەوە دەنوسێین، بەڵام ئەوان لەجیاتی ئەوەی یارمەتیمان بدەن بەشەق ئێمە بەرەو ئەو رێگایە پاڵ پێوە دەنێن.

لێرەدایە کەهێندێك کەس بێئەوەی بۆخۆیان حەز بکەن تووشی هێندێك کارو ڕێگای خەراپ و ناڕەوا دەبن. ئەو ڕووداوەی بۆمن هاتە پێش یەکێك لەو بەدبەختی‌یانە بوو.

لەدەرسی (فیزیا)دا قانوونێك هەیە بەناوی ATAIET. بەپێی ئەو قانوونە هەر شتێك بۆئەوەی بەرەوپێش بجمێ دەبێ لەپێش دا نەختێك بەرەودوا بگەڕێتەوەو هەرچی بۆ پێشەوە چوونەکەشی خێراتر بێ بەرەودوا گەڕانەوەکەی زۆرترە. لەقەتاردا بەتایبەتی ئەو قانوونە جوانترو بەرچاوتر خۆی دەنوێنێ. ئێمەش هەروەخت بمانەوێ بەسەر کۆسپێکی گەورەدا باز بدەین بۆبازدانەکە دەبێ بگەڕێینەوە دواوە.

ماوەی بەندکرانی منیش راست وابوو. بۆمن کە دەمەویست تۆڵەی مەودای دواکەوتوویی ژیانی خۆم بکەمەوە ئەو بەرەودوا گەڕانەوەیە پێویست بوو.
خواش ئاگادارە بۆ بڕینی ئەو مەودا زۆرە بەهیچ جۆر نیازی کلاوسازیم نەبوو.
تەنیا دە لیرەم لە گیرفان دا بوو. بۆئەوەی ئەویش خەرج نەبێ هەرچەند برسییش بووم دڵم نەدەهات هیچ بخۆم!! هەروا بەزگی برسی و سەرێکی پڕ لە هیواو ئاواتەوە لە کۆڵانەکان دا بۆ کار دەگەڕام. نەم دەویست بچمە لای کەس داوای کار بکەم. چونکە تاقیکرنەوەیەکی تاڵم لەو کارە هەبوو. بۆیە دەمەویست هەر بەو دەلیرەیە کارێك دەست پێبکەم و داهاتێکی لێ هەڵوەرێنم.
لەو خەیاڵەدا بووم گەیشتمە بازاری ماسی فرۆشان. کاروبارەکەیان زۆر باش بوو و هەر کامە ژمارەیەکی زۆر موشتەرییان لە دەورە راوەستابوو. "بۆچی ئەمنیش ماسی نەفرۆشم. چ لەوەی باشترە!"
بەڵام زۆر زوو تێگەیشتم کە بەدەلیرە دوکانی ماسی فرۆشی دانانرێ.
"ئەدی چ بکەم. چ بکەم؟" بڕیارم دا پرتەقاڵ فرۆشی بکەم. ئەو کارە بۆمن لەبارتر بوو. بیستبووم جوولەکەیەك لەو رێگایەوە بۆتە میلیۆنێر. کابرای جوولەکە پرتەقاڵەکانی بەنرخی کڕین دەفرۆشتەوەو سندووقە دارەکەی بۆ دەمایەوەو لەبەر ئەوەی هەرزانیشی دەفرۆشتن رۆژی سی چل سندووقی دەفرۆشت و هەر سندووقە بەتاڵەی بە سێ لیرە حیساب بکەی رۆژی١٢٠لیرە داهاتی بوو.
ئەو مەسەلە هەرچەند چیرۆکە بەڵام راستییەك بەئێمە نیشان دەداو منیش بڕیارم دا پرتەقاڵەکانم بەقازانجی کەم بفرۆشم.

رۆژێکی هەتا ئێوارێ لەگەڵ چەند پرتەقاڵ فرۆش قسەم کردو رێ و شوێنەکەی باش فێربووم. تێگەیشتم دەبێ بەیانی زوو بچمە مەیدانی میوەفرۆشان بۆ ئەوەی بتوانم پرتەقاڵ بکڕم.

چونکە چ جێم نەبوون بچم و لەلایەکیش دەترسام بەیانی زوو نەگەمە مەیدانێ، بڕیارم دا شەوێ لە مەیدانێ بنووم. قوژبنێکم پەیدا کرد هێندیك پووش و پەلاشم کۆکردەوەو لەسەریان ڕاکشام. هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ ببمە میلیونێر، بەلام داخەکەم لە پێشهاتی رۆژگار بێخەبەر بووم. بەری بەیانی لەسەرمان وەخەبەر هاتم. هەراو هۆریای فرۆشیارو کڕیار تازە دەست پێکرابوو. ئەوی دوعای دەمزانی خوێندم و فووم لەخۆم کردو لەجێگا، ببوورن لەناو پووش و پەلاشەکەم هاتمەدەر:

ـ خوایە بەهیوای تۆ نەك بەهیوای خەڵکی ئەو زەمانە.

ڕۆیشتم بۆلای پرتەقاڵ فرۆشەکان. لەبەردەم هەر کامێکیان چەند دەقیقە ڕادەوەستام و نرخی سندووقە پرتەقاڵەکانم دەپرسی.

نرخی هەر سندووقێك سێ تا سێ لیرەونیو بوو. هەر سندووقەی چەند پرتەقاڵی تێدا بوو، ئەمەم نەدەزانی. بەلام چونکە هەموو کەس دەیکڕی منیش سێلیرەو سی قرۆشم داو سندووقێك پرتەقاڵم وەرگرت. چووم لە قوژبنێك سندووقەکەم لەبن دیواری داناو بۆخۆشم لەتەنیشتی هەڵتروشکام...

سندووقە پرتەقاڵەکە لەبەر چاوم شتێکی زۆر بەنرخ و گرنگ بوو. ئەمە هۆیەك بوو کە بەزوویی دەرگای دەوڵەمەندبوونی بۆ کردەمەوەو لەو دڵۆپ دڵۆپانەوە بە زوویی دەبوومە خاوەنی دەریایەك پارە.

پرتەقاڵ فرۆشەکان بەپەلە سندووقەکانیان هەڵدەپچڕیو خەریکی هاوار کردن و فرۆشتن دەبوون. بەلام ئەمن وام نەکرد. دەبێ حیسابی بکەم داخۆ پرتەقاڵی

چەند دەکەوێ، پاشان بەوپێیە نرخیان لەسەر دانێم وبیان فرۆشم. زۆر لەسەرەخۆ سندووقەکەم هەڵپچڕی. هەوڵم دەدا نەوەك سندووقەکە خەرابێ.

پرتەقاڵەکانم ژمارد سەدوشەست وهەشت دانە بوون و ئەمنیش سێسەدو سی قرۆشم پێدابوون. دەسبەجێ دەفتەرو قەڵەمم لە گیرفانم دەرهێناو دەستم کرد بەحیساب. هەر پرتەقاڵەی دوو قرۆش شتێك کەمتر کەوتبوو. ئەگەر دانەی بە دووقرۆشم دابایە کەمێك قازانجی دەکردو سندوقە بەتاڵەکەشم بۆ دەمایەوە.

ئەوەم دەزانی کە کاسبکارو بازرگان وەختێك پێش دەکەوێ کە حیساب و کیتابی راست بێ، منیش ئێستا دەمتوانی لە پاشەرۆژی کاری خۆم دڵنیابم.

سندووقەکەم لەسەرشانم داناو هاتم بۆلای بازاڕی ماسی فرۆشان. زۆرم برسی بوو. ویستم کەمێك نانی وشك بکڕم و بیخۆم بەڵام دڵم نەهات. بیستبووم کاسبکار قەت نابێ لە دەسمایەکەی بخوا. دڵخۆشی خۆمم دایەوە کە ڕاوەستم تا پرتەقاڵەکان دەفرۆشم ئەودەم لە قازانجەکەم نان بخۆم.

مەیدانی ماسی فرۆشان زۆر جەنجاڵ نەبوو. جێگایەکی لەبارم پەیدا کردو سندووقەکەم دانا. پرتەقاڵەکانم زۆر جوان لەسەر یەك دانان چاوەڕێی موشتەری بووم.

پاش تاوێك چەند فرۆشیارێکی دیکەش هاتن و هەریەکە لە سووچێك دەزگایان دامەزراند. سەرنجم دانێ بزانم ئەوان پرتەقاڵەکانیان بەچەند دەفرۆشن. دیتم هەموویان هاوار دەکەن جووتی پێنج قرۆش. چوومە لای یەکێکیان لێم پرسی:

ـ سندووقی بەچەندت کڕیوە؟

ـ دوولیرە و نیو.

لەمنی هەرزانتر کڕیبوو. بەڵام پرتەقاڵەکانی من چاکترو گەورەتر بوون. لێم پرسی:

ـ سندووقەکەت چەند پرتەقاڵی تێدابوو؟

ـ نازانم دووسەد سێسەدێك دەبێ!

لەهەمووپڕتەقاڵ فرۆشەکانم پرسی هەموویان وایان گوت. پێم سەیربوو:

ـ باشە چۆنتان حیساب کردوە کە جووتی بە پێنج قرۆش دەدەن؟

ـ نرخەکەی دیارە.

بۆم دەرکەوت بۆچی هێندێك کەس لەهیچەوە دەست پێدەکەن دەبنە میلیۆنێر. رۆژی هەزاران کەس دەست بەکاسبی بازرگانی دەکەن، ئەدی بۆ هەریەکێکیان دەبێتە میلیۆنێر و ئەوانی تر لەناو دەچن!؟

هۆی ئەوەیە کە ئەوان حیساب و کیتاب نازانن، دەنا هەموو ئەو پڕتەقاڵ فرۆشانە دەبوو ببنە میلۆنێر!

بەباوەڕێکی پتەو بەسەر کەوتنەوە هاوارم کرد:

ـ ئای یەکی دووقرۆش پڕتەقاڵی باش. وەرە تەماشای بکە! دووسێیەك لەپڕتەقاڵ فرۆشەکان ئاوڕیان دایەوەو دەستیان بەسرتەو خەڵوەکرد:

ـ ئەوە کێیە ئەمڕۆ لێرە پەیدا بووە؟

ـ قەڵافەتی ببینە دەڵێی لولێنەیە. ئەوان سێچوارێك پێکەوە دەستیان بە هاوارهاوار کرد:

ـ پڕتەقاڵی باش جووتی پێنج قرۆش. ئەمن توندتر هاوارم کرد:

ـ وەرە ئێرە هەرزانم کرد پڕتەقاڵی گەورە دانەی دووقرۆش.

موشتەرییەکان بەدەنگی من ڕا تەماشایەکی پڕتەقاڵەکانیان دەکردودەڕۆیشتن بۆلای ئەوان و سەودایان دەبوو.

"یانی چی، بۆچی ئەو خەڵکە وایە. خۆ پڕتەقاڵەکانی من گەورەترن، هەرزانتریشیان دەدەم. ئەدی بۆ کەس لێم ناکڕێ و هەموو دەچنە لای ئەوان؟"

هەرچی دەمکرد بۆم نەدەچۆوە سەریەك. ژنێك ئەو مەتەڵەی بۆ هەڵێنام. پاش ئەوەی هەموو پرتەقاڵەکانی هەڵگووشی وئیمتیحانی کردن و گوتی:

ـ دیارە ئەوانە سەرما هەنگاوتوونی و خەراپ بوون بۆیە هەرزانیان دەفرۆشی.

ـ ببورە خاتوون وەڵڵا هیچ عەیبیان نیە، بڕوانە لە هی ئەوانە گەورەتریشن و هەرزانتریشن. بەڵام خاتوون نەچووە ژێربار. رۆیشتە لای ئەوان پرتەقاڵی خۆی کڕی. منیش لەداخان و بۆ ئەوەی تانووتێك لەو ژنە بدەم بەقەو هاوارم کرد:

ـ پارەی حەڵاڵیان دەوێ ئەو پرتەقاڵانە.

لەولاوە یەکێك لە ماسی فرۆشەکان هاواری کرد:

ـ لەسەرخۆ کوڕی باش ئەو نەڕە نەڕەت لەچیە. مێشکی سەرت بردین. کە ئاوڕم دایەوە دەبینم کابرایەکە چاوی سوور هەڵگەڕاون و سمێڵی لەبنانگوێیان گرێ داونەوە.

لەترسان گوتم "بەچاوان".

پاشان کەوتمە بیرو بەرژەوەندەوە. هێندێك کار لەپێش چاوی پیاوی زۆر هاسانن، بەڵام کە دەچێتە ناویانەوە دەبینی نەخەیر هێندەش هاسان نین. هەموو کارێك ڕێ و شوێنی خۆی هەیە، دەبینێ چایچیەتی کارێکی بەداهاتەو پێی وایە چایخانەدانانیش کارێکی ساکارە بەڵام... نەخەیر.

سێبەرێك لەبەر دەمم ڕاوەستاو کەم کەم خۆی لێ سووروشین هەڵگێرام و هەودای خەیاڵەکەمی ئاڵۆزکرد:

ـ کوڕە بە ئیجازەی کێ لێرە دوکانت داناوە؟

لەپێش دا کەمێك سەیرم کرد، ویستم بڵێم "جابە تۆ چی؟ ئەتۆ چ کارەی؟" بەڵام کابرا مۆڵەتی نەدام. قۆڵی گرتم و بە یەك تەکان فڕێی دامە ناوەندی بازاڕ:

ـ مەگەر ئێرە تەویلەیە هەرکەس لە دایکی زویر بوو دێ سندووقێك پرتەقاڵ دەکڕێ و لەبەردەمی خەڵك (دوکان) دادەنێ...؟

لەپاشان ڕووی لە دووسێ فەرمانبەرو خۆڵ ماڵ کرد کە بەدوایەوە بوون و زۆر بە سیمایەکی سەرۆکانەوە گوتی:

ـ زوو ئەم پەتیارەی بەرنە شارەوانی سزای بدەن!

تازە تێگەیشتم کە جەنابی فەرمانبەری شارەوانی‌یە. هەتا ئەوێ ڕۆژێ سەروکارم نەکەوتبۆ شارەوانی، بەلام ئەو هەموو چیرۆکە سەیروسەمەرەی بیستبووم بەس بوو بۆ ئەوەی بەجارێك زراوم بچێ.

کەوتمە پاڕانەوە:

جەناب بیکە بەخاتری خوا بەرەلام بکە. سەهووم کرد، (...)م خوارد. جارێکی تر کاری وا ناکەم.

ـ قسەی خۆڕایی مەکە. قانون ڕێگا نادا. خۆ قانون کەشك نیە:

ـ جەناب وەڵلا ئەوە یەکەم ڕۆژمە. نەمدەزانی.

ـ با جەزات لێ بستێنن دەبیە وەستا.

یەکێك لە فەرمانبەرەکان کە لەپشتەوە راوەستابوو بەزەیی پێم دا هات. بەچاو حاڵی کردم کە شتێك بدەم و گیانی خۆم دەرباز بکەم.

تازە تێدەگەیشتم ئەو هەویرە چەند ئاو هەڵدەگرێ. بەڕاستی ئەمنیش زەلامێکی گێژو حۆلم، هەردەسبەجێ دەستم لەگیرفانم ناو زۆر بەدڵ فرەوانی لیرەیەکم دەرهێناو لەدەستی جەنابی پشکنەری شارەوانیم کرد. بەوجۆرە قانوون تەواو بوو و منیش ئیجازەم درا خەریکی کاری خۆم بم.

ئەمجارە تێ گەیشتم بۆچی نرخی پرتەقاڵ جووتی پێنج قرۆشە. ئەمنیش ناچار بووم ئەو لیرە شیرنیەش بخەمە سەر مایەی پرتەقاڵەکان و جووتی بەپێنج قرۆشیان بدەم.

بۆیە ناچار بووم پتر تێبکۆشم تا ئەو پارەیەی داومە تێی هەڵێنمەوە. بەهەموو قەوەتی خۆم هاوارم کرد:

ـ پرتەقاڵی باشمان هەیە.

هێشتا قسەکەم تەواو نەبیوو و زارم پێکەوە نەنابۆوە کەیەکێك لەپرتەقاڵ فرۆشەکان وەك بەوری بۆران پەلاماری دام و مستێکی لە چەنەگەی دام و وەك تۆپی لاستیك بەدیوارەکەی دا دام و ئیتر ئاگام لە هیچ نەما.

بۆسبەێنی ڕا لە نەخۆشخانە چاوم هەڵێنا. لەتەواوی دارایییەکەم شەش تەقەڵی سەر ڕوومەتم بۆ مابۆوە.

تەنانەت چاکەت و پانتوڵێکی ڕزیوم هەبوون ئەوانیشیان بردبوو. ئێستاش نەمزانی کابرا کێبوو، چیان لێکردو سندووقە پرتەقاڵەکەم کێبردی؟

بەکورتی، پاش هەفتەیەك لە نەخۆشخانە دەریان کردم و دەستێکیان جلکی مردەزۆ لەبەر کردم.

چاکەتەکەی بۆ من زۆر تەنگ بوو بەڵام پانتۆڵەکەی ئەوەندەی بڵێی درێژ بوو، گۆیا ڕەحمەتییەکەی خاوەنی پیاوێکی کەڵەگەتی ڕەقەڵە بووەو هیچ شێوەی منی نەکردوە.

سەرلەنوێ لەسەر ساجی عەلی دانیشتم. دەست لەگونان درێژتر گەڕامەوە نێو کۆمەڵ بۆ ئەوەی کارێك پەیدا بکەم و نان و ئاوێك وەدەست بێنم. ڕەنگە پێتان سەیر بێ ئەگەر بڵێم هێشتا ورەم بەرز بوو.

هێشتا هەر دڵنیا بووم کە ڕۆژێك سەردەکەوم! و هێشتا هەر دەمەویست بەراستی و دروستی و داوێن پاکی کار بکەم و بچمە پێش.

هەروا بەبێ ئامانج لە شەقامەکان دا دەگەڕام. لەپشت جامخانەی دوکانی قوماش فرۆشێك چاوم بە کاغەزێك کەوت نووسرابوو "منداڵێکمان پێویستە بۆ کاروباری سەرپێیی".

چەند دەقیقەیەك لەپێش دوکانەکە ڕاوەستام. لەلایەك دەمگوت بابچم بڵێم هاتووم کارتان بۆ بکەم، لەلایەکیش لاقم لەدووا نەدەهاتن.

لەدڵی خۆم دا دەمگوت:

"گەوجە ئەوانە منداڵیان دەوێ نەك زرتە زەلامێکی وەك تۆ".

ئاخرەکەی بڕیارم دا بچمە ژوورێ. لەپشتی جامخانەکەوە چوارپێنج کەس ژن و پیاو شتوومەکیان دەفرۆشت و کاروباری موشتەرییەکانیان ڕادەپەڕاند. کەچاویان بە من کەوت وایان زانی موشتەریم گوتیان:

ـ فەرموو. یەکێکیان بۆلام هات و فەرمووی کردم. گوتم "کارم بە ئاغایە".

پیاوێکی پیریان پێنیشان دام کە لە نێوەڕاستی کۆگاکەدا لەپشت مێزێك دانیشبوو خەریکی ڕۆژنامەخوێندنەوە بوو چوومە لای و گوتم:

ـ ببوورە. وابزانم ئێوە پێویستیتان بە شاگردێك هەیە؟

ـ بەڵێ. منداڵەکەت بێنە بی بینم، دوایە قسەی لێدەکەین:

ـ منداڵێك لەگۆڕێدا نیە بۆخۆم دەمەوێ ببمە شاگرد.

خاوەن کۆگاو فرۆشیارەکان پێم پێکەنین و ئاغا گوتی:

ـ ئێمە لە منداڵێك دەگەڕێین.

منیش وەك پاڵەوانێکی سەرکەوتوو کە لە مەیدانی شەڕدا قسەبکا وەڵامم دایەوە:

ـ هەرچی بێ من زۆر لەمنداڵێك باشتر دەتوانم كار بكەم. ئاغا لەپشت چاویلكەكانیەوە سەیرێكی كردم و بەگاڵتە پێكردنێكەوە گوتی:

ـ ئاخر ئێمە هەفتەی حەوت لیرە دەدەین بە منداڵ تۆ بەو پارە چیت بۆ دەكرێ؟

ـ بەسمە!

ـ زۆر باشە برۆ دەست بەكاربە.

لەگەڵ دەستم بەو كارە كرد دیسان مەسەلەی میلیونێرەكانم هاتەوە بەرچاو. لەباسی یەكێكیان دا خوێندبووومەوە كە وەختێك بۆ كار پەیدا كردن دەچێتە كارخانەیەك، كاری نادەنێ.

كورەكە بە ناهومێدی لەكارخانە دێتەدەر. لەبەردەرگا چاوی بەدەرزیە سپیلكەیەك دەكەوێ دەسبەجێ دادێتەوەو هەڵی دەگرێتەوە.

خاوەنی كارخانە لەپەنجەرەوە چاوی لێدەبێ، دەسبەجێ بانگی دەكاو لەكارخانەكەی دا دای دەمەزرێنێ.

كورە گەنجەكە لەكارخانەدا بەدڵسۆزی كار دەكاو بە ماوەیەكی كورت دەبێتە بەڕێوەبەرو پاشانیش دەبێتە شەریكێكی كارخانەكە. ئەمنیش دەمەویست ئاغای تازەم تێبگەیەنم چەند پیاوێكی بەماڵداریم.

هەر هەوەڵ ڕۆژ كە خەریكی خاوێن كردنەوەی كۆگاكە بووم نەم دەزانی ئاغا لەبنەوە چاوی لێمە، قوتووێكی بەتاڵ لەوێ بوو هەڵم گرتەوەو دەگیرفانم نا.

دەمەویست ئاغا بزانێ ئەمن قوتووێكی ناقابیلیش فرێ نادەم و هەڵی دەگرم. بەڵام ئاغا كە فكرێكی خەراپی لەمن كردبۆوە بانگی كردم و بێئەوەی ڕێگا بدا زمانم بگەڕێ گوتی:

ـ ئەتۆ كە بەسەر قوتووە بەتاڵێكەوە ناچی چۆن دەكرێ باوەڕت پێ بكەین.

پاشـانیش زۆر بـەبێ حورمـەتی لـەپێش چـاوی فرۆشـیارەکان لەکۆگاکـەی وەدەرنام.

دیسان لە مەیدانی ژیان دا تاك و تەنیا مامەوە. هەموو دەرگاکانم لـێداخربوون.

تەنیا شتێك ئەمنی ڕاگرتبوو و هانی دەدام بۆپیشەوە. ئەویش هومێد بوو.

هومێدێك کەلە ڕادە دەرچوو بوو و گەیشتبۆ سنوری خەیاڵپەرستی.

بێگومـان دەزانـن هەرشـتێك لـەڕادە چـووە دەر زیـانی هەیـەو هێنـدێك جـار مەترسیشی لـێ دەکرێ.

خەیاڵپەرسـتیش لـەو نەخۆشـی‌یـە خەراپانەیـە کـە پاشـەڕۆژێکی زۆر دژواریـان هەیـە. بەشـی زۆری ئەوانـەی خەیاڵپەرسـتن یـا شـێت دەبـن یـان ئەگـەر دەمارەکانیان بەهێز بێ دەبنە کەڵەکبازو کڵاوسازێکی ترسناك.

دیارە خەیاڵپەرستەکانیش لەپێشەوە نیازێکی خـەراپیان نیـە بـەڵام بیانـەوێ و نەیانەوێ ڕێگاکەیان تووشی ئەو قوناخەیان دەکا.

مـن بۆخـۆم لەوانـە بـووم کـە پـێم وابـوو هەرکـەس بەراسـتی و دروسـتی بـژی سەردەکەوێ. ئەوکاتە لە وەزعی کارەکانی، بۆگەنی کۆمـەڵ، بنیادەمـە گـورگ پیشـەکان و هـەزاران دەردو بـەڵای دیکـە بێخەبـەر بـووم. دڵنیـا بـووم کـە ئاخرەکەی ڕۆژێك بەرهەمی ڕاستی و دروستی خۆم وەدەگرم.

هەر بۆیەش بە هەموو هـەوڵ و توانامـەوە چـوومە پـێش و لـە مـاوەی دووسـێ هەفتەدا چەند کاری جۆراجـۆرم ئـەنجام دان و سـەرنجام ڕێـم کەوتـە مەکتـەبی پارێزەرێك.

ئاغا تازەکەم پارێزەرێکی بەناوبانگ بوو. قەرارمان کرد شێوو نێـوەڕۆم لەسـەر ئەو بێ شەوانەش هەر لەوێ بنووم.

شانس لەوە باشتر نەبوو. هەر ئەوەندە شێوو نێوەڕوییەکەم دابین بوایە ئەوی تر دەمتوانی لەبەرنامەی ژیانم کەم بکەمەوە.

ڕۆژەکانی پێشدا کاری من تەنیا گەسك لێدانی ژوورەکان بوو. پاش دووهەفتە تەرەقیم کردو کاروباری شت کرینی ماڵەوەو بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خاتوونیشیان بەمن سپارد.

لە دوایەش بوومە پێشخزمەتی بەردەرکی ژوورەکەی ئاغاو ئاخرەکەی شانازی (سکرتێری)م دەست کەوت. کەم کەم ئاغا لەگەڵ خۆی دەبردمە ئێرو ئەوێ و هێندێك کاری بچووکی بەمن دەسپاردن.

جەنابی پارێزەر زۆری خۆش دەویستم و دەیگوت:

ـ ئەتۆ لەداهاتوودا دەبی بەپارێزەرێکی زۆر هەڵکەوتوو. بەبیستنی ئەو قسەیە کەیفم دەهات. ئەو دڵخۆشکردنە هانی دەدام زیاتر کار بکەم. تەواوی قانوونەکانی جەزایی و حقوقیم وەك ئاو لەبەر کردبوو.

ڕۆژێکیان کە ئاغا چووبووە دادگاو من بە تەنیا لەمەکتەب لەگەڵ یەکێك لەوەکیل گرەکان کە قاچاخچی تریاك بوو قسەم دەکرد دووکەس وەژوور کەوتن. لەبەریان هەڵستام و گوتم:

ـ فەرموون چ فەرمایشتێکتان هەیە؟

یەکێك لەوان تاوێك تەماشای سەرو گوێلاکی منی کردو پاشان لەکاتێك دا بەگاڵتە پێکردنەوە پێدەکەنی پرسی:

ـ تۆناوت (فەرید) نیە؟

ـ بەڵێ!

ـ چاکت خۆ لێرە قایم کردوە ها؟! لەقسەکانی زۆر نارەحەت بووم و گوتم:

ـ ئەتۆ چ کەسی و چیت دەوێ؟؟

- بەزوویی تێدەگەی. ئێستا هەستە وەرە با پێت بڵێم.

- بۆکوێ بێم؟!

- بۆ پۆلیسخانە!!

پۆلیسەکان وەپێش خۆیان دام. هەرچەندی گوتم "بابە ڕاوەستن تا ئاغا دێتەوە" نەیان بیست.

لە پۆلیسخانە بردیانمە ژوورێك. پیاوێکی بەساڵداچوو لەپشت مێزێك دانیشتبوو و ژنێکیش نەختێك لەولاتر لەسەر کورسی یەك دانیشتبوو. دوو پۆلیسەکان بەئەدەبەوە بە پیاوەی پشت مێزەکەیان گوت:

- هێنامان.

ئەمن دڵنیا بووم کە بەسەهوو چوون و زوو تێدەگەن! گوتم "قوربان وا دیارە لێتان گۆڕاوە"

ئەو پیاوەی لەپشت مێزەکەی بوو مستێکی لە مێزەکەی داو بەتووڕەیی و گاڵتەوە گوتی:

- بەڵێ جەنابت فریشتەی! پاشان وەرسووڕا بۆلای ژنەکەو پرسی:

- خاتوون ئەمەیە!؟

بەترس و لەرزەوە تەماشایەکی سەروچاوی هەڵامساو و چاوی سوورهەڵگەڕاوی ژنەتیوم کرد، خەریك بوو لکی دەسماڵەکەی بەددانەکانی دەجوی و زۆر بەدڵنیاییەوە گوتی "بەڵێ خۆیەتی"!

کابرای پشت مێزەکە بەتانووت و تەشەرەوە گوتی "پف ئەدی نەت دەگوت لێتان گۆڕاوە"!

- قوربان ئەمن ئێستا نازانم مەسەلە چیە. چاوەکانی هێندە لێ دەرپەڕاندم کە لەپێش چاوی من هەر ببووەو دووچاوی گەورە! پرسی:

ـ ئەوژنەی دەناسی؟ زۆر بەسەرنجەوە تەماشایەکی ژنەتیوم کرد:

ـ نەخێر نای‌ناسم!

ژنەبەجارێك وەك بەڕوو بەڕووم دا تەقیەوە لەجێگا خۆی راست بۆوە:

ـ ئەی ناپاك! ئێستا نامناسیەوە!

پاشانیش لەپرمەی گریانی داو پچرپچڕ لەسەر رۆیشت:

ـ بەچ زمانێك قسەت لەگەڵ دەکردم. چەندم بەقوربان و سەدەقە بووی هەتا هەڵت خەڵەتاندم. ئێستاش دەڵێی ناتناسم! دەتگوت هەموو هێزو تواناميان لەلەش دەرکردووم. لاقم دەستیان بەلەرزین کرد. زۆر بەزەلیلی کەوتمە پاڕانەوە:

ـ خاتوون تکات لێ‌دەکەم بوختانم پێ مەکە. من پیاوێکی خاوەن ئابڕووم. پاش ماوەیەکی زۆر دەربەدەری تازە کارێکم دەست کەوتوە. باشم تەماشا بکە تا دڵنیا بی بە هەڵە چووی.

ئاخر ئەمن کەی تۆم دیوەو کەی هەڵم خەڵەتاندووی؟

خاتوون بەشێوەیەکی ئاشق کوژانە تەماشایەکی کردم:

ـ چۆن ئاوا؟! ئەتۆ نەبووی حەیوان! چ نەفامێك هەموو رۆژێ دەهاتە ماڵەکەی من؟

ـ خاتوونی بەرێز وەڵلا، بەخودا لێت گوڕاوە.

ژنەتیو بەجۆرێك دەگریاو هەنیسکی دەدان کەمن خەریك بوو نارەحەت دەبووم. من هەر لەجێدا بنیادەمێکی دڵ نەرم بووم:

ـ خاتوون تکات لێ‌دەکەم مەگری. کار نیە خوا چاکی نەکا. تۆ مەبە هۆی ئابڕووچوونی من و بڵێ کە بە هەڵە چووی. رەنگە کابرا وەك من بچێ. خوداش پێی خۆش نیە ئە من عەیب دار بکەی.

کابرای لەپشت مێزەکە دانیشتبوو هاواری کرد:

ـ بێدەنگ بە کڵاوچی دز! پاشان ڕووی لەژنەکە کرد:

ـ کچم تۆ هەستە بچۆوە ماڵی خۆت. ئەمن خەمی ئەو سەگبابەی دەخۆم و هەموو پارەکەتی لێدەستێنمەوە.

وام سەر لێشێوابوو هەرچەندی کردم نەمتوانی قسەیەك بەژنەکە بڵێم. دەتگوت قسەکردنیشم لەبیر چۆتەوە. ژنەکە لەوکاتەدا کە لەسەر کورسی‌یەکە هەڵدەستا گوتی:

ـ (غەدیربی) بۆچی وات کرد؟

لەخۆشیان دەسبەجێ زمانم کرایەوەو هاوارم کرد:

ـ بزانە جەناب ئەو ژنە بە کەسێکی ترم تێگەیوە! ئەمن ناوم "فەرید"ەو تەنانەت هاواڵەکانم پێم دەڵێن (گێلە).

ئەو قسەم زۆر بوو بەهۆی ناڕەحەتی ئەو جەنابە، نەڕاندی:

ـ کوڕی باش ئەمن بیست وچوار ساڵە پۆلیسم ئێستا ئەتۆ دەتەوێ کڵاوم لەسەر بنێی؟

دیسان ژنەکە هاتەوە نێو قسەکان!

ـ جەنابی سەرۆك نەکا ئازاری بدەن! پاشان لەنەکاو هەردووك دەستی هاویشتە ئەستۆی من:

ـ غەدیر بۆچی بەزەییت بەمن دا نەهات. بۆچی هێلانەی ئەوین و بەختەوەری ئێمەت تێك دا؟ زاڵم ، زۆردار!

وەك پەیکەرێکی بێگیان لە ناوەڕاستی ژوورەکە راوەستابووم و نەم دەزانی وەڵامی ئەو بەڵا لەنەکاوە چ بدەمەوە. سەرۆك زەنگی لێ دا، پۆلیسێك هاتە ژوور:

ـ ئەمەی بەرنەخوارێ.

دڵم داتەپی. ئەمن لە وشەی "خوارێ" بیرەوەری تاڵم هەبوو. دەستم کرد بە پاڕانەوە: ئاغا مۆڵەتم بدەن لەگەڵ ئەو ژنە قسە بکەم و پێی بسەلمێنم بە هەڵە چووە. بەڵام کەس گوێی نەدامێ.

منیان بردە "خوارێ" بۆ گرتووخانە. لەتاریکاییەکەدا گوێم لەدەنگی چەند کەسێك بوو کە دەیانگوت "بەخێرهاتی". کاتێکی چاوم بەتاریکایی ڕاهات دیتم پڕە لە ئینسانی جۆربەجۆر. چەند کەس لە دەورەم هالابوون و هەر یەکە پرسیارێکی دەکرد:

ـ چیت کردوە؟

ـ تاوانت چیە؟

پێم وابوو ئەگەر کارەساتەکەیان بۆ باس بکەم نەجاتم دەبێ:

ـ بەخودای من بۆخۆشم نازانم چ گوناهێکم کردوە.

ـ ئەدی بۆچی هاتوویە "خوارێ"!؟

ـ ژنێك ئەمنی لەگەڵ "غەدیر"ەکەی لێگۆڕابوو، هەرچی هاوارم کرد بابە ناوی من فەریدەو لێت گۆڕاوە نەی سەلماند! کابرایەك بەرامبەر من چوارمێزیلکە دانیشتبوو مستێکی لەسنگم دا:

ـ دەتەوێ درۆ لەگەڵ ئێمەش بکەی قوماریاز!

بڕوانە ئەو بەدبەختییە، بەندییەکانیش باوەڕیان بەقسەی من نەدەکرد. دیتم قسەکردن سوودی نیە بێدەنگ بووم.

پاش دووسەعات بەدوام دا هاتن. هەناسەیەکی ئاسوودەم هەڵکێشاو بەو چوار پێنج کەسەی دەورووبەرمم گوت:

ـ دیتان ڕاست دەکەم و بێ تاوانییەکەم دەرکەوت؟

دووفەرمانبەر منیان بردە ژووری سەرۆك. لەژوورەكە دا ژنێكی تریشی لێبوو كە زۆر لە دایكم پیرتر بوو دەتگوت دێڵە مەیموونە لەوێ هەڵتووتەكاوە. هەر چاوی پێم كەوت گوتی:

ـ مەزلووم گیان! ئاخ مەزلوومی خۆشەویست بۆچی ڕوحمت بەمن نەكرد؟ بۆچی بەجێت هێشتم؟ ئەمن چ خەراپەیەكم بۆتۆ هەبوو؟

ـــ وام سەر لێشێوابوو كە دەنگم دەرنەدەهات و زارم هەڵنەدەپچڕا. وەك پەیكەرێكی بەرد لە سووچێكی ژوورەكە ڕاوەستابووم و تەماشای ئەوانەم دەكرد.

پیرێژن لەجێی خۆی هەڵستا هاتە لای من و سەری بە سنگمەوە ناو دەستی كرد بەگریان. منیش وەك كەسێك كارەبا بیگرێ تەكانێكم لەخۆم داو ژنەتیوم تووڕ هەڵدا:

ـ پووری مەزلووم كێیە...؟؟ چاو هەڵێنە لێت گۆڕاوە؟ جەنابی سەرۆكی پۆلیس كە بیست و چوار ساڵ ڕابردووی هەبوو بە گاڵتەوە گوتی:

ـ حەتمەن ئەم ژنەش هەر ناناسی. دیارە ئەمەش هەر بوختانت پێ دەكا!؟

بەناچاری هەرچی سوێندی دەمزانی خواردم:

ـ بەخودا، بەپێغەمبەر، بەئیمام بەقورعان ئەمن هیچ كامێكیان ناناسم.

پیرێژنی پیرە كەمتیار هەتا زار دەبا پڕی كرد لە تف و بەسەرو چاوانی‌دا كردم.

تەواوی سەرو چاومی لەلیكاودا خووساند:

ـ تفوو هەی درۆزنی بێشەرەف. هیچ نەبێ لەكارەكەت شەرم بكە.

ئەمن سكرتێری پارێزەرێك بووم، ئەوەش كارێكی هێندە گرنگ نەبوو كە خەڵك باسی بكا. سەرۆكی پۆلیس كە لە ڕقان سمێڵەكانی دەجوی نەڕاندی (مەلازم)!

مەزلووم شەرت بێ کارێکت پێبکەم هەتا ماوی نەتوانی بەرگی ئەفسەری لەبەر بکەیەوە! لەو قسانەی سەرۆك سەرم سوڕما. ئەوانە دەڵێن چی؟

دووبارە ناردیانمە وە "خوارێ". ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ منیان بەبیست ژن نیشان دا کە هیچیانم نەدەناسی.

یەکێك پێی دەگوتم "کازم گیان"، یەکێك دەیگوت "موزەففەری خۆم"، یەکێك تفی دەڕووان دەکوتام، یەکێك داوێنی دەگرتم و دەپاڕایەوە. ئەمنیش بێئەوەی بزانم مەسەلە چیە سەرم لێشێوابوو کە خوایە ئەوە چ بەدبەختی‌یەکە بەرۆکی گرتووم! ئێوارێ شەش حەوت وێنەگر هاتنە گرتووخانە بۆئەوەی وێنەو ریپۆرتاژ ئامادە بکەن. دەستم بەپێش چاومەوە گرت بۆئەوەی وێنەکەم دەرنەچێ، بەڵام دوو فەرمانبەر دەستیان گرتم و فەرمانبەرێکیش چەنەکەمی ڕاست ڕاگرت و یەکی دیکەش سەرمی ڕاگرت.

بەو تەشك و دیمەنەوە وێنەگرەکان خێرا خێرا دەستیان کردبە وێنەگرتنم. بۆ بەیانی بوومە یەکێك لەبەناوبانگترین لاوەکانی وڵات! تەواوی گۆڤارو ڕۆژنامەکان وێنەو ریپۆرتاژیان لە بارەی منەوە لە لاپەڕەی یەکەم دا چاپ کردبوو:

"ڕاوچی ژنان لەداو کەوت"، کوڕێکی لاو کە بەکەڵك وەرگرتن لە جل وبەرگی ئەفسەری و بەناوی وەرگێراوەوە (موستعار) ٥٤ ژن و کچی فریو دابوو دەستگیر کرا".

ئەگەر تاوانبارێکی سامناك یان چەتەیەکی گەورە گیرابایە موحاکەمەکەی چەند مانگ و بەڵکە چەند ساڵ درێژەی دەبوو! بەڵام هێشتا هەفتە تەواو نەببوو کە کۆبوونەوەی دادگای من پێك هات و منی هەژاریان بەناوی کڵاوسازێکی پیشەیی لەپشت مێزی موحاکەمە ڕاگرت.

لەدادگا ٢٤ ژن و کچ کە شکایەتیان لێکردبووم ئامادەبوون. هەمووشیان ئامادە بوون ئەگەر مارەیان بکەم واز لە دەعواکانیان بێنن.
یەکێك دەیگوت "دوگمە و دۆلابی منی فرۆشتوەو خواردوویەتی"، یەکێك دەیگوت "فریوی داوم" و یەکێك دەیگوت "کڵاوی لەسەر ناوم و پارەکەمی بردوە" و یەکێك دەیگوت "خشڵ و گوبەرۆکی منی فرۆشتوەو خواردوویەتی".
دەکەس لەوانەی شکایەتیان لێکردبووم کیژۆڵەی کەمتر لە بیست ساڵ بوون، شەشیشیان لەنێوان بیست تا چل ساڵ دا بوون، هەشت کەسیشیان لەچل بەرەژوور بوون و بۆ بەدبەختی دووسێیەکیان پەنجا شەست ساڵ دەبوون!
سەرۆکی دادگا پیاوێکی باش بوو بۆخۆشی تێگەیشتبوو من بێ تاوانم، بەڵام رابردووەکەم کە بە فایلەکەمەوە لکابوو دەست و باڵی ئەویشی شکاندبوو و لەوە زیاتر کە مەحکوومم بکا رێگایەکی نەبوو.
پارێزەرەکەم پێشنیاری کرد کە لەگەڵ شکایەتکەرەکانم زەماوەند بکەم! هەمووشیان ئامادەبوون، بەڵام من وا بەترسەوە سەیرێکی سەرۆکی دادگام کرد کە هەموو دانیشتوان لەقاقای پێکەنینیان دا. سەرۆکی دادگا تێگەیشت کەمن ئامادەم پازدە ساڵ زیندان بکێشم بەڵام خۆم تووشی ئەو بەدبەختی‌یە نەکەم!
خوا ماڵی سەرۆك دادگا ئاوەدان کا کە تەنیا دووساڵی حوکم دام.
هەموو رۆژێ چوار پێنجێکیان دەهاتنە سەردانم و دیاری‌یان بۆ دێنام، دەتگوت رقەبەری یەکتر دەکەن، وەی لەوەی زۆرترم دیاری بۆبێنێ. هەمووی هەوڵی دەدا سەرنجی من راکێشێ بۆ ئەوەی پاش بەرەڵڵابوون زەماوەندی لەگەڵ بکەم.
بەڵام ئەوە عەیبێکی هەبوو، زۆر وەخت پێکەوە بەشەڕ دەهاتن و دەستیان لە پرچی یەکتر دەنا. هێشتا نەمدەزانی ئەوانە چ فروفێڵێکیان بەدەستەوەیە.

ڕۆژێکیان کە یەکێك لە شکایەتکەرەکانم بەناوی (عطیە)هاتبۆ چاوپێکەوتنم بڕیارم دا ئەو مەسەلە ڕوون بکەمەوە...

"عطیە"چل پەنچا ساڵ دەبوو، زۆریش ئێسك گران بوو، بەڕاستی لەناحەزی دا لینگەی نەبوو، گوتم:

ـ عطیە خان تۆ ئەو خودایە ڕاست بڕۆ کەنگی من تۆم فریو داو کڵاوم لەسەر نای؟ عطیە پێکەنی:

ـ سوێندم مەدە ئەوەی کڵاوی لەسەر من ناوە تۆ نی. "کازم" ناوێك بوو سوێندی دەخوارد کە دەم هێنێ. هەرچی بووم ونەمبوو، سێهەزار لیرە پارەو دەستبەندو گوارەی زێر هەمووم وێدان. هەڵی گرتن و لێیدا ڕۆیشت. ئەمنیش شکایەتی پۆلیسم کرد. وێنەی هەمووخاوەن ڕابردووەکانیان پێ نیشان دام و چونکە وێنەکەی تۆ لە هەمووان جوانترو باشتر بوو گوتم "خۆیەتی".

ئەوەندەم ڕق هەستابوو خەریك بووم بە مستان دەم و لووتی تێك بشکێنم. بەسەرم دا نەڕاند:

ـ پیرێژنە سەگسار چ خوا هەڵدەگرێ لاوێکی بێتاوان تووشی ئەو بەدبەختی‌یە بکەی؟!

ـ یەکی دیکە منی بەدبەخت کردبوو، منیش چارەم نەبوو، دەمەویست سەرپۆشێك بۆ ئابڕووچوونەکەم پەیدا بکەم. هیوادار بووم تۆ ئامادە بی زەماوەندم لەگەڵ بکەی. لەداخان پێکەنینم هات. توخودا تەماشا، هێندێك کەس چەند گەوج و بێشەرەفن. یەکی دیکە کڵاوی لێ ڕفاندوون،کەچی هەرکەسیان بەردەست کەوێ بەرۆکی ئەو دەگرن. هاوارم کرد:

ـ بڕۆ لاچۆ لەپێش چاوم بێقیمەت. "عطیە" دەستی بەگریان و پاڕانەوە کرد:

ـ ئەوینی من ڕەت مەکەوە. دووسەد لیرەی تریشم هەیە. ئامادەم بەهەموو چەشنێك نازت بکێشم، بەو مەرجە بەڵێن بدەی پاش ئازادبوونت زەماوەندم لەگەڵ بکەی! پێکەوە ژیانێکی خۆش دروست دەکەین، منداڵمان پەیدادەبن.

ئەم هێشت قسەکەی تەواو کا قۆلم گرت و وەدەرم نا. "حسنیە"ش ڕۆژێك ئەو قسانەی کردن. لەویشم پرسی "بۆچی وات کرد" ئەویش هەر گوتی "کە وێنەکەتم دی ئاشقت بووم، عیشقی تۆ بەری چاوی گرتم و نەمزانی دەڵێم چی؟" ئەویشم هەر وەدەرنا.

"حسنیە"ش گریاو گوتی:

توخودا ئازارم مەدە. ئەمن کچم، تائێستا دەستی نێرینەم وێ نەکەوتوە. پارەیەکی زۆریشم هەیەو ئامادەم کە...

نەڕاندم:

ـ بڕۆ لاچۆ پیرەسەگ. ئیشەڵلا هەتا دەمری هەر کچ دەبی!!! لەهەمووان خۆشتر شکایەتی کچێکی جوان و خنجیلە بوو کەزۆریش ڕێك و پێك و لەبار بوو. ئەو بەستەزمانە نەکەس فریوی دابوو، نەکەس کڵاوی لەسەر نابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر مێردێکی بۆ دەداو نەکەوتبوو کاتێك باسی منی لەڕۆژنامەدا خوێندبۆوە گوتبووی وا چاکە منیش سەری خۆم لەو قاڵمە قاڵمە ڕاکەم، بەڵکوو زوێڵە چەرمێکم پێ‌ببڕێ.

تازە تێ گەیشتم کە ژنان بۆچی هێندە حەز لە بەرگی ئەفسەری دەکەن. دەستێك جلکی ئەفسەری لەبەر کۆتەرەدارێك بکەی هەرچی کچ و ژنە چاوی پێ‌بکەوێ دڵخینی بۆ دەپسێ. کاتێك حوکمەکەم تەواو کردو لە بەندیخانە هاتمەدەر سەرلەنوێ بۆپەیداکردنی کارێکی باش وەپەلەقاژە کەوتم. ئەو

ڕووداوانەی بەسەرم هاتبوون بۆ من ببوونە دەرس و هومێدم زۆر بوو کە لە ژیانم دا سەرکەوتوو بم!

بەڵام ئەو (رابردووە)نەحلەتی‌یە وەك داخ بەنێو چاوانمەوە دیار بوو ،نەی‌دەهێشت ئاسوودە بم. بۆیە بڕیارم دا لە ئەستەمبووڵ وەدەرکەوم و بچمە شارێکی بچووك و دوورەدەست، هەتا کەس نەمناسێ.

بە دوای چارەنووس دا زۆر جێگام پشکنین. لەهەموو شارێك دووسێ‌ڕۆژ دەمامەوە سەرم دەهەموو کون و قوژبنێك هەڵدەکێشا، بەڵام کار دەست نە دەکەوت. بەرەبەرە خەریك بوو ناهومێد بم. بەدوا پارەی گیرفانم سواری قەتار بووم و بێ‌ئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچم وەڕێ کەوتم. پاش ئەوەی شەوێك لە ڕێگادا بووم لە یەکێك لە ئیزگەکانی ناوەڕاستی ڕێگادا دابەزیم. شار نیزیکەی چوار پێنج کیلومیتر لە ئیزگەی قەتار دوور بوو، منیش قرۆشێکم لەگیرفان دا نەبوو، بەپێ‌یان بەرەو شار کەوتمە ڕێ. شار بەرەبەرە لەخەو هەڵدەستا. کاسبکارەکان یەك یەکە دوکانیان دەکردەوە. نەمدەزانی بچمە کوێ و چ بکەم!؟

لەبەر ماندوویی و برسیەتییش لاقم لەدوا نەدەهاتن. لەڕێگادا تووشی مزگەوتێك بووم. چوومە حەوزخانەکەی سەرو چاوم شوتن و چووم لە قوژبنێك دانیشتم و لەگژ خەیاڵان راچووم. خوایە تەگبیرم چیە. چ بکەم؟ نازانم چەند لەوێ دانیشتبووم. خەوم لێ‌کەوتبوو.

لەدنیای خەودا خەریك بوو خەونم بە پڵاوو گۆشت مریشکەوە دەدی کە لەنەکاو دیتم دنیا لەرزی، دیوارەکان و حەوزخانەکە وەك بی‌یەك کە بای بەقەوەت لێی دەدا دەلەرزین و تێك با هەڵدەدران، دەنگێکی وەك گرمەی هەورە تریشقە لەگوێم دا زرینگایەوە. لەترسان چاوم هەڵێنان دیتم یەکێك شانم ڕادەتلەکێنێ.

ـ ئۆی سلام علیکم

پیرە پیاوێکی ریش دار بوو تەمەنی پەنجا شەستساڵێك دەبوو. لەبەر ئـەوەی زۆر نارەحەت و ماندووبووم جوابم پـێ نەدرایـەوە. ئـەو دوویـارە بـە دەنگێکـی بەرزتر گوتی:

ـ سلام علیکم براکەم. دیسان هیچم نەگوت. ئەم جار بەتوورەیی هاواری کرد:

ـ بۆچما کەڕی. سڵاوم کرد...

دیسان هیچم نەگوت. یەکی دیکە هاتە ژووریێو لەپیاوە ریش دارەکەی پرسی:

ـ لەگەڵ کێ قسەی دەکەی؟

ـ نازانم کێیە لێرە نوستوە. وادیارە لاڵە قسەناکا!

راستیشی دەکرد لەبرسـان و لەبـەر مانـدوویی خـۆم زمـانم شـکابوو قسـەم بـۆ نەدەهات. ئەو کابرای هاتبوو قامکی لە گوێم ڕاکردو هەتا تینی تێدابوو هـاواری کرد:

ـ ئۆهۆی ئامۆزا.

وەخت بوو پەردەی گوێم بدڕێ بۆ ئەوەی لە کۆڵم بنەوەو وەدوای کاری خۆیان کەون وەك ئەو ئەکتەرانە کەلە سینەما دیتبوومن گوتم "یا".

ـ لەکوێ ڕا هاتووی؟

دیسان گوتم: "یا".

هەردووکیان لەقاقای پێکەنینیان داو چەند کەسی دیکەش موسڵمان کە بۆ نوێژ هاتبوون لە دەورەم کۆ بوونەوە!

ـ ئەوە کێیە؟!

ـ چ خەبەرە؟!

کابرای ریش دار وەك فەرمانبەری باخی ئاژەڵ (حدیقه الحیوانات) کە دەیەوێ حەیوانێکی تازە بە تەماشاچییەکان نیشان بدا گوتی:

ـ نازانم. قسەی ناکا. هەر "یا... یا"یەتی!

یەکێك لەنێو خەڵکەکە هەڵی دایە:

ـ نەکا ئەڵمانی بێ. ئەوان هەمیشە دەڵێن "یا... یا". لەپاشان ڕووی کردە پیاوێکی پشت کووڕ:

ـ وانیە حوسێن ئۆن باشی؟

ئەویش بەزەحمەت سەری هەڵێناو تەماشایەکی بەژن و باڵای منی کرد کە لەسەر زەوی پان ڕاببووم:

ـ بەڵێ ئەگەر بڵێ "یا... یا" لەو بێدینانەیە.

یەکی دیکە گوتی:

ـ بەجلەکانیشی ڕا دیارە ئەڵمانییە.

کارەکە زۆر قووڵ ببوو، منیش ناچار بووم یان خۆم کەڕو لاڵ کەم یان بەڕاستی ببمە ئەڵمانی.

کڵاوێکی (کپ)م لەسەر بوو شاڵوارێکی مەخمەری کۆنم لەبەردا بوو، بەتەواوی وەك بێگانان دەچووم.

یەکێك لێی پرسیم:

ـ تۆ ئەڵمانی؟ سەرم بۆ لەقاند: "یا... یا".

کابرا ڕووی لە ئاپۆرایەکە کرد کە هەروا زۆر دەبوو:

ـ بەڵێ ئەڵمانییە. یەکێك نیە ئەڵمانی باش بزانێ؟ کابرای ریش دار قۆڵی مام حوسێنی گرت:

ـ ئەتۆ نەتدەگوت زەمانی شەڕ لەگەل ئەڵمانی‌یان کارت کردوە. دەباشە قسە بکە بزانم. لێی بپرسە بۆ هاتۆتە ئێرە؟

دڵم داتەپی. ئەگەر شتێکم لێ بپرسێ تەگبیرم چیە؟ ئەگەر خەڵك بزانن درۆم کردوە چ دەردێکم دەدەنێ. خواو راستان مام حوسێن ئەڵمانیی لەبیر چووبۆوە.

رەنگە هەر لەپێشداش نەیزانیبێ و بەدرۆ لەلای خەڵکی خۆی پێوە ڕانابێ. لەو کاتە دا یەکێك لە دوکانەکانی ئەویەرەوە بە غاردان هاتە مزگەوت و هاواری کرد:

ـ لێی وەکشێن. بۆچی ئەو بەستەزمانەی ئازار دەدەن.

یەکێك وەڵامی دایەوە:

ـ ئاخر پیسە هاتۆتە ژووری مزگەوت. باش نیە.

ـ نا. بابە موسوڵمانە. بۆخۆم بەیانی زوو کە دوکانم هەڵدەگرت چاوم لێ بوو لەسەر حەوزەکە دەزنوێژی هەڵدەگرت.

خوا ماڵی ئاوەدان کا بەو شایەتی‌یە گیانی منی ڕزگار کرد. دیار بوو ئەو کاتەی ئەمن خەریکی دەم وچاو شوتن بووم و ئاوم دەخواردەوە ئەو پیاوە لەدوورەوە چاوی لێم بووەو پێی وابووە دەزنوێژ هەڵدەگرم. یەکێك لەنێو خەڵکەکە پرسیاری کرد:

ـ مام رەجەب ئەو کابرایە نوێژیشی کرد؟

ـ بەڵێ. دیارە وەك نوێژی ئێمە نەبوو... بەلام...

کابرای ریش داری هەوەڵێ گوتی:

ـ رەنگە هاتبێ موسوڵمان بێ! مام رەجەب وەك لەگەڵ ئەڵمانی‌یەك قسە بکا گوتی:

ـ تۆ... تۆ... موسوڵمان... دەبێ؟!

چاك پێوە ببووم . ئەم دەتوانی بڵێم بابە منیش هاووڵاتی خۆتانم. ناوم "فەرید"ەو موسڵمانیشم.

مام رەجەب دیسان پرسیارەکەی دووپاتە کردەوە:

ـ تۆ... موسوڵمان؟!

گوتم: "یا"

لەگەڵ ئەو وشەیەم لەزاری دەرپەڕی لەپێشدا مام رەجەب و دوایەش ئەوانی دیکە باوەشیان پێدا کردم و دەستیان کرد بەماچ کردنم. ئاپۆرای خەڵکی دەقیقە بەدەقیقە زیاتر دەبوو و خەڵك بۆ رێزگرتن لە برایەکی ئایینی نۆ موسوڵمان پاڵیان بەیەکترەوە دەنا. هێندەی نەمابوو لەبەر پێیان دا پان ببمەوە.

مام رەجەب قۆڵی گرتم و بە زەحمەت لەنێو خەڵکەکەی بردمە دەرێ و وەك ئەوەی من باش لەزمانی حاڵی بم گوتی:

ـ فەرموو بچینە ماڵە بچووکەکەی ئێمە. پیاوە ریش دارەکە خێرا هاتە پێش و دەستی بەسنگی مام رەجەبەوە نا:

ـ نایەڵم بیبەیەوە. دەبێ بیتە ماڵی ئێمە. لەپشتەوە چەند کەسی دیکە هاواریان کرد:

ـ دەبێ شێوو نیوەڕۆیەکیش ئێمە گەورە بکەن:

ـ ئێمە دەبێ خێرێکمان پێ ببڕێ. مامە رەجەب وەك شتێکی (عەنتیکە)ی دەست کەوتبێ توند قۆڵی گرتبووم و رای دەکێشام. رۆیشتین بۆلای دوکانەکەی، بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد:

ـ "زەکی" ئەمن میوانێکی خۆشەویستم هەیە دەچمەوە ماڵێ ئاگات لە دوکانێ بێ. لەکۆڵانە تەنگ و باریکەکانەوە گەیشتینە هەورازێك. هێندەی نەمابوو لەبرسان ببوورێمەوە. لەرێگایە مامە رەجەب دەیەویست شتێکم پێبڵێ، بەڵام بۆی نەدەکرا. ئاخرەکەی بەئەدایەکی تایبەتیەتی‌یەوە پرسی:

ـ تۆ... ناو... چی؟

هیچ ناوێکی ئەڵمانیم وەبیر نەهاتەوە وام تێگەیاند کە حاڵی نەبووم... زۆر ناڕەحەت بوو کە نەیتوانی مەبەستەکەی لەمن حاڵی بکاو لەکاتێك دا خێرا خێرا دەسحێبەکانی دەگێرا گوتی:

"دەبێ فێری تورکی بکەین".

وەختێك هەورازەکە تەواو بوو و گەیشتینە سەر تەپۆڵکەکە مامە رەجەب لەبەر دەرگای خانوێکی گەورە کە باخچەیەکی زۆر جوانی هەبوو راوەستاو دووسێجار چەکوچەکەی توند لەدەرگا راکێشا. لە ژوورێ را دەنگێکی ژنانەی زۆر ناسك بەرز بۆوە:

ـ کێیە؟!

ـ بیکەوە کچم. دەرگا کرایەوە. چونکە کەسم لەپشت دەرگا نەدی تێگەیشتم لەسەرێڕا، بەتەناف کردیانەوە.

مامە رەجەب (بسم الله)یەکی بەقەوی کردو چووە ژووریۆ خوڵقی منیشی کرد، بەڵام چونکە وام نواند تێی نەگەیشتووم و پێکەنینێك لە سەر لێوەکانی وشك بوو...

کە لە باخچەکە تێپەڕین گەیشتینە بەردەم خانووبەرەیەکی خشتی سووری زۆر گەورە. مامە رەجەب دووسێ جار کۆخی و بەدەنگی بەرز گوتی:

ـ کەس لەوێ نەبێ میوانم هەیە.

کەگەیشتینە قاتی دووهەم چووینە ژوورێکی گەورە. نێو ژوورەکە مافوورەی گەورە گەورەی تێدا ڕاخرابوون. مامە ڕەجەب ئیشارەی بۆمن کرد دانیشم و بۆخۆشی چووە دەرێ. لەدالانێ گوێم لەدەنگی بوو گوتی:

ـ کچی خۆم ئاسیە! خواردنێکی گەرم بۆ میوانەکەمان دروست کە.

ئەو رستەیە بۆمن مزگێنی‌یەکی خۆش بوو. بەڵام بریا لەجیاتی خواردنی گەرم کە ماوەیەکی پێ‌دەچێ تۆزێك نانی وشکیان دابامێ. بەهەر جۆر بوو ددانم بەجەرگی خۆم دا گرت تا نان ساز بوو. کوڕێکی گەنج سینی‌یەکی گەورەی هێنا لەپێشی دانام و ڕۆیشتەدەر. بۆنی شیری کوڵیوم بەبەر هەڵا هات نەختێك هاتمەوە سەرەخۆ. بەپەلە دەستم درێژ کرد کە پیاڵە شیرەکەی هەڵبگرم بەڵام بۆ بەدبەختی مامە ڕەجەب پەردەکەی هەڵدایەوەو هاتە ژوور. خێرا دەستم کێشایەوە، مامەرەجەب کە دیار بوو تێ‌گەیشتبوو پێکەنینێکی درێژی کردو گوتی:

ـ فەرموو براگیان! شەرمی ناوێ. قابیلی نیە. ئێرە ماڵی خۆتە. من هەروا تەماشام دەکرد.

مامەرەجەب دەستی بۆ زاری خۆی بردو بە ئیشارە حاڵی کردم کە نان بخۆم. منیش سەرێکم بۆ لەقاند "یا... یا" و دەستم برد پیاڵە شیرەکەم هەڵگرت. مامە ڕەجەب دەستێکی لە شانم دا:

ـ تۆ... ئاسوودە... من دەرۆم.

ئەو لە ژوورێ وەدەرکەوت و منیش وەك گورگی برسی پێ وەربووم. هێندەشیان خواردن بۆ دانابووم نەم دەزانی لە کامەی بخۆم.

پەنیری پێستی، ڕۆنەکەرە، هەنگوین، شیر، شامی کەباب. وەختێك زگم تێر بوو و هاتمەوە سەرەخۆ کەوتمە بیری ئەوەی چارەیەك بدۆزمەوەو خۆم لەو تەڵەیە نەجات بدەم.

"ئەگەر ئەمانە تێبگەن درۆم لەگەڵ کردوون و فریوم داون بەزمێکم پێدەکەن ئەو سەری دیار نەبێ. چاك وایە زووتر ببمە جنۆکەی بیسمیل کراوو هەتا کارەکە پیس نەبووە بۆی دەرچم".

هەستامە سەرپێ کەخۆم توندکەم و بڕۆم، لەپڕ پەردەی ژوورەکە لادراو مامەرەجەب بەخۆی و مەلایەکی جەماڵ پاك و نوورانی‌یەوە وەژوورکەوت.

ئەوەندە دەستەپاچە ببووم کە هێندەی نەمابوو بەڕەی لەسەر هەتیوان هەڵدەمەوەو بەزمانی خۆمان بەخێراتنی مامۆستای بکەم! بەڵام دەسبەجێ خۆم کۆکردەوەو دەستەکانم وەك خاچ بەسنگمەوە گرت و سەرم بۆ دانەواند.

مام مەلا کە زۆری ئەو کردەوەی من پێخۆش بوو چەند جوملەیەکی عەرەبی گوتن کە باشیان تێنەگەیشتم. پاشان لە کاتێك دا بەرەو من دەهات ڕووی کردە مامەرەجەب و گوتی:

ـ لەپێش دا دەبێ بزانین ئەو ئەڵمانی‌یە چ کارەیە؟

ـ جەنابی مامۆستای ئەو ئەڵمانی‌یانە یان سەربازن یان زانان. دیارە ئەو پیاوە مرۆڤێکی تێگەیشتوویە کە موسوڵمان بووە.

جەنابی مامۆستای چەند وردەکۆخەیەکی کرد:

ـ دیارە زانستی ئەمانە وەك هی ئێمە نیەو ناگەنە پلەو پایەی ئێمە! ئەمانە سەرتاسەر بۆ مادیات کار دەکەن و سەروکاریان لەگەڵ معنویات نیە.

مامەرەجەب سەرێکی بۆ لەقاندو فەرمایشتی مامۆستای سەلماند:

ـ ڕاستە.

هێندەی نەمابوو بەقسەو رەفتاری ئەوانە پێکەنینم بێ. هەرچۆنێك بوو خۆم ڕاگیر کرد تا بزانم داری دەکەوێ بەری بەکوێدایە.

جەنابی مامۆستای جارێکی تر سەیری قەدو قەوارەی منی کردەوە:

ـ ئێستا کە ئەو پیاوە موسوڵمان بووە دەبێ لەو مەسەلەیە زۆر کەڵك وەرگرین "خوایە بۆ خۆت ساحێب روحمی".

منی قوڕپەسەر لەکۆلکی ڕەوی بوومەوە بەسەر بەرازی دا کەوتبووم. نەم دەزانی مامۆستا چ تەگبیرێکی بۆکردووم و دەیەوێ چۆنم کەلك لێ وەرگرێ.

مامەرەجەب خەریك بوو قسەیەك بکا، کە جەنابی مامۆستا پێشەوبڕی لێدایەوەو گوتی:

ـ دەبێ وێنەیەکی زۆری لێهەڵگرین و بەهەموو دەوڵەتان ڕابگەیەنین کە ئەڵمانییەك موسوڵمان بووە. بەبیستنی ئەو قسەیە تەزووێکم لەبەری پێیانەوە هات لە تەپڵی سەرم چووەدەر:

"ئەی دادو هەی بێداد من هاتمە ئەم شارە دوورکەوتووە کە بشارێمەوە، کەچی ئەوانە خەریکن دووبارە سەرم دەگۆمێ ڕاکەن". مامە رەجەب قسەکەی مامۆستای تەواو کردو گوتی:

ـ بەڵێ دەبێ وێنەی لە هەموو رۆژنامەکانی خۆشمان دا بڵاو بکەینەوە.

دەتگوت کوتکیان لەسەری داوم، وا تێك ڕابووم کە نیزیك بوو سەکتە بکەم. ئەگەر وێنەم لە رۆژنامەکان دا چاپ بکرێ باش باش جافر تێی دەڕی. خواو ڕاستان مامۆستا ئەو پێشنیارەی پەسند نەکرد:

ـ ئەوە دەڵێی چی بێقەزا بی... مەرکەز پێ بزانێ کەسێکی وا لێرەیە دەسبەجێ دێ دەیبا. بە خۆم نەبوو سەرێکم بۆ لەقاندو پێکەنینێکم بۆکرد، بەڵام خوا روحمی کرد کە جەنابی مامۆستا و مامە رەجەب چاویان لێم نەبوو،

ئەگینا کارەکە پیس دەبوو. مامە رەجەب جگەرەیەکی بۆ راداشتم، هیندەی نەمابوو بڵێم "جگەرەکێش نیم" گوتم " ج... جج" وەبیرم هاتەوە. تازە پیتی (ج) یشم گوتبوو نەدەکرا قسەکەم قووت دەمەوە گوتم:

جر. فان در. هیزن.

جەنابی مامۆستا و مامە رەجەب بە سەرسوڕمانێکەوە تەماشایان کردم:

ـ بەستەزمانە کەس نازانی دەڵێ چی! دەبێ زوو تەرجومانیك پەیدا بکەین.

بە جارێك دەست و پێی خۆم لێ ون ببوو، دەست و سەری خۆم بەجۆرێك جووڵاند دەمەویست هەر چۆنێك بێ سەرو کلکی مەسەلەکە پێك بگرم، مامەرەجەب قاقایەکی کێشاو دەستی وەبن لاچاوی خۆی داو پرسی:

ـ ئەتۆ. خەو. پێویست؟

ـ یا... یا.

مامە رەجەب رووی کردە جەنابی مامۆستا:

ـ هەقیەتی فەقیرە زۆر بەرێگادا هاتوە ماندوو بووە فەرموو بچینە ئەو ژوورەی تر. با بۆخۆی ئیسراحەت بکا.

هەستانە سەرپێ جەنابی مامۆستا گوتی:

ـ دەبێ لەپێشدا سوننەتی بکەین. دوایە کارێکی بۆ دەبینینەوە.

مامەرەجەب بۆی لەملی دا:

ـ دیارە ئەرکی سەرشانمانە یارمەتی بدەین. برایەکی دینیمان لێ زیاد بووە.

لەدڵی خۆم دا گوتم "دیارە برای دینی کەم بوون... سەدان هەزار برای دینی بە هەژاری و نەداری و برسیەتی و بیکاری دەژین کەس بۆیان بەخەم نیە. جەنابی مامۆستای بە لوتفەوە تەماشایەکی کردم:

ـ بەڵێ. دەبێ ژنێکی باشیشی بۆ بێنین.

ئەوەندە دەهری ببووم خەریك بوو دەست لەو گەپجارو ڕواڵەت بازییە هەڵگرم و هەرچی بەزارم دا دێ پێیان بڵێم. "ئاخر توخودا تێ فکرن ئەو هەموو موسوڵمانە بە هەژاری و بەدبەختی دەژین کەس بەخەیاڵی دا نایە، بەلام بۆ مەسیحی‌یەك کە موسوڵمان بووە چەند دڵسۆزن.

ئێستا ئەگەر بڵێم کاکە ئەمن نەئەڵمانیم و نە مەسیحی، برایەکی دینی خۆتان و خەڵکی ولاتی خۆتانم دیسان ئامادەن یارمەتیم بدەن؟ بێگومان نا!".

پێکەنینێکی بێگاریم هێنایە سەر لێوان، جەنابی مامۆستاو مامەرەجەب وەدەرکەوتن، کوڕێکی مێر منداڵ دەستە نوێنێکی بۆ هێنام. مامە رەجەب هاتەوە ژوور جێگایەکەی پێنیشان دام، دەستی وەبن سەری داو چاوی لێك نان. سەرێکم بۆ لەقاندو گوتم "دۆن گشۆن" واتە سوپاس. ئێستا ئەم وشەیە لەکوێ فێر ببووم بۆ خۆشم نەم دەزانی. مامە رەجەب بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ ئەگەر شتێك پێویست... بانگ بکە... تێگەیشتی؟...

دیسان سەرم بۆ لەقاند: "یا".

ئەوەندە ماندوو بووم هەر کە مامە رەجەب چووە دەرێ وەك سپێدارێکی ببڕی ڕانیشتم:

"خودایە... بۆخۆت نەجاتم بدە... سبەینێ بەیانی تەگبیرم چیە؟ ئەگەر تەرجومانی ئەڵمانی پەیدا بکەن بڵێم چی!؟ ئەگەر بیانەوێ سوننەتم بکەن چ بکەم؟؟!"

دەڵێن بنیادەم ژیانی خۆی دروست دەکا...!! رەنگە خەڵکی دیکە بتوانن ژیان بۆ پیاوی دروست بکەن. بەلام ئەو کەسانە لەژیان دا زیاتر سەردەکەون کە لەسەر پێی خۆیان ڕابوەستن و بە هەستێکی پتەوەوە بەرەو ئامانجی خۆیان

هەنگاو هەڵێنن... بە ڕواڵەت ئەم قسانە هەموو راستن بەڵام ئایا بەراستیش وایە؟!!

راستە کە من هەڵەیەکم کردو لەناوەندی عەسکەری دەریان کردم. بەڵام داخوا لەبەرکردنی بەرگی ئەفسەری، بوون بە مووچە خۆری بانك و وەرگرتنی لەقەبی راوچی ژنانیش بۆخۆم ویستم... بەدەستی خۆم بوو...؟! نا...!

بە خەیاڵیشم دا نەهاتبوو هیچ کام لەو کارانە بکەم... هیچ کەیفم بەو شتانە نەدەهات. ئێستاش کە منیان وەك ئەڵمانی‌یەك خستۆتە داو و خوا دەزانێ ئاخرەکەی بەکوێ دەگا هیچ دەسەڵاتی خۆمی تێدا نیە...

نا... ئەمجار تەسلیمی چارەنووس نابم و بۆخۆم بناخەی ژیانی خۆم دادەنێم... ئەمشەو لێرە دەبم و سبەینێ بەیانی زوو هەڵدێم.

کاری ئاودەستێم هەبوو...

لەگەڵ دەرگام کردەوە شتێك بەهەموو گرانایی خۆیەوە کەوتە ژوورەکەو قیژەیەکی درێژ لە دالآنەکەدا دەنگی دایەوە...

دڵم داتەپی و ئارەقێکی ساردم بە لەشی دا هات... ئەو جوانە مەرگە کچی مامە رەجەب بوو کە گۆیا خەریك بوو لە کەلێنی دەرگاکەوە تەماشای منی دەکردو کە من دەرگام لێ کردەوە خۆی پێ ڕانەگیراو لەپەورووو بە دیوی ژوورێ دا کەوت و قیژاندی...

لەگەڵ ئەوەی زۆر ترسابووم و لەوەش تۆقیبووم کە نەکا لەو کاتەدا مامە رەجەب و ئەوانی تر بێنەوەو ئابڕووم بچێ، بەڵام نەمتوانی تەماشای ئەندام و روومەتی "ئاسیە" نەکەم کە چارشێوی لەسەر وەلا کەوتبوو "خوایە... لەو بەژن و باڵایە، لەو رەنگ و روخسارە، لەو مووە جوانانەو لەو چاوە بادامی‌یانە

دەتگوت ئاسکەو کەوتۆتە تەڵەوە، چاوە ئەفسووناوی‌یەکانی حاڵەتێکی سەیریان هەبوو.

لە شەرمان روومەتی وەك گوڵی هەناریٚ سوور هەڵگەڕابوون و دڵۆپە ئارەق بەسەر کوڵمە جوانەکانی دا دەخزین.

کاری راست بیٚ لەو کاتە ئاسکە دا پێش ئەوەی دەرگای ژوورەکانی دیکە بکرێتەوەو مامە رەجەب و دایکی ئاسیە بێنە دەریٚ کچەکە خۆی لەسەر خشتی دالآنەکە درێژ کرد. ئەمنیش خێرا دەرگاکەم پێوەداو بە لینگەلەرزە لەپشت دەرگا راوەستام و گوێم بۆ قسەکانیان هەڵخست.

مامە رەجەب هاواری کرد:

ـ چ بوو کچیٚ؟ ئاسیە وەك هونەرمەندێکی کارامە بەگریانەوە وەڵامی دایەوە:

ـ پێم هەڵەنگوت و کەوتم. ئای. وەی. دەنگێکی ژنانە پرسی:

ـ زۆرت ئازار گەیشت؟

ـ پێم وایە لاقم لەجیٚچوو. ئای مردم. مامە رەجەب بە تووڕەیی و نارەحەتی گوتی:

ـ بەجەهەندەم. وەك بنیادەمان بەڕیٚ دا برۆ. بێدەنگ بە ئەو میوانە وەخەبەر دیٚ.

دەنگێکی ژنانە گوتی:

ـ بچۆ بزانە هەڵنەستاوە.

دیسان بەلآیەکی دیکە. خەریك بووم بچمەوە سەر جێگاکەم مامە رەجەب دەرگای کردەوە چاوی لیٚ کردم. بۆ ئەوەی وا نیشان بدەم تازە وەخەبەر هاتووم باوێشکێکم هێنایە خۆم و دەستم بە ئەڵمانی گوتن کردو هەرچی بەزمانم دا هات گوتم.

مامە رەجەب پێکەنی:

ـ ئەتۆ پێویست بنووی؟

منیش بۆم سەلماند: "یا".

دووبارە دەرگای ژوورەکە پێوە درا. هێشتا دەنگی گریان و هاواری ئاسیە لە دالانەکەدا هەر دەهات.

ئەوەندە تەبیعی دەگریا پێم وابوو بە ڕاستی لەگەڵ کەوتنەکە دەست و لاقی ئازار دراون.

مامە رەجەب و ژنەکەی ئاسیەیان بردە ژووری خۆیان و دنیا بێدەنگ بوو. بەڵام بەلایەکی تازە بۆمن هاتە پێش. هەستم کرد دڵێك نا هەزار دڵ ئاشقی ئاسیە بووم.

ئەی نەحلەت لەو شانسە. نازانم بۆچی بنیادەم کە تێری خوارد هەوەسی دەبزوێ؟

بەڵام ئەوەش هەر بەدەست خۆم نەبوو و بێ ئەوەی بۆخۆم ئاگام لێ بێ عیشقێکی لەناکاو لەسەری دام.

دەزنوێژم زۆر گران ببوو، بەتەواوی تاوی دابووم. چاك گوێم هەڵخست، کاتێك زانیم هەموو نوستوون بەسپایی وەدەر کەوتم. دالانەکە نەختێك ڕووناك بوو. لەوسەری دالانەکە لەبەر دەرگایەك خاولیەکی چووك بەبزمارێ دا کرابوو.

پێم وابوو ئەو خاولیە نیشانەی ئەوەیە کە ئەوێ دەستشۆرو ئاودەستە. دەستە گیرەکەم باداو ودەرگاکە کرایەوە. زیرەی ژنێك و دەنگی جنێودانی پیاوێك وەك تۆپ لەمێشکم دا تەقینەوە. وەك کارەبا لێی دابم لەوێ لەڕاست خۆم وشك بووم.

ئێرە ژووری نوستنی مامە رەجەب بوو. گۆیا ئەو و ژنەکەی بەبۆنەی ئەو خێرەوە کە لە موسوڵمان بوونی مەسیحی‌یەك بەنسیبیان ببوو جەژنیان کردبوو! !

ئەی نەحلەت لەو شانسە. بۆیە دەڵێ "دزی ناشی روو لە کادێنی دەکا" ئێستا چ بکەم؟

ئەو گووکاری‌یەی چۆن پینە بکەم؟

ئەوەندە دەستەپاچە ببووم کە تاوێکی چاك هەر رەق راوەستام و هیچم بۆ نەکراو وەك پەیکەرێکی بێ گیان یان وەك مەحکومێك کە لەبن داری ئیعدام راوەستا بێ جووڵەم لێ برابوو چاوەڕوانی چارەنووس بووم.

لەنەکاو دەنگی زیڕەیەکی ترسناك لە ژوورەکەی تەنیشتم بەرز بۆوەو مامە رەجەب کە وەك ورچی بریندار لەجێی دەرپەڕیبوو کە دم و ددانم تێك بشکێنی یان لیس ترێنم بکا. تەمبێ کردنی منی لەبیر چۆوە مستێکی توندی لەسنگم داو لەبەر دەرگاکەی لابردم و غاری دا ژوورەکەی تەنیشتم. کە زیڕەی ئاسیەی لێوە دەهات:

ـ چتە کچێ بۆ دەقیژێنی؟

ـ دز. دز هاتوە.

ـ کوا دز؟!

ـ لەدالآنێ بوو.

ـ گەوجە ئەوە میوانەکەمان بوو. پاشان تێ گەیشتم ئاسیە کە سەرتاسەر وریای من بووە بەتایبەتی ئەو رۆڵەی یاری کردوە.

پاش تاوێك مامە رەجەب بەتووڕەیی و نارەحەتی هاتە دەرێ و بەرقەوە بەسەر منی دا نەراند:

ـ بەملی شکاوت لەچی دەگەڕێی؟

بێ ئەوەی گوێ بدەمە ئەوەی زمانی نازانم دەستم لەسەر دڵم داناو ناڵاندم:

ـ ئاخ در. هیزن.

مامە رەجەب رقەکەی نیشتەوەو چووە ژوورێ بەخێزانی گوت:

ـ فەقیرە پێم وایە خواردنەکانی ئێمەی پێنەکەوتوەو ژانە زگی گرتوە...

ژنەکەی دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ:

ـ ئەتۆش سەگت بۆ بەدیاری هێناوین!

ـ وست بە کچێ. میوان خۆشەویستی خودایە. بەتایبەتی ئەمە خێرەکەی دوو چەندانەیە. هەستە نەختێك ئاونەباتی گەرمی بۆ دروست بکە.

ـ ئەو زەحمەتەی بۆخۆت بکێشەو خێرەکەشی بۆخۆت.

مامە رەجەب لەژوورێ هاتەدەر، دەستێکی بۆلای ژوورەکەی من راداشت:

ـ ئەتۆ. پێویست. ژوور. ئێستا من دێم ژانەزك. چاك دەکەم.

ئەوەندە تەنگەتاو بووم وەخت بوو بتەقم. هاوارم کرد:

ـ ئەمن. پێویست. تەوالێت.

ـ ئێستا چ وەختی تەوالێت؟ نێرەکەرە بەو نیوەشەوە هەوەسی تەوالێتی بزووتوە.

لێرەشدا هەر ئاسیە فریام کەوت کە دیاربوو لەپشت دەرگاوە گوێی لەقسەکانمان راگرتبوو. بەدەنگێکی بەرز گوتی:

ـ بابە دەیەوێ بچێتە ئاودەستێ.

ـ چاوی خۆت دەرێنە بەستەزمان. ئەمن چووزانم چ غەڵەتێك دەکەی.

پاشان بەدەست حاڵی کردم کە بچمە ئەو سەری باخچەکە.

ژنەکەی لە ژوورێڕا هاواری کرد:

ـ مەسینەکەی گڵاو نەکا.

ـ نا بابە، فەقیرە موسوڵمان بووە.

کاتێك هاتمەوە سەرەخۆو گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم تازە حەوشەی بەسەفاو پڕدارو دەرختی مامە رەجەبم بەچاکی دەهاتە بەرچاو:

"چەندماڵێکی خۆشە. خۆزگەم بەخۆیان کە باخێکی وایان هەیە".

لەژووریٚ فکرم رەحەت بوو، دەبوو نەخشەیەکی رێك وپێك بکێشم.

بوونە میلیۆنێرم لەبیر چووبۆوە. ئێستا هەر ئەوەندەم دەویست لەجێگایەك بتوانم بیٚدەدردی سەری و کوێرەوەری بژیم و لەو تەڵەیە رزگارم بیٚ.

باشترین رێگای کە بە ئەقڵم دا هات ئەوە بوو کە دەست لەو چەورو شیرینییە هەڵگرم و بەیانی زوو پێش ئەوەی خەڵکی ماڵیٚ لەخەو هەڵستن رابکەم و لەو شارەش نەمێنم و بڕۆمە قوژبنێکی دیکە.

نازانم کەنگێم خەو لیٚکەوتبوو، بەدەنگی کەڵەبابی بەیانی وەخەبەر هاتم و لەپەنجەرەوە تەماشایەکی ئاسۆم کرد.

تازە بەیان ئەنگوتبوو. خێرا جلکەکانم لەبەر کردو بۆ ئەوەی کەس وەخەبەر نەیە بەحاڵ پەنجەم دەگەیاندە زەوی، بەسپایی وەدەرکەوتم. هەر لە پلیکانەکان بەربوومەوەو دەنگی زیڕەی ئاسیە وەك زەنگی مردن دەنگی دایەوە:

ـ بابە ئەڵمانییەکە خەریکە دەڕوا. بابە غاردە. گەیشتە کۆڵانیٚ! لەترسی ئەو بەڵا تازەیە هەموو گیانم دەلەرزی:

ـ ئەی دادو بێداد... ئەگەر ئەمجارە بگیرێمەوە چ قوڕێك وەسەری خۆم کەم؟!

کەمێك پێم هەڵێنایەوە.

لە کۆلانێ تاك و تەرا خەڵکم دەدی کە بۆ حەمام یان مزگەوت دەڕۆیشتن. ئەگەر توانیبام لەشاری بچمەدەر ئەوەکەی تری هاسان بوو.

لەپشتمەوە گوێم لەدەنگی مامەرەجەب.

ـ هۆی! هۆی..! کاکە..!

توندترم کرد، هێندەی نەمابوو بکەومە نەرمە غار.

بەڵام هەتا دەهات دەنگی مامە رەجەب نیزیکتر دەبۆوەو پتری هاوار دەکرد.

دیارە ئەویش بەغار بەدوام دا دەهات و بێ پسانەوەش بانگی دەکردم:

ـ هاوڕێ. هۆی براکەم. برای دینی..! بۆکوێ دەچی؟! بەسپایی بڕۆ هەناسەم گیرا. ڕاوەستە بزانم ئەڵمانی..!

کەم کەم خەڵکمان تێ گەیشت. خەیاڵ هەڵی گرتم:

"رەنگە مامە رەجەب وا بزانی شتێکم لێ دزیوە؟".

ئەگەر رادەوەستام عەیبێکی هەبوو، ئەگەر دەڕۆیشتم عەیبێکی تر.

"خوایە تەگبیرم چیە؟"

کاتێك لەسەرەوژێرەکەی هاتمە خوارو چاوم بە مزگەوت کەوت فکرێکی باشم کردەوە. چوومە بێڵایە مزگەوتێ و لە تەنیشت بەلووعە ئاوەکە راوەستام دەستم کرد بە دەزنوێژ هەڵگرتن.

مامە رەجەب کە هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو و بەغار بەدوام دا دەهات کە دیتی ئەو پەلەپەلەم لەبەر خاتری نوێژەکەم بووە قاقایەکی درێژی کێشا:

ـ بابە گیان، گوتبات دەچم نوێژێ دەکەم. خۆ ئێمەت تۆقاند!

پاشانیش هەر بۆخۆی گوتی:

"هەرچەند فەقیرە زمانیش نازانێ".

ئەمن خەریکی کاری خۆم بوو مامەرەجەب دووسێجار بەسپایی دەستی لە پشتی دام:

ـ مەرحەبا. ئافەرین. خوا چ رووناکایی‌یەکی خستۆتە دڵی ئەم ئەڵمانی‌یەوە، لەئێمەش موسوڵمان تر بووە بەیانی زوو هەڵدەستێ تا نوێژەکەی وەدرەنگ نەکەوێ!

مامە رەجەب لە مزگەوتێ راوەستا تا نوێژەکەی من تەواو بوو (دیارە وەك نوێژی موسوڵمانانیش نەدەچوو). پاشان قۆڵی گرتم و بردمیەوە ماڵێ.

تێگەیشتم وا بەهاسانی ناتوانم لەو ماڵە رابکەم. بەڵام تەگبیرم چیە؟ نەمدەزانی.

خۆم دایە دەستی چارەنووس و جڵەوم دا دەستی کارەسات. چەند سەعاتێك پێ چوو جەنابی مامۆستا لەگەڵ پێنج شەش کەسی دیکە تەشریفیان هێنا.

مامۆستا چەند جوملەیەکی عەرەبی گوتن و منیش دووپاتەم کردنەوەو بە هێنانی شادەو ئیمان بە رەسمی بوومە موسوڵمان.

دیارە ئەمە دووهەم جارم بوو کە موسوڵمان دەبووم. جەنابی مامۆستا پرسی:

ـ ناوت چیە؟ خۆم لێ گێل کردو جەنابی مامۆستا فەرمووی:

ـ زوو یەکێکتان بچن مامۆستای زمانی فەرەنسەیی قوتابخانەکەمان بێنن.

پاش چەند دەقیقە مامۆستای زمانی فەرەنسەیی هات. وادیار بوو هەموو شتێك تێگەیوە.

پرسیاری کرد:

ـ برا ئایینی‌یەکەمان ئەمەیە؟

جەنابی مامۆستا جوابی دایەوە:

ـ بەڵێ. قسەی لەگەڵ بکە. بزانە کێیەو لەکوێڕا هاتوە! مامۆستای زمانی فەرەنسەیی گوتی:

ـ ئەمانە زمانی فەرەنسەیی تێناگەن.

بۆم دەرکەوت فەرەنسەیی گوتنی کاکیشم هەر وەك ئەڵمانی گوتنەکەی منە. ئەوەی چاك بوو لە قوتابخانە نەختێك فەرەنسەیی فێر ببووم.

جەنابی معلم بە دڕدۆنگی‌یەوە هاتە پێش و گوتی:

ـ پارلێ ڤوو فەرەنسە؟!

ـ وی.

گویا دەیویست لێم بپرسێ ناوت چیە، بەڵام بەهەڵەچوو پرسی:

ـ کێلێ ڤوترۆ نومرۆ؟ یانی "نمرەت چەندە؟"

ئەمن پێکەنیم و بۆخۆشی تێگەیشت گوتی:

ـ پاردۆن. پاشان پرسی "ناوت چیە؟"

گوتم "کارل".

کاکم رووی کردە جەنابی مامۆستاو گوتی:

ـ هەروەك فەرمووتان ئەو پیاوە یەکێك لە زانایانی گەورەی دنیایەو دەڵێ من لەهەموو ئایینەکانم کۆڵیوەتەوەو تێگەیشتووم کە ئیسلام لە هەمووان باشترە.

ئێمە تەنیا دوو قسەمان پێکەوە کردبوو ئەو جەنابە ئەو هەموو شەرح و تەفسیرەی لەسەر قسەکانم کرد. ئەو خەڵکە ساکارەی لەوێش بوون سەریان لە فەرەنسەیی زانینی کاکی مامۆستا سوڕمابوو:

ـ ئافەرین ئەفەندی چەند جوان بە فەرەنسەیی قسە دەکا!

ـ بارك الله بۆ خوێندەواریت. یەکێك لە دانیشتوان کە دیار بوو پیاوێکی فزوولە پرسی:

ـ ئێوە تەنیا دوو قسەتان پێکەوە کرد، چۆن ئەو هەموو مانایەی هەبوو؟!

کاکی مامۆستا هیچ لە روو نەچوو، وەڵامی دایەوە:

ـ ئەمە پێوەندی بە ئەقڵ و تێگەیشتنی بنیادەمەوە هەیە. زمانی فەرەنسەیی وەك زمانی ئێمە نیە ئەو هەموو درێژ کردنەوەی هەبێ. هەر وشەی کۆڵێك مانای هەیە. زمانە بیگانەکان وەك سابوون وان دەبینی کوتەسابوونێکی چکۆڵە دنیایەك کەف دەکا.

توند توند ددانم بە جەرگی خۆم دا گرتبوو هەتا پێکەنینم نەیە.

مامۆستای قوتابخانە کە دیاربوو زۆر قوماربازە دەستی بە خوێندنەوەی یەکێك لەو چیرۆکە کورتانە کرد کە لە پۆلی دووهەمی فەرەنسەیی دا چاپ کراون و وەك بلبل پێیدا رۆیشت:

"ژان کیفەکەی هەڵگرت، دایکی ماچ کردو رۆیشت بۆ قوتابخانە. ژانتیش دراوسێیان بوو. لەرێگا تووشی یەکتر بوون و دەستیان کرد بەقسەو گاڵتەکردن. کاتێك گەیشتنە قوتابخانە زەنگی پۆلەکەیان لێدرابوو".

پاش هەموو جوملەیەکیش تەماشایەکی منی دەکردو ئەمنیش بۆئەوەی کارەکە زیاتر پیس نەبێ سەرم بۆ دەلەقاندو پەیتا پەیتا دەمگوت:

ـ وی. وی. مۆسیۆ.

کاتێك چیرۆکەکە تەواو بوو کاکی مامۆستا چی لە جانتای دا نەما، رووی کردە دانیشتوان:

ـ گوێتان لێبوو.؟

جەنابی مامۆستا کە بە قامکەکانی ریشی دادێنا گوتی:

ـ کاکە ئەتۆ زمانی ئەو فەرەنگیانە زۆر باش دەزانی!

ـ بەڵێ... ئەمن جارێکیان لەگەڵ کابرایەکی فەرەنسەیی قسەم دەکرد کابرا زۆری پێ سەیر بوو تەنانەت فەرەنسەیی‌یەکانیش دەستم لەگەڵ ناکەنەوە. کەسێك دەتوانێ لەگەڵ من قسە بکا کە فەرەنسەیی زۆر باش بزانێ. ئەم پیاوە ئەڵمانی‌یەو باش ناتوانێ بە فەرەنسەیی قسە بکا...

جەنابی مامۆستا قسەکانی ئەفەندی تصدیق کردو گوتی:

ـ باشە ئێستا ناوی ئەو خارجی‌یە چیە؟

ـ کارل.

ـ زۆر باشە، کەوابوو دەتوانین ناوی بنێین "کامل".

هەموو دانیشتوان ئافەرین یان بۆ ئەقڵ و تێگەیشتنی جەنابی مامۆستا ناردو ئەمنیش سەرلەنوێ نێوکم براو ناوم لێنرا "کامل".

پاش ئەو بەزمە سەرلەنوێ شیرینی خواردن دەست پێکراو دەوری پرلەشیرنی و مرەبا بە مەجلیس وەربوون.

هەروا لەسەری سەرەوە لە تەنیشت مامۆستا دانیشتبووم خەیاڵ هەڵی گرتم:

"بۆچی ئەو هەموو موسوڵمان و برای دینی‌یە لە وڵاتی ئێمەدا کەوتوون هیچ کەس گوێیان ناداتێ، بەڵام بۆمن کە پێیان وایە بێگانەم و تازە موسوڵمان بووم ئەو هەموو خەرج و موخاریجە دەکەن و جێژن و بەزم و بیساتم بۆ دەگێرن.

خوا بکا فەقیرو هەژاری وڵاتانی دەرەوە ئەو خەبەرەیان پێ نەگا. ئەگینا لێشاوی سواڵکەرو لێقەوماوی بێگانە روو لە وڵاتەکەمان دەکا و گیروگرفتێکی تازەش دەبێتە سەرباری ئابووری و بازرگانی شەق و شڕی ئێمە. ئەودەم هەژارترین کەس لە وڵاتی ئێمە پانتۆڵەکەی دادەکەنێ و لەپێی تۆموسوڵمانە

بێگانەکانی دەکا! پێم سەیرە چۆن هەتا ئێستا فەرەنگی‌یەکان ئەو فکرەیان نەکردوە کە بێن موسوڵمان بن و ئەو هەموو قازانجەیان دەست کەوێ.
ئەگەر بڵێین لەو مەسەلە بێخەبەرن راست نیە. زۆر جارمان بیستووەو دیتومانە کە هەروەخت یەکێك لە ئێمە لە وچخانی ماڵەکەی دا قسەیەکی نهێنی لەگەڵ ژن و منداڵەکەی بکا دووسێ رۆژ دواتر لە رادیۆو رۆژنامەکانی ئەوان دا بڵاو دەکرێتەوە ئەدی بۆچی لەو بارەوە دەست بەکار نەبوون؟!
دیارە هۆیەکی گرنگی هەیە کە ئێمە تا ئێستا ئاگامان لێ‌نیە. بەکورتی مامەرەجەب هەموو کاروکاسبی‌یەکی وەلا نابوو تەنیا خزمەتی منی دەکرد. باشترین جل و بەرگی بۆ ساز کردبووم. باشترین خواردەمەنی بۆ دروست دەکردم و شەوو رۆژ یان خۆی یان "ئاسیە"ی کچی ئاگاداری من بوون!
ئەمنیش ئەو جینگەنەیی جارانم نەمابوو. بەڕاستی نە دەمویست و نە دەشمتوانی ئەو ماڵە بەجێبێڵم. لەلایەك رێگای هەڵاتنم لێ‌گیرابوو، لەلایەکی تریش باش کەوتبوومە داوی ئاسیەخانەوە.
تکام ئەوەیە قسەکەم جۆرێك لێك نەدەنەوە. خۆشەویستیی من ئەوینێکی پاك و ڕوومانتیکی بوو. چونکە هەردووکمان دەمانزانی هەل ومەرج بۆ زەماوەندی ئێمە زۆر ئامادەیە درێژەپێدانی ئەو خۆشەویستی و دۆستایەتی‌یە هیچی تێدا نەبوو.
لەهەموو رەفتارو کرداری مامە رەجەب دەردەکەوت کە حەز دەکا بمکاتە زاوای خۆی.
هەربۆیەش زۆر لە سوننەت کردنەکەم بەپەلە بوو. ئەو رۆژە پاش شێرنی خواردنەکە دیسان مەسەلەکەی هێنایە گۆڕێ و بڕیار درا بەیانی "سوننەت بکرێم".

"خوایە بۆخۆت لەو بەڵایە رزگارم بکەی".

بۆ سبەینێ خۆم نەخۆش کرد. مامە رەجەب دوکتۆری هێنا. (ئاسیە)و دایکی کە منیان بە زاوای خۆیان دەزانی بێهیچ شەرم و شکۆیەك دەستیان بە خزمەتی من کرد.

خودا بیگری هەرکاتێك چاوم بەچاوەکانی ئاسیە دەکەوت قەڵەمی دەست و پێیانم دەشکا. ئەی خوایە لەو چاوانە! پێستی بەدەنی دەتگوت پەلکی گوڵووکە، مووی سەری عەینەن دەتگوت هاوریشمی خاسەرەنگە.

کاتێك لەبنەوە تەماشای دەکردم شەرمێکی کیژانە دای دەگرت، لێوە خونچەیی‌یەکانی ئەوەندە جوان و دڵگیر دەبوون کە پیاو بەخۆی نەبوو خەریك دەبوو پەلاماری بداو ماچیان بکا.

باوەڕم پێبکەن ئەگەر لەبەر خاتری ئاسیە نەبوایە حازر نەبووم یەك دەقیقەش لەو ماڵە نەحلەتی‌یە بمێنمەوە. بەڵام ئەو ئەوینە بێئەمانەبوو کەمنی لەوێ گیر کردو بوو بەهۆی بەدبەختی و چارەڕەشیم!

سات بەسات زیاتر هۆگری ئەو ئاسکە کێوی‌یە دەبووم. هەرچی دەمکرد نەمدەتوانی عیشقی ئاسیە لەسەرم بەرمەدەر.

راستە کە گووتویانە ئەوینیش جۆرە نەخۆشی‌یەکە. ئەمن تووشی ئەو نەخۆشی‌یە ببووم.

خۆم دایە دەستی چارەنووس و چەرخی ژیانم وەدەست قەزاو قەدەر دا: "هەرچی دەبێ بلا ببێ. لەگەڵ ئاسیە زەماوەند دەکەم. پێنج شەش منداڵمان دەبێ. ژیانێکی ئابڕوومەندانە پێك دێنین. پاش حەوت هەشت ساڵ رابردووەکەم لەبیر خەڵك دەچێتەوە. پیلی ژن و منداڵەکەم دەگرم و دەچمەوە ئەستەمبوول و ژیانێکی ئاسوودە دەست پێدەکەم".

چ خەیاڵ پلاوێکی شیرن بوو؟ هەیهو!؟

چەند رۆژێك پێچوو. ئیتر لەوە زیاتر نەمدەتوانی خۆم نەخۆش کەم. ئاخر نە تام هەبوو، نەڕەنگ و رووم تێك چووبوو.

بەکورتی. هەرچەندی دوکتۆرەکان ئەم دیو ئەودیویان کردم و دەرو ژووریان تاقی کردمەوە بچووکترین شوێنەواری نەخۆشی‌یان لەلەشی من دا نەدۆزیەوە.

بەدبەختی لێرەدا بوو کە ئەو خۆنەخۆش کردنە نەك هەر بەقازانج تەواو نەبوو، بەڵکە کارەکەی پیستریش کرد. مامە رەجەب بڕیاری دا مەجلیسێکی گەورە بۆ (سوننەت کردنی) من رێك بخا.

تەنانەت کارتی دەعوەتیشیان چاپ کردو رۆژەکەشیان دیاری کردو وەستای سوننەتانیشیان خەبەردار کرد.

ئەو وەستایە لەو شارە بچووکەدا هەمەکارە بوو. دوکانی سەرتاشی‌یەی هەبوو، کەڵەشاخی دەگرت، کاروباری کڕین و فرۆشتنی ملکەکانی رادەپەڕاند. جارجاریش سەنەدی کڕین و فرۆشتنی دەنووسی.

وەختێك ئەوم ناسی تۆزێك دڵم خۆش بوو. دڵنیا بووم ئەو جۆرە کەسانە بە پارە هەموو کارێك دەکەن. لەو ماوەیەش دا مامە رەجەب هەموو رۆژێ هێندێك پارەی لەگیرفانی جلەکانم هاویشتبوو. منیش بڕیارم دا پەنجا لیرەیەك کۆ بکەمەوەو بە بەرتیل بیدەم بە وەستای سوننەتان بۆ ئەوەی چارەیەکم بۆ بدۆزێتەوە!

بەو جۆرە کارەکەمان بەخێر دەگوزەراو بەزمی زەماوەندی من و ئاسیە سەری دەگرت وئەگەر دوایەش وەستا راستیەکەی بە خەڵك گوتبا کەس بڕوای پێ نەدەکرد.

ڕۆژی جێژنی سوننەت کردنی من هەنگامەیەکی سەیر بوو دەتگوت هەموو خەڵکی شاریان بانگهێشتن کردوە.

"خوایە ئەو جەنجاڵیە تووشی کوێرەوەریم نەکا".

دەمەویست تکا لەمامە ڕەجەب بکەم کارەکەی هێندە گەورە نەکا، بەڵام بە چ زمانێك؟ نەم دەتوانی. دەترسام کارەکە زیاتر پیس بێ.

مەنجەڵە پڵاوی گەورە گەورەیان وەسەر نابوون. بەرخی قەڵەویان لەشیش دەدان و دووکەڵی گۆشت برژاندن وڵاتی داگرتبوو.

میوانەکان لەپێنج شەش هۆدەدا خەریکی بەزم و شیرینی خواردن بوون. وەستای دەلاکیش لە ژوورێکی گەورەدا خەریك بوو ئامرازی کاری خۆی ساز دەکرد.

مامە ڕەجەب بەپەلەو بەئارەق ڕشتن وەژوور کەوت گوتی:

ـ پیاوێك لە ئەستەمبووڵەوە هاتوە کاری بەتۆیە.

وەك کێوێکم بەسەردا بەردەنەوە بەجارێك لەجێی خۆم وشك بووم "ئەوە کێیە لە ئەستەمبووڵەوە هاتوە کاری بەمنە، ناکا بەڵایەکی تازە بێ".

مامە ڕەجەبی فەقیر کە پێی وابوو لەترسی سوننەت کردن وا وشك بووم، زۆری بەزەیی پێم دا هاتەوە:

ـ وادیارە ئەتۆ زۆر لە سوننەت کردن دەترسی! ؟

ـ نا، هیچ نیە.

پرسی:

ـ ئەو پیاوە بێ؟

ئەوەندە ترسابووم جوابم پێنەدرایەوە، سەرێکم بۆ لەقاند یانی با بێ.

مامە رەجەب رۆیشت و منیش سەرێکم لەپەنجەرە بردە دەر دەمەویست رابکەم. بەڵام چۆن؟ بەکوێدا؟ کار لە کار ترازابوو، تازە چار نەمابوو.

هەتا (کابرا) هاتە ژوور نیوەی گۆشتی لەشم بوو بە ئاو. پیاوێکی گەنج بوو. جل و بەرگێکی رێك و پێکی دەبەردا بوو. لە پێکەنین و رووخۆشی‌یەکەی را زانیم پۆلیس نیەو نەختێك ئارام بوومەوە. بەڵام دیسان قسەم نەکرد. راوەستام بزانم چ کارێکی پێمە. زەردەخەنەیەکی کردو گوتی:

ـ ئەمن پەیامنێری گۆڤاری (عصر)م.

ئەگەر گوتبای عیزرائیل ئەوەندە نەدەترسام. ئەمە ئەو بەڵایە بوو کە شار بەشار لەبەری هەڵدەهاتم.

"خودایە بۆ خۆت لەچنگ ئەو هەواڵنووسانەم رزگار بکەی".

وام نیشان دا کە حاڵی نەبووم. ئەویش بەدەست حاڵی کردم:

ـ ئەمن هاتووم لە موسوڵمان بوون و سوننەت کردنی تۆ وێنەو رێپۆرتاژ ئامادە بکەم. وەك بێگانان جوابم دایەوە:

ـ من، باش، تورکی، نازانێ.

خواوڕاستان جەنابی هەواڵنووس لە زمانی زگماکی بەولاوە هیچ زمانێکی دیکەی نەدەزانی و بەلاساکردنەوەی من پرسی:

ـ ئەتۆ. چ ئیختیراع و کەشف. گەورە کردەوە؟

زۆرم پێ‌خۆش بوو بەزمانی خۆمان راست و رەوان وەڵامی بدەمەوەو بڵێم:

"ئەوەم کەشف کردوە ئەو کەسانەی لە هەوەڵەوە موسوڵمان بوون کەس گوێیان ناداتێ. بەڵام بۆ موسوڵمانێکی بە درۆ موسوڵمان هەزاران گەوجی وەك تۆ وەخت و پارەی خۆیان سەرف دەکەن".

بەڵام هەر چۆنێك بوو ددانم بە جەرگی خۆم دا گرت و جوابم دایەوە:

ــ ئـەمن زۆر کەشـف. مـاتۆڕی فڕۆکـەی بێـدەنگ، کەشـتی بـێ دووکـەڵکێش. ئوتومبیلی بێتایەر!.

هەواڵنووس هەر چاوێکی ببوو بە چوارچـاو. لێکدا لێکـدا سـەری رادەوەشـاندو "بارك اللەو ئافەرین"ی وەك بارێزە لەزاری هەڵدەوەرین.

لەو کاتەدا دووکەس هاتنە ژوورو بە دەست حاڵی‌یان کـردم کـە بچـم بـۆ ژووری سوننەت کردن.

بەگورج و گۆڵی رۆیشتم بۆلای ژوورەکەو هەر لە فکـری ئـەوەش دا بـووم چـۆن لەگەڵ وەستای دەلاك دەست بەقسەبکەم و سەروکلکی مەسەلەکە پێك بگرم.

کاتێك وەژوور کەوتم دەبینم بێجگە لە وەستای دەلاك حەوت هەشت کەسی مـل ئەسـتوور و سمـێڵ بـابڕیش لـەوێ دانیشـتوون. بـەجارێك زەنـدەقم چـوو. لـە وەستای دەلاکم پرسی:

ــ ئەمانە. لێرە بۆچی؟

ــ دەبێ لێرە بن دەست و لاقت بگـرن. سـەیرێکی دەرگـام کـردو بەپەلـە وەڕێ کەوتم.

وەستای دەلاك پرسی:

ــ بۆ کوێ؟

ــ بەدەست تێم گەیاند کە لەدەرێ کارم هەیە.

وەسـتای دەلاك دیـاربوو دووسـێ‌یەکی لـەو پیاوانـە لـێدەنگ دابـووم. وەك پاڵـەوانی زۆرخانـە لـێم دەرپـەڕین، دەسـتیان گـرتم و تونـد رایـان گـرتم. وێنەگریاشییش خێرا خێرا خەریکی وێنە گرتن بوو، منیش هەر تەقەلای ئـەوەم دەدا خۆمیان لە دەست دەرباز بکەم. بـەلام کوڕەکـان وەك مـەڕی کـەوڵ کـەن لەعەرزیان هەڵبڕیم.

لە سیمایان وا دەردەکەوت کە دەیانەوێ هەر لەوێ لە نێوەڕاستی ژوورەکەدا سوننەتم بکەن. دەستم بەهاوار کرد.

خەسووم بە پەلەپرووزە وەژوور کەوت گوتی:

ـ مەترسە. هیچ نیە. وەستا دەستی زۆر سووکە. هەر ئێستا نەجاتت دەدا!

گەنجەکان بەراکێش راکێش بردیانم بۆلای تەختێك کە لە سووچێکی ژوورەکە دانرابوو. ئەمن لەهەوا پەلەقاژەم دەکردو وەستای دەلاکیش دڵخۆشی دەدامەوە:

ـ تا ئێستا چل پەنجا تۆ موسوڵمانم سوننەت کردوە، نایەڵم هەر ئاگا بکەی.

هێندەم لەبەر دەستی گەنجەکان دا پەلەقاژە کرد بێهۆش بووم و یەك بەمەیدانێ لێی کەوتم. لەو بێهۆشی و بیخودییەدا گوێم لە غڵدەغڵدێك بوو هەر ئەوەندە حاڵی بووم چەند کەسێك هاواریان دەکرد "سبحان اللە"، "جل الخالق"!

هەموو بۆلای دەرێ رایان دەکرد، منیش نەم دەزانی مەسەلە چیە. هەموو هۆش و بیری خۆم خستە کار بەڵکوو شتێکی لێ هەڵکرێنم.

لە پشت دەرگا کابرای دەلاك بۆی باس دەکردن:

ـ ئەو کابرایە "پەری برە" زگ ماك سوننەت کراوە.

خەزوورم لەخۆشیان هاواری کرد:

ـ خوایە زۆر شوکور.

یەکی دیکە هاواری کرد:

ـ بۆچی شتی وا هەیە؟!

ـ بەڵێ.

زۆرم دڵ پێ خۆش بوو کە وا بەهاسانی لەو خەتەرە رزگار بووم. هەروا فیکەی سمێڵانم دەهات. بەڵام بۆچی بنیادەمی فزوول دیڵێ کەس هەناسەیەکی رەحەت هەڵکێشێ. کابرایەکی حەڵاڵ زادە راست بۆوە گوتی:

ـ رەنگە جوولەکە بێ!

ئەو جوملە وەك تۆپ لەمێشکم دا تەقیەوە. بەتایبەتی چونکە چەند کەسی دیکەش بۆیان ئەستاندەوە:

ـ بەڵێ رەنگە.

دیسان خوا ماڵی کابرای دەلاك ئاوەدان کا کە جوابی دانەوە:

ـ ئەمن ئێستا هەموو شتێك روون دەکەمەوە.

تێ گەیشتم دیسان خەریکن هێرش بێننەوە. پێش ئەوەی بێنە ژووری خۆم دەخەو کرد.

ئەمجارە کابرای دەلاك بەتەنیا هاتە ژوور. دیتم لەوە زیاتر ناکرێ راوەستم. بە زمانی خۆمان و زۆر لەسەرەخۆ گوتم:

ـ تکات لێ دەکەم دەرگاکە توند پێوەدە، دەنگمان نەچێتەدەر.

کابرای دەلاك گێژو کاس بوو. هەقیشی بوو، کەسێکی تا ئێستا ئەڵمانی بوو و زمانی تورکی نەدەزانی، لەپڕ گۆڕابوو. خەریك بوو لەبەرم هەڵێ، بانگم کرد:

ـ مەترسە بابە، خۆ ناتخۆم. وەرە پێش کارم پێتە.

پاشان زوو ئەو پەنجا لیرەی بۆم وەلا نابوو لە گیرفانم دەرهێناو بۆم راگرت:

ـ وەرە ئەم پارەیە بگرەو پەڕۆیەکیشم پێ ڕا بەستەو کارت بەکاری من نەبێ.

کابرای دەلاك زەردەیەکی هاتێ:

ـ ئەی قوماریاز. باشت رێگاکە دۆزیەوە.

پارەکەی خستە گیرفانی:

ـ دەبێ نەختێك هاوار کەی تا وا بزانن سوننەتت دەکەم. لەسەرەخۆ قیژاندم.

ـ نەبوو. بەقەوەتتر.

هەتا قەوەتم تێدا بوو نەڕاندم:

ـ ئەی بابەڕۆ مردم!

لەسەر جێگاکەم درێژ بووم و کابرای دەلاکیش دەرگای کردەوە:

ـ تەواو بوو.

وێنەگرو هەواڵنووسەکان بەژووریّ وەربوون و فلاش دەستیان بە بریسکە بریسك کرد. زۆر پرسیاری سەیر سەیریان دەکرد خۆم بێهۆش کردو ئەسڵەن جوابم نەدانەوە.

بەو حاڵەش خەبەرەکە وەك تۆپ لەشاریدا دەنگی دایەوە. پێم وانیە قەت هێندەی ئەو رۆژە رۆژنامە فرۆشرابێ.

وێنەکانی منیان لە لاپەڕەی یەکەم دا چاپ کردبوو و تیتری سەیرو سەمەرەشیان نووسیبوون:

" لاوێکی ئەڵمانی موسوڵمان بوو". "جێژنی سوننەت کردنی پرۆفیسۆری بەناوبانگی ئەڵمانی بەخۆشی و شادمانییەوە تەواو بوو". "بزووتنەوەیەکی گەورە کەلە دنیای ئیسلام دا رووی داوە".

بەو جۆرە خەریك بوو چەرمەسەرییەکی گەورە بۆمن پێك دەهات و سات بەسات چاوەڕوانی ئەو بەدبەختییە تازەیە بووم. هێشتا رۆژئاوا نەببوو کە چەرمەسەرییەکە دەستی پێکرد. چوار پۆلیس هاتنە ماڵەکەو لەمنیان پرسی. هەر لەگەڵ هاتنە ژوورەکەی من هێندێکیان گاڵتە پێکردم و بە پێکەنینەوە:

ـ هەستە پێ!

ـ زووکە جلەکانت لەبەرکە!

کەلەپچەیان لە دەستی کردم و لـەپێش چاوی پـڕ لەسەرسـوڕمانی خـەزوورم و ئاسیەو دراوسێکان بردیانمە دەرێ.

ئاسیە پاڵی وەدیوار دابوو و لەسەرەخۆ دەگریا، خەزووریشـم وەك كارەبـا لێـی دابێ وشك هەڵاتبوو. دراوسێکانیش کەوتبوونە سرت و خورت:

ـ ڕەنگە جاسووس بووبێ.

ـ ئەمن هەوەڵ ڕۆژ زانیم.

ـ سەگبابانە کاری چۆن دەکەن!!

ـ درۆی کردوە ئەڵمانی نەبووە.

ـ بەڵێ حەتمەن ئینگلیزییە.

یەکسەر بردیانم بۆ پۆلیسـخانەو چـونکە وەخـت درەنـگ بـوو بۆلـێپرسین لـە ژوورێکی تەڕو تاریك فڕێیان دام.

سبەینێ بـەیانی بـۆ لـێپرسینەوەی مـن هـەراو هەنگامەیـەکی زۆر سـاز ببـوو. دیسان وێنەگرو هەواڵنووسەکان باسێکی باشیان وەدەست کەوتبوو. وێنەگرتن دەسـت پـێکراو هەرچـی هـەوڵم دەدا سەروچـاوم بشـارمەوە پۆلیسـەکان چەنەگەیان دەگرتم و سەریان ڕاست ڕادەگرتم.

سەرۆك لێی پرسیم:

ـ سەگی سەگباب ئەو کەلەکبازییانە چین دەیان کەی!

ـ ئەمن خەتایەکم نیە.

سەرۆك جووتە زللەیەکی لێدام کە گڕەشینکەم لەچاوان هەڵستا.

ـ ئەدی کێ خەتابارە؟ سەگبابی کەڵەکباز بۆچی خۆت بە ئەڵمانی بـەو خەڵکـە نیشان دا بۆچی؟! ها؟

ـ جەنابی سەرۆك مەگەر ئەڵمانی بوون لە قانوون دا تاوانە.

سەرۆك شتەکەی بە کورتی بڕیەوە. دووکەس لەلای سەرەوە دانیشتبوون دەستی بۆ راداشتن:

- برایان تاوانبار لەبەردەستی خۆتان دایە.

ئەو دووکەسە کە دوایە دەرکەوت پۆلیسی دژی تاوانن و لە ئەستەمبووڵەوە هاتوون، دەستیان کرد بە لێپرسین:

- باشتر وایە راستمان پێ بڵێی مەبەستت لەو کارە چ بووە؟ تەواوی باسەکەم لەسیرێ هەتا پیوازێ بۆ گێڕانەوە.

هەموویان پێکەنین. دیاربوو باوەڕیان بەقسەکانم نەکردوە:

- هەروا سووك و هاسان خۆت کردە ئەڵمانی بۆ ئەوەی جەمەنانێك پەیدا بکەی؟

- باوەڕ بکەن هیچ نیازێکم نەبوو... خەریك بوو لەبرسان بمرم.

- پیاوی باش لەم وڵاتەدا کێ لەبرسان مردوە هەتا تۆ ببیە دووهەم!؟!

نەمدەزانی چ جوابێك بدەمەوە. مەسەلەکەیان گەیاندبووە جێگایەك هەر جوابێکم دابایەوە لانی کەم دەپازدە ساڵ حەپسیان بەباڵا دەبڕیم. ناچار بێدەنگ بووم.

یەکێك لە فەرمانبەرەکان بانگی کرد خەزوورم و ئاسیە بۆ بەرەڕوو کردن بێنە ژوور. دەستم کرد بە پاڕانەوە:

- جەناب! ئیعدامم کەن، بم نێرنە بەندیخانە بەڵام تووشی شەرمەزاریم مەکەن.

بەراستییش وابوو. چونکە رووم نەبوو چاو لەچاوی مامە رەجەب بکەم کە بەوپەڕی دڵپاکییەوە بردبوومیە ماڵی خۆی. بەڵام چارە نەبوو. خەزوورم کاتێك هاتە ژوورێ راستەڕێ بەرەو من هات. لەپێشم ڕاوەستا زۆر بە رقەوە تەماشایەکی بەژن و باڵای کردم:

ـ تف لەرووانت. حەرام زادەی بێئەمەك. هەی بێشەرەفی بێئابڕوو...

ئەگەر فەرمانبەرەکان نەیان گرتبا هەر لەوێ دەیخنکاندم.

پۆلیسەکە لێی پرسی:

ـ ئەتۆ شکایەتت لەو کابرایە هەیە؟

ـ بەڵێ. خوا کوێری کا، ئابڕووی منی بردوە. سێهەزار لیرەم بۆ خەرج کردوە.

دەبێ هەموو زەرەرو زیانەکەم بۆ ببژێرێتەوە.

پاشان ئاسیەیان هێنا.

ئەو کچە بەستەزمانە ئەوەندە گریابوو چاوی سوور هەڵگەڕابوون.

پۆلیس لێی پرسی:

ـ کچم تۆش شکایەتت لەم کەڵەکبازە هەیە؟

ـ نا.

مامە رەجەب بەسەر سوڕمانێکەوە تەماشای کچەکەی کرد:

ـ ئەتۆ شکایەتت نیە؟

ـ نەخەیر چی کردوە تا شکایەتی لـێ بکەم؟

ـ بۆ دەتەویست چ بکا؟ لەوە زیاتر کە کڵاوی لەسەر ئێمە ناوە؟

ـ ئەو بێتاوانە.

ـ دایکت دەڵێ گوارەو بازنەی تۆشی دزیون! و ویستوویەتی فریوت بدا.

ـ درۆیە! ئەو قەتی قسە لەگەڵ من نەکردوە. ئێوە دەتانەویست منی بدەنێ!

لەوەفای ئەو کچە سەرم سوڕمابوو. کوڵی گریـانم لـە ئـەوکی مـابوو بـۆ ئـەوەی

فرمیسکی چاوانم نەبینێ رووم دەلای دیواری کرد.

مامە رەجەب بەزۆر قسەی کچەکەی بڕی:

ـ ئەمە تێناگا... منداڵە... فریوی خواردوە.

پاشانیش ئاسیەی بردەدەر. لەکەلێنی دەرگاوە هەراو هوریایەکی سەیر هاتە ژوور دەتگوت هەموو خەڵکی شاری بۆ شکایەت کردن هاتوونە پۆلیسخانە.
یەکێك دەیگوت "هەزار لیرەی لەمن وەرگرتوە" ئەوی دیکە دەیگوت "سەد لیرەی لەمن قەرز کردوە".
لە کاتێك دا هیچیانم نەدەناسی و چاوم بەچاویان نەکەوتبوو.
لەبەر ئەوەی تاوانەکەم زۆر بوو و لێم بەشك بوون، بڕیار درا لەگەڵ چەند فەرمانبەری چەكدار بەڕێم بکەن بۆ ئەستەمبووڵ.
لە ئەستەمبووڵیش زۆر خێرا دۆسیەکەم تەواوکراو لە پلیکانەکان چوومە "خوار".
لەبەندیخانە هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە پاش بەرەڵلابوون کارێکی موحتەرەم بدۆزمەوەو وریا بم بەتەڵەوە نەبم!
ڕۆژێکیان بەندیەکی "ناشی"یان هێنایە لای ئێمە. وەزعی ئەو لەگەڵ بەندی-یەکانی دیکە فەرقی هەبوو. لە ڕواڵەتی و لەسیمای هێدی و بە ویقاری ڕا دەردەکەوت کە "لەوانە" نیەو یەکەم جاریەتی کە هاتۆتە بەندیخانە. زۆر زوو بووینە ئاشنا. ناوی "واسیل"و بازرگانی بازاڕبوو.
زەیتوون و ڕۆن زەیتوونی دەفرۆشت. هەر لە هەوەڵ ڕۆژەوە کە هاتە بەندیخانە سەری کیسەکەی کردەوەو وەك خاك و خۆڵ پارەی خەرج دەکرد.
منیش پاروووم دەڕۆنی کەوت و خواردن و خۆراکم ڕێك و پێك بوو. شێوو نیوەرۆیان لە ماڵێ ڕا بۆدێنا. ئێستاش کەئێستایە تامی خواردنە خۆشەکانی لەبنی ددانم داماوە ! !
هەرچی لێم پرسی تاوانی چیە هیچی نەگوت. بەلام ئەمن لەسەرێ تاپیوازێ بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە. "واسیل" ئادرەسی خۆی دامێو گوتی:

ـ هەر کاتێك بەرەڵلاّ کرای وەرە لای من کارم پێتە.

ـ هەر چەند ناکرێ باوەڕ بەو بەڵێنانە بکەی کە بەندی‌یەکان پێکی دەدەن، بەڵام چارەم نەبوو ئادرەسەکەم لێ وەرگرت و پاش سێ‌مانگ بێ تەکلیفی کە لە بەندیخانە دەرچووم راستەڕێ چوومە لای واسیل.

واسیل زۆری بەخێر هێنام. دوکانی لە شەقامێکی گەورەی ئەستەمبووڵ بوو. لەدوکانەکەی دا تەنەکە رۆن زەیتوون هەتا بن میچی لەسەرێك دانرابوون.

واسیل سەد لیرەی وێ دام و گوتی:

ـ برۆ سێ رۆژی دیکە وەرەوە دەست بەکار بکە.

چونکە لەمێژبوو لەگەڵ پیاوێکی باش و ڕاست و دروست بەرەوڕوو نەببووم، ئەو کارەی واسیلم زۆر پێ‌سەیربوو. باوەڕم نەدەکرد کە لە دوکانەکەی خۆی دا کارم بداتێ.

بەڵام راست بوو. ئەمن بەناوی ژمێریار لە دوکانەکەی دا دەست بەکار بووم. دووسێ‌مانگ رابورد. رۆژ لە رۆژ زیاتر لە کارەکەم دا سەرڕاست دەبووم. هەموو کارەکان فێر ببووم.

ئیتر نیازم بەوە نەبوو واسیل فەرمانم پێ‌بدا بۆخۆم ئەرکی خۆم بەباشی بەجێ دەگەیاند.

زۆر دڵخۆش بووم کە ژیانم سەروسامانێکی پەیدا کردوەو منیش دەتوانم وەك خەڵکی دیکە بەبێ ترس و لەرز پارووە نانێك بخۆم و شەوانەش بە ئاسوودەیی بنووم.

رۆژێکیان واسیل بانگهێشتی کردم. خواردنێکی زۆرو باشی بۆ ساز کردبووم. مریشك، ماسی و پلاو خۆرشت و مرەبای هەمە چەشنە. پاش نان خواردن واسیل گوتی:

ـ لەو ماوەیە دا تۆم لە هەموو بارێکەوە تاقی کردەوە. بۆم دەرکەوت بە ڕاستی جێگای باوەڕی.

لە خۆشیان حاڵم نەبوو: "بڕوانە، پیاو ئەگەر راست و دروست بێ چەند زوو حورمەت پەیدا دەکا؟ خۆزگە ئەو برادەرە کە دەیگوت لەم وڵاتە دا هیچ کەس بەڕاستی و دروستی چی بۆ ناکرێ، ئێستا لێرەبایەو زانیبای واسیل چەندەم لێ رازی‌یە!".

واسیل لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

ـ من دەمەوێ پاداشتی پاکی و ڕاستی تۆ بدەمەوەو دوکانەکەم بدەم بە تۆ.

پێم وابوو ئاغا یان گاڵتەم پێ دەکا یان دیسان دەیەوێ تاقیم بکاتەوە. بەشەرمەوە جوابم دایەوە:

ـ دوکان پیرۆزی خۆتان بێ. من هەمیشە خزمەتکاری تۆ بووم و هەر خۆم بە خزمەتکار دەزانم.

واسیل تێم گەیشت:

ـ بە گاڵتە واناڵێم. بەڕاستی بڕیارم داوە دوکانەکەم بدەم بە تۆ!

ـ ئاخر لەبەر چی؟

ـ بە تەواوی باوەڕم بەتۆ هەیە. منداڵەکانم زۆر ئەبلەخەرجن. باوەڕ بە زاوایەکەشم ناکەم. چونکە نیازیشم هەیە ماوەیەك بە سەفەر بچم دەمەوێ لە کارو بارەکانت دا سەربەست بی و سەربەخۆ بتوانی کار بکەی.

ـ دیارە من تەنیا چاوەدێری دەکەم.

زۆری قسە کرد نەمتوانی لە نیازی دڵی حاڵی بم و بزانم ئەو کارە قازنجی بۆ ئەو چیەو بۆ من چی! چونکە ئەمن هەر وەك جاران مووچەخۆر بووم و هەموو قازانجەکە هەر بۆخۆی دەبوو.

واسیل گوتی:

ـ بۆ ئەو مەبەستە مانگی ٥٠ لیرە لە مووچەکەت زیاد دەکەم. تۆش دەبێ لەبەر زمانی خەڵك و پێشهاتی زەمانە سەنەدێکی دەهەزار لیرەییم بدەیەی، نەوەك خوا نەکا وەختێك شەیتان بە فریوت بەرێ.

هەرچی بیرم دەکردەوە ئەو کارە مانای چیەو واسیل بۆچی دوکانی خۆی دەدا بەمن سەرم لێ دەرنەدەکرد.

باشم دەزانی ئەو ماستە بێموو نیەو کەڵەکێك لەکاردایە، بەڵام نەمدەزانی مەسەلە چیە. ئاخر من دەسمایەیەکم نەبوو کە لە دەستم بچێ. بەڕواڵەتیش ئەو سەودایە عەیبێکی نەبوو. بە تایبەتی کە مانگی ٥٠ لیرەشم زیادی وەردەگرت.

"لەسەر خوای" پیاو نابێ دەست بە رزقی خۆیەوە بنێ. سبەینێ بەیانی چووینە دەفتەرخانە دوکانەکەی بەشەش هەزار لیرە پێفرۆشتم و لە جیاتیان سەنەدێکی دەهەزار لیرەیی لێوەرگرتم و بەڕواڵەت من بوومە خاوەنی دوکانەکە.

دەسبەجێ تابلۆی دوکانەکەم هێنایە خوارو تابلۆیەکی تازەم بەناوی "تجارتخانەی اعتماد فرۆشیاری ڕۆن زەیتوون" لەجێگا هەڵواسی.

دراوسێیەکەمان حاجی ساڵح ناوێك بوو کە ئەویش هەر بازرگانی ڕۆن زەیتوون بوو. ئەو ڕۆژە کاتێك واسیل بۆ نانی نیوەڕۆ چۆوە، حاجی ساڵح هاتە لام و پرسی:

ـ لە جیاتی فرۆشتنی دوکانەکە چەندی مووچە بۆ زیاد کردووی:

ـ مانگی ٥٠ لیرە!

ـ پیوو! بەخوا بابە کڵاوی چاکی لەسەر ناوی. ئەگەر دووکانەکەی منت قبووڵ بکردایە مانگی ٥٠٠ لیرەم دەدایەی.

گێژو کاس بووم. پرسیم:

ـ چۆنی کڵاو لەسەر ناوم؟

ـ لە دوای چووان نەچی باشە. ئێستا ئەگەر دوکانەکەی منیش قبـووڵ دەکـەی مانگی ٥٠٠ لیرەت دەدەمێ:

ـ باشە بۆچی ئێوە دوکانەکانتان دەدەن بە من؟

قاقایەکی درێژی کێشا:

ـ پیاوێکی ساف و ساویلکەی یان گاڵتەم پێدەکەی؟

ـ بۆچی گاڵتەت پێدەکەم؟

ـ بۆخۆت دوایە تێدەگەی.

ئەوەندەی گوت و لە دوکانێ وەدەرکـەوت. دڵـم وە دەغدەغـە کـەوت: "خوایـە گیان ئەمجار چ بەدبەختی‌یـەکم بـۆ پەیـدا بـووە؟ بۆچـی خـەڵك نایـەڵێ رۆژێـك ئاسوودە بم؟ ئاخر من چ خەراپەیەکم بۆ ئەو خەڵکە بووە کە هەر کەس تووشم دەبێ دەیەوێ توشی چۆتمەیەکم بکا؟".

چەند رۆژ دواتر واسیل گوتی:

ـ سبەینێ دەبێ لە (مناقصە)یەك دا بەشدار بین.

لەپێش دا زۆرم ئاگاداری (مناقصە) لە رۆژنامەکان دا خوێنـدبۆوە. بـەڵام گـوێم نەدەدانێ و کارم بەو کارانە نەبوو. پرسیم:

ـ چ (مناقصە)یەك؟

ـ (مناقصە)ی رۆنی سەربازخانەکان.

ـ ئێمە و ئەو کارە گەورانە؟

واسیل پێکەنی:

ـ نان لەو جۆرە کارانەدایە. ئەتۆ تێی ناگەی!

ـ ئەمن شارەزا نیم، نازانم چ بکەم!

ـ پێکەوە دەچین، ئەتۆش وردە وردە شارەزای کارەکان دەبی!

سبەینێ چووینە ناو کومیسیۆن. بێجگە لەئێمە چەند کەسی دیکەش هاتبوون کە زۆربەیانم دەناسی.

حاجی ساڵحی دراوسێشمان یەکێك لە بەشدارەکان بوو.

پرسیارنامەی (استمارە) مناقصەکەیان خستبوە پاکەتەوەو سەریان داخستبوو. دەبوو لە ماوەیەکی دیاری کراودا ٣٠ تەن رۆن تەسلیم بکەین. هەر کەس هەرزانتری دابایە ئەو سەر دەکەوت.

ئەودەم کیلۆی رۆنمان بە ١٢٠ قرۆش دەکڕی و بە ١٥٠ تا ١٦٠ قرۆشمان دەفرۆشتەوە.

بیرم کردەوە ئەگەر ١٣٠ قرۆشیش بنووسم لە هەموو سەودایەکەدا ١٥٠ هەزار لیرە قازانج دەکەین و یەکەم پایەی میلیۆنێرییەکەم دادەنێم.

بەراستی چارەنووس چۆنە. بۆیە دەڵێن: "رێوییەکی گەڕاو لە شێرێکی نوستوو باشترە".

من لە رۆژی هەوەڵەوە هەر بیرم لەوە کردۆتەوە کە رۆژێك ببمە میلیۆنێر. ئێستا پاش ئەو هەموو هەورازو نشێوو دەردو بەڵایە خەریك بوو شانسم هەستێتەوە.

واسیل لە تەنیشتم دانیشتبوو پرسی:

ـ دەتەوێ چەندی بنووسی؟

ـ کیلۆی ١٣٠ قرۆش.

ـ مەگەر شێت بووی؟

پێم وابوو کەمم گوتوە:

ـ ١٤٠ قرۆش چۆنە؟

واسیل بە گاڵتەوە پێم پێکەنی.

هەموو دەوروبەرەکەمان تێ گەیشت و منیش زۆر تەریق بوومەوە:

ـ ئەگەر ئێمە نرخەکە زیاد بنووسین ئەوانی دیکە دەیبەنەوە.

ـ هەشتا قرۆش بنووسە!

پێم وابوو مەبەستی ١٨٠ قرۆشە. گوتم:

ـ پێم وایە ١٨٠ قرۆش یەکجار زۆرە!

چاوی لێ دەرپەڕاندم:

ـ سەدو هەشتای چی. هەشتا قرۆش بنووسە.

ئێستا نۆرەی من بوو پێم سەیر بێ:

ـ چۆن شتی وا دەبێ ئێمە بە ١٢٠ قرۆش دەیکڕین!

ـ ئەتۆ بنووسە. هەقت نەبێ!

وەك بۆخۆم خاوەن ماڵ بم قەڵەمم لەسەر کاغەز هەڵگرت!

ـ زۆر زەرەر دەکەین.

ـ ئەتۆ بنووسە خەمت نەبێ!

مشت و مڕەکەمان لەوەی دەرچوو، واسیل گوتی:

ـ ئەتۆ بەڵێنت داوەو دەبێ بنووسی؟

بە دەنگێکی بەرز گوتم:

ـ ئاخر پیاوی ئاقڵ چۆن بە دەستی خۆی ماڵی خۆی دەئاوێ دەکا؟

ـ بابە ئەمن زەرەر دەکەم بەتۆ چی؟

ئەو قسەی بەجێبوو. هەرچەند دەستم بۆی نەدەچوو بە ناچاری کیلۆی هەشتا قرۆشم نووسی و لەپاکەتم هاویشت. کاتێك پاکەتەکانیان کردەوە ئەمن بردبوومەوە.

مەبلەغێکمان وەك (کفالت) دا بە سندووق و وەسڵمان وەرگرت.

خەڵکەکە پیرۆزبایی‌یان لە واسیل کرد. یەکێکیان پێی گوت:

ـ ئەگەر ئەمنیش شێرەپیاوێکی وەك "فەرید"م بوایە لە جیاتی ۸۰ قرۆش چل قرۆشم دەنووسی.

هیچ سەرم لەو قسانە دەرنەدەچوو. کە لە کومیسیۆن هاتینەدەر لە واسیلم پرسی:

ـ تو ئەو خودایە پێم بڵێ چۆن پیاو شتێکی بە ۱۲۰ قرۆشی کریبێ بە ۸۰ قرۆشی دەداتەوە؟

ـ ئەوە بە قسە نابێ. دوایە بۆخۆت تێدەگەی.

ـ ئەوە خۆ مەسەلەی "ئەتۆم" نیە. ئەو سەودایە کیلۆی ٤٠ قرۆش زەرەر دەکا.

ـ زەرەر ناکا بەڵام قازانجی کەمە!

دەستمان کرد بە رۆن تەحویل دان. بەڵام هەموو کیلۆیەك دەریایەکی زەرەر دەکرد.

هەرچی دەمکرد سەرم لەو سەودایە دەرنەدەچوو ئەو مەتەڵەم بۆ هەڵنەدەهات.

رۆژێك واسیل هێندێك پەتاتەی کڕی. کە فەردە پەتاتەکانمان دەبردە ژووری عەمبارێ پرسیم:

ـ ئەمانە بۆچیە؟ پێکەنی و گوتی:

ـ دەمەوێ تجارەتی پەتاتە بکەم.

وەسبەی شەوێڕا بە لۆری پەتاتەیان هێنا بۆ عەمبار.

دەتگوت ئەو پەتاتانە لەسەر سەری من کەڵەکە دەکەن خەریك بوو مێشکم بتەقێ. لەدڵی خۆم دا دەمگوت:

" ئاخر ئەو هەموو پەتاتەیان لەکوێ بۆ تاقەت دەکرێ؟!"

هەر چەند قەدەخە بوو من بێمە عەمباری ڕۆژێکیان بێ پرس وەژوور کەوتم و هەموو شتێکم بۆ روون بۆوە:

کوڕەکەی واسیل پەتاتەکانی لە مەنجەڵی گەورە گەورەدا دەکردنە هەویرو پاشان هێندێ شتی تریشی تێدەکردن و لەگەڵ ڕۆنەکان لێکی دەدان.

ئەوەندەم دەزانی ئەو کارە تاوانەو ئەگەر پێبزانن دەمارمان دەردێنن. گوتم:

ـ کاکە گیان! ئەمن شتی وام قبووڵ نیە. ئەگەر بمویستایە ئەو فرت و فێڵانە بکەم ئێستا لە جێگایەکی دیکە بووم!

واسیل لە پێشدا نەختێك تێك چوو، پاشان زۆر هێدی جوابی دایەوە:

ـ ئەمە چ فێڵێکی تێدایە؟!

ـ بۆچما فێڵ کلك و گوێی هەیە. پەتاتە لەجیاتی ڕۆن بفرۆشی، فێڵ نیە؟!!

ـ نا... ! پەتاتە بۆ لەشی بنیادەم زەرەری نیەو زۆریش قازانجە...

کوڕەکەی واسیل دەستی بە تاریفی پەتاتە کرد:

ـ ئەو گیا چاکە نشاستە...و رادەیەکی زۆر ڕۆن و... واسیل لەدەمی قۆزتەوەو گوتی:

ـ ئەوە گرنگ نیە، ئەڵمانیەکان لە خەڵووز گۆشت دروست دەکەن. لە ئێسك شەکر سازدەکەن و تەختەی دەکەن بە ئارد.

دەتگوت باب و کوڕ بۆ پێسەلماندنی من پێش برکەیان کردوە چونکە کوڕەکە قسەکەی لەبابی وەرگرتەوە:

ـ ئێستا کە زانستی کیمیا گەیشتۆتە ئەو پایەو پلەیە ئێمە بۆ کەڵکی لێ وەرنەگرین؟

قسەکانیان لەباری زانستی‌یەوە راست بوون، خەریك بوو کەم کەمە تەسلیم دەبووم، واسیل کە دیتی نەرم بووم تۆزێکیشی قەرزدار کردمەوە:

ـ ئێمە پیاوی بە شەرەفین! رزقی خەراپ نادەین بە خەڵك. ئەگەر بازرگانەکانی دیکە ئەو مناقصەیان بردبایەوە نازانی چیان دەرخواردی سەربازەکان دەدا. ئێمە پیاوی چاکین و لەترسی خودا تووشی گوناح نابین.

پرسیم:

ـ چما دەکرێ چی دیکە لەگەڵ رۆنی لێك بدەن؟

سەری راوەشاندو دەنگێکی تایبەتی لە زاری هاتەدەر :

حەی... ! نازانی خەڵك لە گڵەسپی و وازلین رۆنی دروست دەکەن. هەر ئەو حاجی ساڵحە وەختێك رۆنێکی دروست کردبوو هەر کەس خواردبای لە پیاوەتی دەکەوت. هەموو پزیشکە گەورەکانی دنیا هاتنە لای "فورمول"ی ئەو دەرمانەیان بداتێ. بەڵام فەقیرە بۆ خۆشی لە بیری نەمابوو چی لەگەڵ رۆنەکە کردوە ئەگەر لەبیری مابایە دەبوو بە میلیۆنێر...

کوڕی واسیل بە خۆڕانانەوە گوتی:

ـ بەڵام کاری ئێمە لە رووی حیسابەوەیەو هەرچی تێکەڵی رۆنەکەی دەکەین دیارە.

واسیل بۆی ئەستاندەوە:

ـ ئێمە مرۆڤی بە شەرەفین! ئەگەر باوەڕ ناکەی بڕۆ ناو بازاڕ بپرسە داخوا ئیعتیبارو شەخسیەتمان لەلای خەڵك چۆنە. لیرەیەك بە هیچ کەس قەرزدار نین! ٣٠ ساڵە لە بازاڕم تا ئێستا جارێك چیە سزام بۆ دەرنەچووە. گوتم:

ـ ئەوانە هەموو راستن بەڵام:

ـ بەڵام چی؟

ـ کڕیار دەزانێ کە ئێوە پەتاتەی لەگەڵ رۆنەکەتان دەکەن؟

واسیل و کوڕەکەی بە دەنگێکی بەرز پێکەنین:

ـ پێم وانەبوو ئەوەندە ساویلکەی. چۆن نازانی؟ مەگەر شێتە کە نەزانێ رۆنی ئێمە ساخ نیە؟

ـ بە چ ڕا دەزانێ؟

ـ چاوەکەم!

ئەوانە حەتمەن رۆنی دەکڕن و دەزانن کە رۆنی ساخ کیلۆی بە دوو لیرەش نادەن. کەوابوو هۆی چیە! کە ئێمە بەهەشتا قرۆشی دەدەین. بێ گومان ئارد و پەتاتەو شتی وای لەگەڵ دەکەین دیسان خوا ماڵمان ئاوەدان کا کە رۆن گریسی تێناکەین!

دیتم راست دەکا خۆ نابێ زەرەر بکا. پرسیم:

ـ باشە بۆ ئێمە ئەو نرخەمان نووسی؟

ـ کارت بەو کارانە نەبێ. لە سبەینێ ڕا بێجگە لە مووچەکەی خۆت بەشێك لە قازانجی رۆنەکەش وەرگرە...

ناچار بێدەنگ بووم، بەڵام دڵم رازی نەدەبوو دەست لەو کارە هەڵبگرم. دەمزانی ئەگەر دەنگی لێبێ قازانجی نیە کە هیچ، هەزار گیرو گرفتیشی لێ شین دەبێ کە پێش هەموویان بێکاربوونی منە.

پاش ئەو ڕۆژە واسیل هەموو ڕۆژێ لیستەی حیسابەکەی بۆ دێنام. ئەو ڕۆنانەی هەفتەی پێشوو تەسلیم مان کردبوون ساخ بوون و پێنسەد لیرەمان زەرەر کردبوو. هەروا هەفتە بە هەفتە ڕادەی پەتاتەکە زیاتر دەبوو زەرەرەکەی پڕ دەکردەوە.

واسیل گوتی:

ـ دەبینی ئێمە بەبێ ئاگاداری تۆ هیچ کارێك ناکەین. دەوەرە ئەم لیستانە ئیمزا بکە.

نەختێك دڕدۆنگ بووم. نەمدەویست ئیمزا بدەم، واسیل پێکەنی:

ـ ئێمە لە تۆ دڵنیابووین تجارەتخانەیەکی وا گەورەمان دایە دەست تۆ. تۆش باوەڕت بە ئێمە هەبێ وەرە ئیمزای بکە...

بریا دەستم شکاباو ئەو ئیمزا سەگباب خێوەم بەو لیستانەوە نەنابایە...

واسیل بە ئیمزاکردنەکەم زۆری کەیف ساز بوو:

ـ دەزانی تا ئێستا هیچ قازانجمان نەکردوە .بەڵام دیارە لەمەودوا باش دەبێ...

❋ ❋ ❋

فەرید ئەوەندەی قسەی کردبوو کەفی دەپڕژاند. لەمێژ بوو لەسەریەك بۆی دەگێڕامەوە.

جگەرەیەکی داگیرساندو چاوی بڕیە چاوی من:

ـ ڕەنگە باوەڕ نەکەی کە هەرچی تا ئێستا گوتوومە لە دووخێ ڕاست ترە. ڕەنگە پێت وابێ من لەدڵ دا ئەو پیاوە ڕاست و دروستە نەبووم کە ئیدیعا دەکەم و ئەو سەودایەی واسیلم پێخۆش بووە. نا... بە خودای هیچ لەو پێشهاتە ڕازی نەبووم. بەڵام قسەکانی واسیل جۆرێك بوون کە هەموو کەس

باوەڕی پێدەکردن و فریوی دەخوارد. ئەو جۆرە کەسانە کارەکانی خۆیان باش دەزانن. ئەگەر یەکێك پێیان بڵێ بێشەرەف ورگی دەدڕن.
ئەوانە ئینسانی بە شەرەفن! لەبازاڕلەلای هەموو کەس خاوەن ئابڕوون، شەخسیەتیان هەیەو خەڵکی دیکەش هەرچەند دەیان ناسن ڕێزیان لێدەگرن.
ئەوانە سەریان بچێ نوێژیان ناچێ!
بەرەبەرە کار لە پەتاتە ترازا. پیوو دووگیشی لێ زیاد بوو. ئەو ڕۆنەی تەسلیم دەکرا سەدی هەشتای شتی دیکە بوو. تێمابووم. هیچ ڕێگای دەربازبوونم نەبوو. چوومە لای کوڕی حاجی ساڵح و بەدزی باسەکەم تێگەیاند. دەمەویست شتێکی لێ فێربم و ڕێگایەکم بۆ دابنێ.
کوڕی حاجی ساڵح دەستی کرد بە پێکەنین:
ـ خوا بکا ئاخری خێربێ!
ـ مەسەلەن چ دەبێ؟
ـ هیچ!
ـ نا، بەراستی نەکا کارەکە پیس ببێ؟
ـ پێم بڵێبزانم چەندە " هەق " وەردەگری؟
هەتا ئێستا داهاتێکم نەبووە بەڵام لەمەودوا...
قاقایەکی درێژی کێشا:
ـ ئیشەڵڵا چاك دەبێ بەڵام هێندەش ساویلکە مەبە.
لەقسەکانی کوڕی حاجی ساڵحی زۆر ترسام. قسەکانی زۆریان مانا تێدابوو. بڕیارم دا لەگەڵ واسیل لەبەرێکی دەرکەم "هەرچی بێ بێکاری لەو دزی و فرت و فێڵە باشترە".

بەڵام فریای ئەوەش نەکەوتم. کوڕی حاجی ساڵح کە مەسەلەکەم بۆ باس کردبوو ڕاپۆرتی بەکاربەدەستانی سوپا دابوو. ڕۆژی دواتر منیان بەناوی بەرپرسیاری دوکان و تەرەفی موعامەلەی سوپا گرت و یەکسەر ناردیانمە بەندیخانە.

لەپاش ئەو ڕۆژە تەنیا جارێك چاوم بە چاوی واسیل کەوتەوە ئەویش لە دادگا بوو، چونکە ئەویش سەنەدەکەی منی نیشان دابوو. ناچاریان کردم دوکانەکەی بدەمەوەو سەنەدەکەم وەرگرمەوە.

نازانی ڕۆژنامەکان چەندیان وێنەو مەبەستی سەیرو سەمەرە لە بارەی منەوە بڵاو کردەوە. ئەفسەری ساختە، موسوڵمانی ساختە... بازرگانی ساختە... بە کورتی بوختانێك نەبوو کە بۆیان هەڵنەبەستبم. بەو حاڵە چۆن دەکرا بڵێم بێ تاوانم؟!

بە هەر کەسم دەگوت واللە باللە بێ تاوانم پێم پێدەکەنی "جارێك فریوت خوارد... دووجار بە هەڵە چووی... ئەوانی تر چی؟".

بە ڕاستیش وابوو، بەڵام بەدبەختی یەك لە دوای یەك دەهاتن نارەحەتی و پەریشانییەکەم گەیشتبۆ رادەیەك کە دەمارەکانم (اعصاب) باشیان کار نەدەکرد.

خۆم لە بەندییەکان دوور رادەگرت. هەمیشە لەگەڵ خۆم قسەم دەکرد. لەژووری، لە حەوشەی... دەستم هەڵدەوەشاندو لەگەڵ ئەو کەسانەی ببوونە هۆی چارەڕەشی من بەشەڕ دەهاتم.

هێندێك جار هۆشم دەهاتەوە سەر خۆم و خۆم ڕاگیر دەکرد، بەڵام سەر لەنوێ تێك دەچوومەوە.

کار گەیشتە جێگایەك کە شەوانە لە خەویش دا هەر بەزم و هەرام بوو و لەخۆوە هاوارم دەکردو دەنگی سەیر سەیرم لە گەرووی دەهاتن.

ڕۆژەکانی هەوەڵێ بەندییەکان پێم پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکردم، بەڵام دوایە حەوسەلەیان بەسەرچوو و شکایەتی سەرۆکی بەندیخانەیان لێکردم.

هەموو شەوێ ژوورەکەیان دەگۆڕیم و لە هیچ قاوشێك دا شەوێك زیاتر نەدەمامەوە.

ئاخرەکەی بردیانمە شێتخانە.

ڕاستە مێشکم تێك چوو بوو، بەڵام دیسانیش ئەوەندەم هۆش هەبوو کە زۆر شت تێبگەم.

بۆیە لەو ژیانەی تازەم زۆر ناڕازی نەبووم. لە شێتخانە هەم ئازادیم زیاتر هەبوو، هەم زۆر شتی تازەم دەهاتە بەرچاو کە خۆمیان پێوە خەریك بکەم!

لە شێتخانە لەگەڵ پیرەپیاوێك بوومە ئاشنا کە ئەویش بەسەرهاتێکی سەیرو سەمەرەی هەبوو.

ئەو پیاوە لە پێشدا پارێزەر دەبێ و ژیان و گوزەرانێکی باشی دەبێ، بەڵام دوایە بەدبەختی بەرۆکی دەگرێ و تووشی نەخۆشی رەخنەگرتن دەبێ، هەموو ڕۆژێك سێچوار نامە بۆ پیاوە گەورەکان دەنووسێ و گیرو گرفتی خەڵك و هەڵەو کەم و کوڕی کاربەدەستان دەست نیشان دەکا.

حەوت هەشت ساڵ بەو جۆرە ڕادەبرێ و ئاخرەکەی ڕۆژێك کە خەریك دەبێ نامەیەك لە سندووقی پۆستخانە باوێژێ دەیگرن و پێشان دەینێرنە بەندیخانەو دوایە ڕەوانەی شێتخانەی دەکەن. ئەویش هەروەك من بوو. هیچ شوێنەواری شێتیی لە کارەکانی دا نەبوو. لێم پرسی:

ــ بۆچی خۆت تووشی ئەو دەردی سەریە کرد، کارت بەو کارانە چ بوو؟!

ـ ئەگەر ئێستا نەجاتیم بێ دیسان دەنووسم.

ـ ئاخر چ قازانجێکت لەو کارەدا دیوەتەوە؟!

هیچ نەبێ گرێی دڵی خۆم دەکەمەوە... نازانی ئەو سەرۆك و گەورانە چ بەلایەکیان بەسەر من هێناوەو چەندیان هەق کوژی کردوە.

بەقەد هەزار کەسی دەردو بەلا بەسەر هاتبوو، باسی شتی وای دەگێڕایەوەو قسەی وای دەکرد کە منیش بەرە بەرە لێی وەشك کەوتم. گوتم:

ـ هەباس ئاغا پێم وایە زۆری پێوە دەنێی... خۆ هەموو خەڵك هەر خەراپ نیە.

ـ بۆچی کاکە، تووشی هەر کەس بووم دەیەویست کڵاوم لەسەر نێ.

ـ ئاخر چۆن... هەموو ئەو خەڵکە بۆ خەراپە کردن لەگەڵ تۆ پێش بڕکەیان بوو؟

پێکەنینێکی تاڵی هاتە سەر لێوان:

ـ ئەرێ بەگیانی تۆ... یاری تۆپی پێت دیوە؟ دیوتە یاری کەرەکان چۆن تۆپەکە بۆ یەکتر فڕێ دەدەن و تۆپ بچێتە پێش هەر کەس دەسبەجێ شەپێکی توندی لێدەدا؟ منیش راست ببوومە تۆپی یاری.

دەنگی گێلە تۆزێك خەفەتبارو خەماوی بوو، تاوێك راوەستا دووبارە لەسەری رۆیشت:

ـ هێندیك جار لە ژیان دا پیاو ئەوەندە هەق کوژی دەبینێ کە خۆی پێ راناگیرێ. وەك مەستان کە هەر کەسی دەستیان کەوێ دەیانەوێ دەردی دڵی خۆیانی بۆ هەڵڕێژن، ئەویش دەچێتە لای دۆستێکی کە دەردی خۆی بۆ باس بکا. بەلام دۆستەکەی لای وایە ئەو پیاوە کە لاتسیا و لاتسیاو بە رێگا دا دەڕوا لەوانەیە بەسەری دا بکەوێ و تووشی ئازارێکی بکا. لەو ترسانە بە پێلاقەیەك لەخۆی دوور دەخاتەوە.

کە پێلاقەشت وێکەوت زیاتر تێك دەچی. بەو حاڵە خەراپەوە دەچیە لای یەکێکی تر باسەکەی بۆ بگێریەوەو گلەیی لە دۆستەکەی پێشووت بکەی بەڵام ئەمەیان پێلاقەیەکی توندترت پێدا دەدا.

دەچیە لای دۆستی سێهەم یارمەتیت بدا. دەڵێ بەخۆرایی نیە لێیان داوە، دەبێ بەمست و پێلاقە لەکۆڵ خۆی کەیەوە.

حیسابی چوارەم و پێنجەم و شەشەمیش روونە. چونکە هەتا قسەکەی بۆ باس دەکەی و گلەیی لە هاوڕێ بێوەفایەکانت دەکەی لەقێکی وات لێدەدا کە سەد میتر لەولاتر تەپڵی سەرت وەعەرزی بکەوێ.

لەو کاتەدایە کە پیاو هەموو شتێك دەخاتە ژێرپێ. دۆستایەتی، شەرەف، ویژدان، تەنانەت ئەقڵیش و بە جارێك خۆی شێت دەکا.

قسەکانی لە مێشکی من دا وەك کوتکێك بوون کە لە ئاسنی سووربووەوەی دەدەن و چۆنیان کەیف لێبێ وای لێدەکەن.

ئەو کاکی پارێزەرە هەر چەند بەڕواڵەت شێت بوو و لەشێتخانە دا زنجیر کرابوو، چەند قسەی قەڵەو قەڵەوی دەکرد. لەگەڵ هەر قسەیەکیشی من یەکێك لە بەسەرهاتەکانی خۆمم وەبیر دەهاتەوە. چەندیش نموونەی باشی دەهێنانەوە.

قسە لەوەی حیسابی تر نابێ. هێندیك کەس وەك تۆپی یاری وان. بکەونە بەرپێی هەر کەس... دەستی پاڕانەوە بۆ داوێنی هەر کەس درێژ بکەن، لە جیاتی بەزەیی و دەست گرتنەوەو لاواندنەوە پێلاقەیان پێدا دەدرێ.

من لەو فکرانەدا بووم کە هەباس ئاغا پشتە دەستێکی لە سنگم ڕاکێشا:

ـ ها! لەکوێی... دەڵێی تریاك کێشی تریاکت لێ براوە؟

سەرم هەڵێناو گوتم:

ـ فەرموو... دڵم لێیە...

ـ ئەدی گیانەکەم دەبێ پیاو تێبکۆشێ نەکەوێ... ئەگەر کەوتی ئیتر حیسابت تەواوە، وەك تۆپی یاری بۆ یەکترت فڕێ دەدەن... هەر کەسە بۆ ئەوەی تەماشاچی‌یەکان چەپڵەی بۆ لێدەن شەپێکی توندتر لەو تۆپە دەدا.

قسەکانی هەباس ئاغا زۆریان کار کردە سەر مێشك و بیرم... منیش ببوومە تۆپی یاری.

منیش ئینسانێك بووم کە دەچوومە لای هەر کەس قسەی بۆ بکەم پێلاقەم وێ دەکەوت. یەکەم پێلاقەم لە قوتابخانەی عسکەری وێکەوت... لەپاشان کەوتمە نێو مەیدانی ژیان و یاری کەرەکان بۆ یەکتریان هاویشتم.

هەباس ئاغا هەروا قسەی بۆ دەکردم، من هەستامە سەرپێ. دەزانی بۆ؟

بڕیارم دا ئیتر تۆپی یاری نەبم. ڕاستەڕێ چوومە لای دوکتۆری شێت خانە و زۆر بە جیددی پێم گوت:

ـ من چاك بوومەوە.

دۆکتور کەوتە تەماشاکردنم (فحص). لە کردارو ڕەفتاری تێگەیشتم سەری لێ دەرناچێ. ناچار ڕاستی‌یەکەم پێگوت:

ـ ڕاستی‌یەکەی ئەوەیە کە من لە پێشداش شێت نەبووم و خۆم شێت کرد بوو.

دوکتۆر پێکەنی:

ـ ئەوەش جۆرێك شێتی‌یە.

دوکتۆر دیسان لە شێتخانە ڕای گرتم... ئەمجار نامەیەکم بۆ سەرۆکی شێتخانە نووسی و شکایەتم کرد. هیچ پارێزەرێك نامەی وا نانووسێ... ئەویش لە جیاتی ئەوەی یارمەتیم بدا فەرمانی دا سیستەرەکان زیاتر چاوەدێریم بکەن.

چار نەبوو نامەیەکم بۆ سەرۆکی دادگا نووسی. بە کورتی ئەوەندەی وەدوا کەوتم تا فەرمانی بەرەڵابوونم دەرچوو، بەڵام نەك بۆ ئەوەی بێمە شەقام بەڵکە لەوێڕا راستەڕێ ناردیانمەوە بەندیخانە.

من کە دەمەویست تازە نەبمە تۆپی فوتباڵ یەکەم شەقم لە دوکتوری شێتخانەوە وێکەوت. دوکتۆری شێتخانە بەبێ هیچ دەلیلێك تەنیا بە سەگ و سەگبابی راپۆرتێکی لێدابووم وەك دەڵێن "کەچکی تێنەگەڕێ". راست و رەوان نووسیبووی ئەو کابرایە شێت نیە و بە درۆ وای کردوە. لەبەر ئەوەی ئەم کارەش چەشنە کەڵەکبازیەکە دیسان دۆسیەیان بۆ سازکردم و دووساڵی دیکەشیان لە ماوەی گیرانەکەم زیاد کرد.

❋ ❋ ❋

هەردووکمان زۆر ماندوو ببووین... گێلە بە حاڵ قسەی بۆ دەهات و منیش هەرچەند زۆرم پێخۆش بوو پاشماوەی ئەو بەسەرهاتە بزانم نەمدەتوانی لە قسەکانی تێبگەم. بڕیارمان دا ئەو شەوە بحەسێینەوەو پاشماوەکەیم بەیانی بۆ بگێڕێتەوە.

❋ ❋ ❋

بەیانی بە دەنگی هەراو هوریایەکی زۆر لە خەو راپەڕیم. خەڵکێکی زۆر لە ناو دالانەکە دا بە قەوەت قسەیان دەکردو خۆیان هەڵداویشت و هاواریان دەکرد... گێلە کە دیتی پێشهاتێکی تازە رووی داوە لە جێگاکەی دەرپەڕی و کەلێنێکی دایە دەرگاکە. لە دالانێ دا هەنگامەیەکی سەیر بوو: (مراد ورچ خنکێن) لە پێشەوە هەڵدەهات و قازی عسکەر لە کاتێك دا شاقەلی کەوایەکەی بە دەستەوە گرتبوو رێی دەرکەوت و دەی نەڕاند:

ـ ئەو سەگبابەی بگرن... نەیەڵن رابکا.

بە دوای ئەوانیش دا چەند فەرمانبەرێکی بەندیخانە غاریان دەداو ژمارەیەکی زۆریش لە بەندیەیە کۆنەکان کە ئەو دیمەنەیان دەدی بە قەو پێ دەکەنین و مراد ورچ خنکێن یان هان دەدا.

مراد ورچ خنکێن خۆی دەژووری قاوشێك راکردو چونکە قەدەخە بوو قازی عەسکەر بچێتە ژووری قاوشەکان هەر لەوێ لەنێوەراستی دالانەکە راوەستاو دەستی بە جنێودان کرد:

ـ گەوجی نەفام... بێدین... بێشەرەف...

فەرمانبەرەکان قازی عەسکەریان بردە مەکتەبی بەندیخانەو دوو سێکەسیش چوونە ژووری قاوشەکەو مراد ورچ خنکێن یان هێنا. بەندیەکان لە یەکتریان دەپرسی:

ـ مەسەلە چیە؟

ـ چی بووە؟

بەڵام هیچ کەس هۆی ئەو پێشهاتەی نەدەزانی... ژمارەیەك لە بەندیەکان بۆ ئەوەی لە مەسەلە حاڵی بن رۆیشتن بۆلای مەکتەب و بۆ ماوەیەك هەراو هوریایەکە دامردەوە.

مـن و گێلەش هاتینەوە ژووورەکەی خۆمان. هێندە تامەزرۆی بیستنی پاشماوەی بەسەرهاتی ئەو هاواڵە بەندیەم بووم پێش هەموو شتێك گوتم:

ـ باشە پاشماوەی بەسەرهاتەکە چ بوو؟ گێلە نەختێك پێکەنی:

ـ لانی کەم راوەستە ناشتاکەمان بکەین، سەروپیشێك بتاشین.

ـ نا تکات لێدەکەم بۆم بگێڕەوە. دەزانی چیە؟ ئەگەر تۆ قسەم بۆدەکەی هەر لەبیرم دەچێتەوە کە لە بەندیخانەم. گێلە ئاوڕێکی پڕلە بەزەیی وێدامەوەو گوتی:

ـ راستە دەڵێن دەورانی بەندیخانە وەك عومری دوژمن کورتە! ئاخرەکەی رۆژێك هات کە ماوەی حەپسەکەم تەواو بوو و لە بەندیخانە دەریان کردم. بێگومان پێت سەیرە کە دەڵێم "دەریان کردم" بەڕاستیش وا بوو. دەرچوون لە بەندیخانە بۆ هی وەك من بەدبەختی و چارەڕەشی‌یە. لە دەرەوەی بەندیخانە نە کەس چاوەڕێمانەو نە جێگایەکمان هەیە بیچینێ.

لێم پرسی: بەراستی دایك و بابت چیان بوو.

فیتووێکی درێژی لێداو گوتی:

ـ پیوو... ! بەقوربانی حەوسەلەی تۆ بم... !هیچ دەزانی لەو کاتەوە لە ماڵی بابم دەرکەوتم تا ئێستا کە قسەکەت بۆ دەگێڕمەوە چەند ساڵ دەبێ؟ ئەتۆ چەندت ئاگا لێیان بووە ئەمنیش هەر ئەوەندە.

ئاخر بە چ روویەکەوە دەمتوانی بچمەوە لایان! ! ؟ چۆن دەمتوانی رێگا بدەم ئەوان لەبەسەرهاتی من و لە وەزعی کوڕەکەیان ئاگادارین؟!

ـ باشە دوایە چیت کرد؟

ـ کاتێك لەبندیخانە دەریان کردم نەم دەزانی چ بکەم و بۆ کوێ بچم.

هەر ئەوەندەم دەزانی کە نابێ لە شاری گەورەو لەبەر چاوی پۆلیس بم. پیاوی خاوەن رابردوو وەك گای قەشانە. ئەو رابردووە نەحلەتی‌یە وایان بەدناو دەکا کە ئەگەر سەد فرسەق دوورتر پیاوێك بکوژرێ یان تاوانێك بکرێ پێش هەموو کەس بەرۆکی وان دەگرن...

بڕیارم دا ئەم جارە دەست لە دانیشتنی شارەکان هەڵبگرم و بچم بۆ خۆم لە کوێرەدێیەك دانیشم. دەستم لەو هەموو خەیاڵ پڵاوە دووروودرێژو پان و بەرینە هەڵگرتبوو، تەنیا دەمەویست پاروەە نانێك هەبێ بیخۆم و جێگایەکم بۆلێی بنووم.

تەنیا لەسەر یەك شت ساخ ببوومەوە. ئەویش ئەوە بوو کە تازە نەبمە (تۆپی فووتباڵ) و نەکەومە بەر شەقی یاری کەرانی کۆمەڵ، هەتا هەر کەسە لەبەر خۆیەوە شەقێکم لێبدا.

پێش هەموو شتێك چوومە دوکانی جلك فرۆشتن، دەستێکم جلکی نوێ کڕی. کراس و (بۆینباغ) و کەوش و گۆرەوییەکەشم تازە کردنەوەو سێ کراس و شەڵواریشم کڕین و لە جانتایەکی چکۆڵەم هاویشتن و بە جارێك خۆم گۆڕی و بوومە پیاوێکی تەواو.

لە پاشان چوومە گەراج و بلیتی (بطاقە) پاسێکم کە ساز بوو بڕوا کڕی و سوار بووم. ئێستا بۆ کوێ دەچووم؟ بۆخۆشم نەمدەزانی. گوتم خۆم و شانسم، دەڕۆم بزانم دەگەمە کوێ.

لە ناوەراستی ڕێگا دا پاسەکەمان لە بەردەمی چاخانەیەك راوەستا، ڕێبوارەکان هەموو دابەزین تا چایەك، شەربەتێك شتێك بخۆنەوە.

منداڵێکی چکۆڵەش لەبەردەمی چاخانەکە نانەشەکرەی دەفرۆشت. ویستم یەکێك بکڕم. کاتێك دەستم دەگیرفانم راکرد وا راچڵەکیم هێندەی نەمابوو سەکتەی بکەم.

کیسەباخەڵەکەم نەمابوو، زۆر چاکیشم لەبیر بوو کە خستبوومە گیرفانم و بەڵام ئێستا نەمابوو... بەو فکرە کە گۆیا بەهەڵە چووم چەندجار گیرفانەکانی تریشم

گەرام بەڵام سوراغی پارەکەم نەکرد. بۆم دەرکەوت لە رێگا دا گیرفانیان بڕیوم و بڕۆ بە خێراتی.

ترسێکی زۆرم لێپەیدابوو. تائێستا دڵم بەو پارەیە خۆش بوو. دەمگوت هەتا کارێك پەیدا دەکەم دووسێ هەفتەیەك گوزەرانی پێدەکەم بەڵام ئێستا چی؟

داماوو سەر گەردان لەبەردەمی چاخانەکە وشك بووم "خودایە گیان ئەمە چ چارەنووسێکە؟".

ئەمە چ بەدبەختی‌یەکە؟ روو لە کوێ کەم؟ پەنا بۆ کێ بەرم؟!

هەروا لەبیرو بەرژەوەندی خۆم دا بووم کە دەنگی شاگرد شۆفێرەکە بەرز بۆوە "یاالله نەفەرەکان سوار بن" بەخۆم نەبوو چوومە لای پاسەکەو سواربووم. پێش ئەوەی پێبزانم پارەکەمیان بردوە نەختێکم برسی بوو بەڵام کاتێك زانیم هیچم لە گیرفان دا نەماوە ئەوەندەم برسی بوو دەتگوت دوو رۆژە زەوادم نەبڕیوە.

ئەوەندە گێژو کاس بووم کە نەمدەزانی چ وەختە و لە کەنگێوە بەڕێوەین و گەیشتووینە کوێ؟

هەرچی بوو دنیا تاریك داهاتبوو. زۆری شەو چووبوو کە پاسەکە بۆ نان خواردن و نوێژ کردن لە بەردەم چاخانەیەك راوەستا. منیش زۆر ناڕەحەت بووم، کاری سەراوێم هەبوو. هەر لەگەڵ رای گرت جانتایەکەم هەڵگرت و پێش هەموو کەس دابەزیم...

لەبەردەم چاخانەکە دەپازدەکەس ڕاوەستا بوون و هەریەکەی چرا لۆکسێکیان بە دەستەوە بوو. هەر کە چاویان بەمن کەوت هاتنە لام و دەستیان بە بەخێراتن کرد:

ـ مامۆستا گیان بەخێربێی...

ـ قوربان بەم لایەدا تەشریف بێنە...

ـ بەرەکەتت هێنا مامۆستا...

هێندە تەنگاو بووم درم بە خەڵکەکە داو لە کاتێك دا بە نێویان دا تێدەپەڕیم لە یەکێکم پرسی:

ـ ئاودەست لە کوێیە؟

پیاوێکی لە هەمووان پیرتر بە منداڵێکی گوت:

ـ کوڕە رێگا بە مامۆستای نیشان بدە.

منداڵەکە چرافانۆسی بە دەستەوە گرت و پێشم کەوت:

ـ تەشریفت لێرەوە بێ!

ئەو لە پێشەوە و من بە دوای دا وەڕێ کەوتین. رێگاکە لەبەر چاوم هێندە دوور بوو خەریك بوو هاوار بکەم "بابە ئەو رێزو حورمەتەم ناوێ... برۆچاوی خۆت دەرێنە با نەجاتیم بێ".

بەڵام ئەو دەست بەدار نەبوو لەنێوەڕاستی مەزرادا کونێکی نیشان دام کە دەورەکەی تانە کرابوو و بۆخۆی گەڕایەوە. هەنگاوێکی دیکە چوومە پێش لە نەکاو دەعبایەکی زەلام کە لەو تاریکایی یە دا هێندەی کێوێك دەبوو خۆی پێدا دام و دەنگێکی سامناکم هاتە بن گوێ کە هەموو کوێرەوەرییەکانی لە بیر بردمەوە. لە ترسان پشتم بەتانەی ئاو دەستێوە داو هاوارم کرد.

سەگێکی زەلامی بەرمێگەل بوو کە لە ناکاو پەلاماری دام و ئەگەر فریام نەکەوتبان ئێستا چەند ساڵ بوو عومری درێژم بۆ ئێوە بەجێ هێشتبوو.

کاتێك گەیشتمەوە چاخانە پاسەکە رۆیشتبوو:

" ئەی هاوارو داد... ئەمە چ بەدبەختییەك بوو. ئێستا چ بکەم؟".

مامە پیرە غاری دا پێشم و بە ئەداو ئەتوارێکەوە گوتی: (ئورهان بی) من کوێخای ئاوەدانیم. قەرار وابوو (مدیر ناحیە) و جەنابی بەڕێوەبەریش بێنە پێشوازیتان. بەڵام دەبێ ببووری درەنگ گەیشتیە جێ.

تێ گەیشتم ئەوان پێیان وایە من مامۆستای قوتابخانەکەیانم. بەڵام بەو نیوەشەوەو بە گیرفانی بەتاڵ و زگی برسی‌یەوە لەو بیابانە نەمدەزانی تەگبیرم چیەو چ دەبێ بکەم... ئەگەر هیچم لە گیرفانم دا شك بردبایە راست و رەوان دەمگوت "بابە بە هەڵە چوون، من ئەو مامۆستا ئورهان بی‌یە نیم کە ئێوە چاوەڕێی دەکەن". دوایەش ملی رێگام دەگرت و دەرۆیشتم. بەڵام ئیستا چی؟ دە پێم بڵێ جگە لەوەی کە بچمە ژێر بار چارەیەکم هەبوو!؟ بڕیارم دا ئەو شەوە رۆڵی مامۆستا یاری بکەم، نان و چایەك بخۆم و لە جێگایەك بنووم و بەیانیش ماڵاوایی بکەم. کوێخا وەپێش کەوت دەستی بۆ پشت دیواری چاخانەکە درێژ کرد:

ـ لەم لاوە بفەرموو گالیسکە ئامادەیە... رێگاکە زۆر نیە. دێکەمان نیزیکە، بەڵام جادەکەی باش نیەو جەنابت بەپێیان ماندوو دەبووی.

لەگەڵ مام کوێخا سواری گالیسکە بووین و کەوتینەڕێ. ئەوانی تریش کە هاتبوونە پێشوازی "مامۆستا" بە دوامان دا کەوتنە لینگدان.

زۆرم بەزەیی پێدا دەهاتن "بڕوانە بە چ تاسە و ئارەزوویەکەوە هاتوونە پێشوازی من و هەتا نیوەشەو چاوەڕێ بوون؟".

سبەینێ بەیانی ئەگەر پێبزانن ئەمن مامۆستا نیم تەگبیرم چیە...؟!

"خوایە گیان! بۆ خۆت لەو داوەشم رزگار بکە.؟ بریا هەر لەو بەندیخانەدا مابامەوەو لەلای ئەو خەڵکە ساویلکە و دڵپاکە شەرمەزار نەبوویام. خوایە بۆ خاتری خۆشەویستی خۆت هیچ لاوێك شەرمەزار نەکەی.".

من لەگەڵ خوای خۆم رازو نیازم دەکردو کوێخاش بێپسانەوە قسەی دەکرد:
ـ ئورهان بی نازانی لەوەتی بروسکەکەت گەیشتوەو قبووڵت کردوە بێیە ئەم دێ بچکۆڵەو دەرس بە منداڵەکانمان بڵێی خەڵکی ئەم دێیانە چەند خۆشحاڵن. هەموویان خەریك بوون بەپیرتەوە بێن، من نەم هێشت. گوتم ئوتومبیل درەنگ دێ و مامۆستا رازی نیە.
هەروا جار جار سەرێکم بۆ دەلەقاند. کوێخا کە لە قسەکانی دا دنیایەك راستی دەردەکەوت لێی زیاد کرد:
ـ ئێستا دەبینی لە خۆشییان چ دەکەن.
هەر چەندی ئەو زیاتر باسی تامەزرۆیی لادێییەکانی دەکرد من پتر نارەحەت دەبووم. دووسێ جار خەریك بووم هەتا کارەکە پیستر نەبووە دابەزم و وەدوای کاری خۆم کەوم. بەڵام کام کار؟ بۆکوێ دەڕۆیشتم. دیسانیش بریا هەر رۆیشتبام. ئەوەندە پەرت و پەرێشان بووم هیچ نەمزانی کوێرا گالیسکە گەیشتەجێ...
ژمارەیەکی زۆر ژن و پیاوو تەنانەت ئەو منداڵە وردانە کە دەبوو سبەینێ دەرسیان پێ بڵێم لەبن دیوارەکان بە چرافانۆسەوە چاوەڕێ بوون. کاتێك گالیسکەکە نیزیك بۆوە دەستیان کرد بە چەپڵە لێدان و هاوار کردن.
هەتا نەختێك خۆم رێك و پێك کردەوە سێچوار پیاوی بە دیمەن و پۆشتەو پەرداخ کە دیار بوو شارستانی بوون هاتنە پێشەوە:
ـ بە خێراتنت عەرز دەکەم جەنابی مامۆستا. من مدیر ناحیەی ئێرەم...
ـ زۆر بە خێرهاتی ئورهان بی. من بەڕێوەبەری قوتابخانەم.

ـ بەرەکەتت هێنا قوربان. من سەرۆکی مەخفەری پۆلیسم. لەوە زیاتر کە زەردەخەنەیەك بکەم و سوپاسیان بکەم چارەیەکم نەبوو. مودیر ناحیە قۆڵی گرتم و گوتی:

ـ دیارە زۆر ماندووی فەرموو ئەمشەو لە ماڵی ئێمە بحەسێوە تا بەیانی جێگات بۆ ڕێك دەخەین.

کاك نەجدەت بەڕێوەبەری قوتابخانە وەڵامی دایەوە:

ـ ببوورە جەنابی مودیر ناحیە لە ماڵی ئێمەش جێگا هەیە. ڕێگا بدە میوانداری لێبکەم.

کوێخا و دووسێ کەسی تریش داوایان دەکرد بچمە ماڵی ئەوان.

منیش متەقم لەخۆم بڕیبوو (میوان (...)ی خانەخوێیە) ئاخرەکەی بڕیار درا ئەو شەوە میوانی مودیر ناحیە بم.

شێوێکی زۆر باشی ساز کردبوو، هەموو شت، مریشك، عەلی شیش، کەبابی بەرخی. بەڵام فایدەی چی؟ هەرچەند زۆریش برسی بووم دڵم هێندە نارەحەت بوو هەرچی دەمخوارد دەتگوت بە پشتم دا دەچێتە خوار.

سبەینێ بەیانیش ڕێگای دەربازبوون لەو تەڵەیەم نەبوو. خەڵکی دێیەکە ئەوەندە تامەزرۆی کردنەوەی قوتابخانەکەیان بوون کە پێش هەتاو کەوتن هەموویان لەبەر دەرگای ماڵی مودیر ناحیە کۆ ببوونەوە. ئێمەش ناچار بووین بەپەلە بەرچایی بخۆین و بچین بۆلای قوتابخانە.

لەسەر نان خواردن کاك نەجدەت دەستی بە قسە کرد:

ـ ئەم قوتابخانەیە خەڵکەکە بە پارەی خۆیان دروستیان کردوە. دوومانگ لەمەوبەر من لە ئەستەمبووڵەوە هاتمە ئێرە. زۆربەی کارەکانم کردوە، بەڵام بۆ خۆت دەزانی بەڕێوەبردنی قوتابخانە بە تەنیایی چەند دژوارە. بۆیە داوای

مامۆستایەکمان کردو دووسێ‌رۆژ لەمەوبەر کە بروسکەی جەنابت هات بەڕاستی لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بووین.

منیش هەر لەبیری ئەوەدا بووم ئەگەر ئورهانی راستەقینە بگاتە جێ چ قورێك وەسەر خۆم بکەم. پرسیم: رۆژێ چەند جار پاس دێتە ئێرە؟

مودیر ناحیە وەلامی دایەوە:

ـ هەر شەوانە دێ. بۆ چاوەڕوانی کەسێکی؟

هەرچەند لە وەلامەکەی نەختێك خۆشحاڵ بووم بەلام کە ئەو پرسیارەی لێ‌کردم وا تێك ڕابووم کە دیاربوو هەموویان تێم گەیشتن.

کاك نەجدەت پرسی:

ـ ئەرێ بەڕاست قەرار وا نەبوو ماڵ و منداڵیش لەگەڵ خۆت بێنی؟ ئەدی...

مودیر ناحیە پێکەنی:

ـ دیارە وای بەباش زانیوە لە پێشدا بۆ خۆی بێ و ئەگەر شوێنەکەی بە دڵ بوو دوایە منداڵەکانی بێنێ!

بە زۆر پێکەنینێکم بۆ کرد:

ـ بەڵێ چ بکەین.

نەجدەت بە نارەحەتیەوە قسەکەی بڕیم:

ـ ئیتر قەرار وا نەبوو "دەبە"مان پێ‌بکەی. دیارە ئێرە بۆ جەنابت شوێنێکی بچووکە. بەلام لەگەڵ ئەوەش دا خەڵکەکەی زۆر دڵپاك و ڕاستن و تۆش هەر لەباری مرۆڤایەتیەوە نابێ نیازی رۆیشتنت هەبێ.

دیسان سەرێکم بۆ لەقاندو پێکەنیم:

"خوایە گیان! من لە چ حالێك دام و ئەمانە چۆن بیر دەکەنەوە؟."

جەنابی مودیرناحیە تکای لێ‌کردم:

ـ فەرموو بچینە قوتابخانە.

بە کۆڵانە تەنگەبەرو پڕ لە زبڵ و زاڵەکان دا چووینە قوتابخانە. بە درێژایی ڕێگا خەڵکی گوندەکە ڕاوەستابوون و چەپڵەیان لێدەدا. نەختێك دڵم بەوە خۆش بوو کە هەتا نیوەشەوێ ئوتومبیل نایەو تا ئەو کاتە "پەتە"م ناکەوێتە سەر ئاو، بەڵام دوایەکەی چی...؟

ئەو قوتابخانە کە لادێییەکان ئەوەندە دڵیان پێخۆش بوو و جێژنیان بۆ گرتبوو تەنیا دوو ژووری قوڕوبەردی هەبوون کە دەرگاو پەنجەرەی باشیشیان تێدا نەبوو.

بەبن دیوارەکانەوە چەند سنگیان چەقاندبوون و تەختەیان لەسەر دانابوون. ئەوە بۆ منداڵەکان بوو و بۆ مامۆستاش "کورسی"یەکیان دانابوو.

بەکورتی بە هەزار شاهیدیش نەدەکرا ئیسبات بکەی ئێرە قوتابخانەیە.

مودیر ناحیە بەخۆڕانانێکی زۆرەوە وتاری کردنەوەی قوتابخانەی دەست پێکرد:

"زۆر شادمانم کە بە زەحمەتێکی زۆرو یارمەتی خەڵك توانیومانە ئەم قوتابخانەیە دروست بکەین. لەلایەن خۆم و هەموو خەڵکی گوندەکەمانەوە پڕبە دڵ سوپاسی کاك نەجدەت و کاك ئورهان دەکەم کە ئامادە بوون بۆ دەرس گوتنەوە بێنە ئەم گوندە دوورەدەستە".

هەموو چەپڵەیان لێ داو هاواریان کردو قوتابخانە بە ڕەسمی کرایەوە.

سێچوار منداڵی پاك و خاوێن نوقڵو شیرنیاتیان گێڕاو بەشداران دەمیان شیرین کرد. جەنابی مودیر ناحیە رووی تێ کردم:

ـ ئورهان بی خەڵکی ئەم گوندە زۆر لە هاتنی تۆ دڵخۆشن. بە زوویی قوتابخانەکە گەورەتر دەکەین. ئێوە لە هەمووبارێکەوە دڵتان ئاسودە بێ. هەتا

ماڵو منداڵیشت بۆ دێ میوانی منی و کاتێك ماڵیشت بۆ هات خانوویێکی باشت بۆ ئامادە دەکەین.

ئەو ڕۆژە بۆ نیوەڕۆ میوانی کوێخا بووین. میوانداری‌یەکی چەند باشی لێ کردین؟!

یەکەم جاربوو کە کڵاوم لەسەر خەڵك دەنا. بەڵام هەرچی دمکرد نەمدەوێرا ئەسڵی مەسەلەیان بۆ باس بکەم. نەمدەزانی ئەگەر ڕاستیەکەیان پێ‌بڵێم چ بکەم و ڕوو لە کوێ بکەم.

پاش ناخواردن بڕیارم دا نەختێك پارە لە مودیرناحیە قەرز کەم و پێش ئەوەی نیوەشەو دابێ و پاس بگاتەجێ و ئورهانی ئەسڵی بێ، فیزماڵکی بدەمێ. با هەتا ماندوو دەبن بەدوام دا بگەڕێن.

بەڵام هەر چەندی کردم لەڕووم نەهات بە مودیرناحیە بڵێم پارەم بە قەرز بداتێ.

ئێوارێ لەگەڵ بەڕێوەبەری قوتابخانە بەتەنیا مابووینەوە گوتم:

ـ جەنابی بەڕێوەبەر! دەمەویست شتێکتان عەرز بکەم.

جەنابی بەڕێوەبەر نەی‌هێشت قسەکەم تەواو بکەم:

ـ دەزانم دەتەوێ چ بڵێی!

زۆر تێك چووم: "بە چ ڕا دەزانی؟ ناکا بمناسێ!"

جەنابی بەڕێوەبەر دەستی خستە سەرشانم:

ـ نارەحەت مەبە! ئێرە ئەوەندەش ناخۆش نیە. وردە وردە بە هەموو شتێك رادێی. نازانی خەڵکی ئێرە چەند ساویلکەو دڵپاکن...

نەجدەت پەیتا پەیتا قسەی بۆ دەکردم. لای وابوو من بە هاتنی ئەو گوندە نارەحەتم. قسەکەیم بڕی و گوتم:

ـ نا... مەبەستم ئەوە نیە. دەمەوێ شتێکی ترت پێبڵێم.

بەلام نەجدەت کەلای وابوو هەموو شتێك دەزانێ، دیسان مۆڵەتی نەدام قسەکەم تەواو بکەم و گوتی:

ـ دەزانم کاکە گیان!

بەسەرم دا نەڕاند:

ـ چ دەزانی.!

نەجدەت نەختێك ڕاوەستاو سەیرێکی کردم. نەڕاندنەکەی منی زۆر پێسەیر بوو:

ـ فەرموو گوێم لێتە. ئەمجار تەماشاکردنەکەی جۆرێك بوو کە خەریك بوو لە قسەکەم پەژیوان بمەوە.

نەجدەت پرسی:

ـ دەتەویست چ بڵێی؟

ـ کێ بەتۆی گوت من مامۆستام!

بە سەرسوڕمانێکەوە تێمەوە ڕاما:

ـ بۆخۆت.

ـ من؟ کەنگێ؟ لە کوێ قسەی وام کردوە؟

ـ مەگەر بۆخۆت بروسکەت نەناردبوو؟

ـ نا، من بروسکەم لێ نەداوە.

ـ نازانم بۆچی بەدرۆم دەکەیەوە، ئێستاش بروسکەکەت لە گیرفانم دایە...

پاشان بروسکەکەی دەرهێناو بۆی ڕاگرتم. بێئەوەی سەیری کاغەزەکە بکەم گوتم:

ـ ئەم بروسکەیە ڕاستە بەلام بەمن چی؟

ـ بۆچی تۆ ئورهان نی؟

سەرم داخست و بەسپایی وەڵامم دایەوە "نا".

نەجدەت سەری هێنا پێش و بە دوودڵیەوە پرسی:

ـ ناکا پۆلیسی نهێنی بی و بۆ لێکۆڵینەوە هاتبیە ئێرە.

بێ دەنگ بووم. نەجدەت کە لای وابوو باشی بۆ چووە گوتی:

ـ بەڵێ، منیش بیستوومە لەم گوندە چەند قاچاخچی‌یەك تریاك دروست دەکەن. ئێستا تێدەگەم جەنابت بۆچی هاتووی ؟

ئەو کاك نەجدەتە لەو کەسانە بوو کە لەبەر ساویلکەیی خۆیان پێیان وایە هەموو شتێك دەزانن. ئەو جۆرە کەسانە فریودانیان لە فریودانی منداڵیش هاسانترە. خەریك بوو بڵێم باشی بۆچووی و خۆمی لە دەست رزگار کەم، بەڵام دیتم کارەکە پیستر دەبێ.

نەجدەت کە چاوەڕێی وەڵامی من بوو گوتی:

ـ بەسەری من باشی بۆ چووم؟

ـ ناتوانم ئەمەت پێبڵێم. هەر ئەوندە دەڵێم من ناوم "هەقی"یە و ئورهان نیم. درۆشم نەدەکرد ناوی تەواوم "فەرید هەقی" بوو، لە قوتابخانە هەر فەریدیان پێدەگوتم. ترسام بڵێم ناوم فەریدە. گوتم نەوەك لە رۆژنامەکان دا ناوی منی دیتبێ و لەبیری مابێ.

نەجدەت گوتی:

ـ کاك هەقی! بۆچی لەپێشدا ئەو مەسەلەت باس نەکرد؟

ـ ئێوە نەتان هێشت خۆم بناسێنم. کە لە ئوتومبیل دابەزیم ویستم دەست بە ئاو بگەیەنم. هەموو دەورەیان دام و گوتیان "مامۆستا بەخێربێی" ئەو وەخت زۆر تەنگاو بووم و دوایەش پاسەکە رۆیشتبوو. بەیانیش کە هەموو شتێك

تێگەیشتم نەمتوانی هیچ بڵێم چونکە گیرفانیان بڕیبووم و بە فلسم دەگوت فەتاح بەگ.

نەجدەت بە سەرسوڕمانەوە گوێی بۆ قسەکانم دەگرت:

ـ سەیرە، بەڕاستی سەیرە، چۆن گیرفانی پۆلیسێکی وەك تۆیان بڕیوە.

ـ کاکە! پۆلیس... مۆلیس نیم.

نەجدەت دیسان پێکەنینێکی تایبەتی کرد:

ـ دەزانم. دەزانم. دیارە تۆ ناتوانی بڵێی پۆلیسم. بەڵام دڵنیابە من زار بڵاو نیم. نەهیچم لە تۆ بیستوەو نە ئاگام لە هیچە!

ـ نەجدەت تکات لێدەکەم، زۆرت مەمنوونم، ئەمن پۆلیس نیم.

ـ دیارە. دیارە پۆلیس نی! زۆر باشترەو هەر نابی کەس تۆ بناسێ!

لە داخی ئەو کابرایە خەریك بوو شێت بم. هێشتا لە قوڵکەیەك رزگار نەببووم خەریك بوو بمخاتە چاڵێکەوە. دەترسام تووشی بەدبەختی‌یەکی گەورەترم بکاو ئەم جار بەناوی پۆلیسی ساختە دەداو بکەوم:

ـ کاك نەجدەت پۆلیس نیم. بەخوا پۆلیس نیم.

ـ باشە. پۆلیس نی. زۆر باشە.

ئەو قسەیەی هەزار مانای دەگەیاند. هەرچی هەوڵم دا پێی بسەلمێنم پۆلیس نیم، نەچووە ژێر بار.

نەجدەت پرسی:

ـ چەند لێرە دەبی؟

ـ نازانم، بەڵام هەردەرفەتێکم بۆ رێ کەوێ بۆی دەردەچم.

ـ دیارە وەختێك کارەکەت تەواو بوو!

ـ چ کارێك کاك نەجدەت. بابە گیان بۆ بەزۆر دەتەوێ بمکەیە پۆلیس؟

دیسان پێکەنی :

ـ ببوورە، بەڵام تکایەکت لێدەکەم. بۆتۆش هەر باشە.

ـ چ تکایەك؟

ـ هەتا لێرەی کارم لەگەڵ بکەو مەهێڵە لە ناو بچم!

ـ مەبەستت ئەوەیە کەوەك مامۆستایەك دەرس بڵێم؟

ـ بەڵێ. با هەمووکەس وا بزانێ مامۆستای. ئەمە بۆتۆش هەر باشە.

ـ کاکە گیان! ئاخر "ئورهان"ی ئەسڵی دێت و کارەکە پیس دەبێ.

ـ مەگەر ئەم وڵاتە تەنیا ئورهانێکی تێدایە؟ کوڕە ئەو ئورهانێك و تۆش ئورهانێك!

لە قسەکانی کاك نەجدەت وا دەردەکەوت کە ئەگەر من بڕۆم قوتابخانەکە پەکی دەکەوێ، یان نانی دەبڕێ. راستیشی دەکرد. ئێستا کە من جێگایەکم نیە بۆی بچم و عانەیەك لە گیرفانم دا شك نابەم، چی تێدایە با پێشنیارەکەی قبوڵ بکەم؟

ـ زۆر باشە، بەڵام بە مەرجێك کەس ئاگای لەم قسانەمان نەبێ.

ـ دڵنیابە! من قسەم لێناکەوێ.

دەستم لێ هەڵماڵی و دەست بەکار بووم...

پیاو بەرەبەرە باوەڕ بە درۆکانی خۆی دەکا... ئەو کەسانەی ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانە ماونەوە ئەم مەسەلەیە باش دەزانن. چونکە لەبەر ئەوەی زۆر ئازاری گیانی دەبینن و لایان وایە چواردەوری دنیایان لێ تەنراوە، تووشی چەشنە خۆش باوەڕییەك دەبن.

منیش یەکێك لەو جۆرە کەسانە بووم. لە پێش دا هەر بیرم لەوە کردبایەوە کە خۆم لە جێگای ئورهان دابنێم هەموو گیانم دەلەرزی. کەچی پاش ماوەیەك بۆخۆشم لێم وەڕاست گەڕابوو، پێم وابوو مامۆستام و ناوم "ئورهان بی"یە.

زۆر بە چەشنێکی ئاسایی دەچوومە قوتابخانەو دەرسم بە منداڵەکان دەگوت. تەنیا بەوەندەوە نارەحەت بووم کە "ئورهانی ئەسڵی بۆ دیار نیە؟" کاك نەجدەت کەرەستەی ژیانی منی لە هەموو بارێکەوە ئامادە کربوو، ژوورێکی بچووك و هێندێك کەل وپەلی خاوێنی بۆ کڕیبووم و خەڵکی ئاواییش زۆریان رێز لێ‌دەگرتم.

بە کورتی گوزەرانێکی زۆر باشم هەبوو. دڵم ئاسوودە بوو. ژیانێکی بێ‌دەنگ و ئارامم رادەبوارد. کاتێك لەلای نەجدەتیش باسی ئورهانم دەکردو نارەحەتی خۆم لەو بارەوە دەردەبڕی، ئەو پێ‌دەکەنی:

ــ تۆ سەرت لە کاروباری پەروەردە دەرناچێ. پەروەردەی ئێمە وەك تووکەسەری قولەڕەشەکان تێك بادراوەو بەم زوانەش لێك نابێتەوە. بێ‌گومان هەر ئەو ڕۆژە کە ویستوویەتی بێتە ئێرە بۆ جێگایەکی تریان ناردوە، یان هەر ئەو رۆژە دەرەجەی بۆ هاتوەو چۆتە پلەیەکی بەرزتر، وێ دەچێ دەریشیان کردبێ.

بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە . لە ماوەی سالێك دا ناردبوویانە سێ‌شار. هەر چەند تاقە وشەیەك زمانی ئینگلیزی نەدەزانی جارێکیش کردبوویانە مامۆستای زمانی ئینگلیزی.

لە بەدبەختی من دووسێ هەفتە پاشتر نەجدەتیش لەوێ گوازرایەوەو حوکمێکی بالآبەرز لە پەروەردەوە هات و من، واتە ئورهان بی‌یان کردە بەڕێوەبەری قوتابخانە.

ئیتر نەمدەتوانی لەوە زیاتر خۆم لەژێر باری ئەو بەدبەختی‌یە دا رابگرم. لە نەجدەتم پرسی:

ـ تەگبیرم چیە؟

ـ هیچ، گیانەکەم! خۆت نارەحەت مەکە. تۆ لێرە ئەرکێکی تریشت لەسەر شانە. دەبێ بەرێوەبەرایەتی قوتابخانەش بگریە ئەستۆ هەتا بەرێوەبەری بۆ دێ.

نەجدەت زۆر بەوە دڵخۆش بوو کە لەوێ گوازرابۆوەو بۆ جێگایەکی باشتر دیاری کرابوو. بەڵام منی قورپەسەر چی؟ کاتی رۆیشتنی نەجدەت خۆم پێ‌رانەگیرا، دەستم کرد بە گریان:

ـ لەپاش تۆ ناتوانم لێرە بمێنمەوە.

زۆری تەکلیف لێ‌کردم:

ـ بەخۆرایی کارەکانت تێك مەدە.

هەرچەندی کردم و کراندم نەجدەتم بۆ حاڵی نەکرا کە من پۆلیس نیم.

دوای رۆیشتنی ئەو ئەرکی من زۆر گرانتر بوو. چونکە دەبوو هەم دەرس بە منداڵان بڵێم و هەم کاروباری قوتابخانە بەرێوەبەرم.

بەڵام من لە کارکردن ماندوو نەدەبووم. ئاواتم بوو بە راستی مامۆستا بوایەم هەتا دوارۆژی ژیانم خزمەتی ئەو خەڵکە بە ئەمەگ و ساویلکەیەم کردبایە.

سەری مانگ مەعاشەکەم لە رێگای مودیر ناحیەوە گەیشت. نەمدەزانی پارەکە وەربگرم یان نا!!

چار نەبوو پارەیەکی زۆرم بۆ کرینی کەل وپەل قەرز کردبوو. کاتێك سەیری قایمەکەم کرد یەقێکم هاتەوەبەر. تێ‌گەیشتم ئورهان بی مامۆستایەکی کۆنەکارە. چونکە مەعاشەکەی ٦٨٠ لیرە بوو.

کاتێك پارەکەم وەرگرت پێم وابوو تاوانێکی گەورەم کردوە. ئەوەندە ناڕەحەت بووم کە ئەو رۆژە نەمتوانی بچمە قوتابخانە. بە بیانووی نەخۆشی هەر لە ماڵێ دانیشتم بەڵکو بتوانم بیرێك لەو بەدبەختی‌یەم بکەمەوە. فکرم کردەوە وا باشە هەتا پارەم هەیە بۆی دەرچم. بەڵام قوتابخانەکەم چ لێ کردبایە؟ تەگبیری منداڵەکان چ بوو؟!

پاشان رۆیشتنەکەشم هێندە هاسان نەبوو. هەموو کەس پێی دەزانی و نەیان دەهێشت برۆم. هەستم دەکرد دووبارە تووشی تەڵەیەکی باش بووم، بەڵام نەمدەزانی چار چیە.

بریا هەر رام کردبا و چاوەڕێی بەدبەختی‌یەکانی دواتر نەبوایەم.

❋ ❋ ❋

هەڵاو هەنگامەیەك لە داڵانی بەندیخانە بەرز بۆوە هەودای قسەکانی پچڕی.

(گێلە) هەڵستا رۆیی بۆ داڵانەکەو منیش بەدوای دا...

مراد ورچ خنکێن لە نێو بەندی‌یەکان ڕاوەستا بوو داستانی قازی عەسکەری بۆ دەگێڕانەوەو کوڕەکانیش قاقا پێ دەکەنین.

مەسەلە چ بوو؟

دەرکەوت هەموو رۆژی بەیانی کە قازی عسکەر هاتۆتە بەندیخانە هاوڕێکانی مراد ورچ خنکێن لەبەر دەرگای دەرێ راوەستاون و پاشان بە بیانووی زیارەتەوە نەختێك تریاکیان بە دەرزی لە شاقەلی کەواکەی قایم کردوە.

ئەویش بێ ئەوەی ئاگای لێبێ ئەو تریاکەی هێناوەتە ژوورێ و مرادیش کە یەکێك لە مریدە هەرە موخلیسەکانی بووە وەدوای کەوتوەو تریاکەکەی لە شاقەلی کردۆتەوە.

ئەو ڕۆژە هەر چەندی دەست لە عەباکەی دەکوتێ، تریاك نابینێتەوە. بە خەیاڵی ئەوەی تریاکەکە کەوتبێتە ناو ئەستەڕی عەباکەی دەستی پتر دەباتە پێش و تەنانەت دەستێکیش لە نێوڕانی دەکوتێ.

جەنابی قازی ئەو کردەوە بەشتێکی خەراپ لێك دەداتەوەو بەفکری ئەوەی کە گوایا مراد ورچ خنکێن ویستوویەتی سووکایەتی پێ بکا سەری دەدوو دەنێ. بێخەبەر لەوەی ئەو ڕۆژە هاوڕێکانی درەنگ هاتوون و ئەمانەتەکەیان نەناردوە.

قۆڵی گێلەم گرت و تکام لێکرد بچینەوە ژوورێ... گێلە تەماشایەکی کردم و پێکەنینێکی تایبەتی هاتە سەر لێوان:

ـ وادیارە زۆرت ئەم چیرۆکە پێ خۆشە؟

ـ من ئاشقی ئەم بەسەرهاتانەم.

چووینەوە ژوورێ و دەستی بە گێڕانەوەی داستانەکە کردەوە:

ـ هەموو ڕێگایەکم لێ گیرابوو. تەنیا ڕێگای بەدبەختی ئاوەڵابوو. نەمدەزانی بۆ دەربازبوون لەو بەدبەختییە چ بکەم! ئاخرەکەی خۆم دایە دەستی چارەنووس، بزانم چ ڕوو دەدا.

لە جێگای وا چکۆڵەدا خەڵك زوو ئۆگری یەکتر دەبن، بەتایبەتی چونکە ناچارن شەوو ڕۆژ پێکەوە بژین. ئێمەش شەوانە لەگەڵ مودیر ناحیەو سەرۆکی پۆلیس و نوێنەری جووتیاران و کوێخاو چەند کەسی دیکە کۆ دەبووینەوەو خواردنەوەو قومار دەست پێدەکرا.

ئەمن نەم دەخواردەوە. دەمزانی ئەگەر مەست بم ڕاستی کارەساتەکان هەڵدەرێژم و کارەکەم لێ پیس دەبێ.

شەوێکیان کە لەبەرئەوەی من ببوومە بەرێوەبەری قوتابخانە هاوالآن جێژنیان گرتبوو، ئەم بەدبەختی‌یەم تووش بوو. لە پێشدا زۆرم هەوڵ دا نەخۆمەوە، بەلام کاتێك مودیر ناحیە پێکەکەی بە سلامەتی من هەڵدا، بێ ئەدەبی بوو منیش بە سلامەتی ئەو نەخۆمەوە.

مودیر ناحیە کە سەرخۆش بوو هەڵستا سەرپێ‌و دەستی بەقسە کرد:

ئورهان بی یەکێك لە پێشمەرگەکانی ئۆردووی پەروەردەی ئێمەیە کە زۆری زەحمەت کێشاوەو شایانی پلە و پایەی زۆر بەرزترە.

لە دڵی خۆم دا گوتم خوایە لەم لەرێگادەرچوونە رزگارم بکە.

مودیر ناحیە ئاورێکی وەسەر من دایەوەو زەردەخەنەیەکی کرد:

هاورێیان! بخۆینەوە بە سلامەتی دوستی بەرێزو خۆشەویستمان ئورهان بی.

هەموو پێکەکانیان بەرز کردەوەو منیش کە قسەکانی مودیر ناحیەم زۆر پێخۆش بوون ئیستیکانی پڕ لە ئارەقم هەڵگرت و یەك بین چۆڕیرم کرد:

ـ بە سلامەتی!

کوێخاش هەڵی دایە:

ـ شارۆچکەکەمان هەرگیز ئورهان بی لەبیر ناچی. بە سلامەتی!

ئیستیکانێکی دیکەشم خواردەوە.

نوێنەری جووتیارانیش ڕاست بۆوە:

ـ ئەم ئاوەتاڵە بەیادی بیرەوەری‌یە شیرینەکانی دۆستی خۆشەویستم ئورهان بی دەخۆمەوە.

ئەمنیش ئیستیکانێکی دیکەم هەڵدا.

لە خۆشیان گریانم دەهات. بە زەحمەت خۆم پێ ڕادەگیرا، نەوەك کەسێك لە ناڕەحەتی و نیگەرانی من تێ بگا. ئەوەندەم لە ژیان دا تاڵی و کوێرەوەری

چەشتبوو قەت بیرم نەدەکردەوە یەکێك هەبێ بەڕاستی منی خۆش بوێ و چاکەم لەگەڵ بکا.
وەختێك پێنجەم ئیستیکانم خواردەوە هەستم کرد بەری چاوانم تاریك بوو. خۆم بەبێ شەرم و ڕەزیل هاتە بەرچاو. تاوانبارێك بووم کە کڵاوم لەسەر هەموویان نابوو.
لەوەی ئەو ئینسانە دڵپاك و نیازپاکانەم فریو دابوو بەخۆم دا دەشکامەوە "ئەگەر ئەمانە تێ بگەن ئەمن رابردوویەکی وا تاریکم هەیە چیم لێ دەکەن؟".
تۆرەی قسەکردنی خۆم بوو. "هەرچی دەبێ با ببێ"!
کاتێك ئیستیکانەکەم هەڵێنا گوێم کەڕ ببوو. بەخۆم نەبوو زمانم وەکار کەوت:
ـ دۆستانی بەڕێز! لەوەی کە ئێوەم فریو داوە داوای لێبووردن دەکەم. ڕەنگە ئێوە بە قسەکانم باوەڕ نەکەن، بەڵام ئەوەی دەیڵێم ڕاستەقینەیە.
میوانەکان کەوتنە سرت و خورت و منیش لە سەرو سیمایان ورد بوومەوە. دەمزانی جێگای ئەم قسانە نیە بەڵام بە دەست خۆم نەبوو "مەستی و ڕاستی" زۆر لەمێژ بوو دەمەویست ئەم قسانە بکەم. دەمزانی ئاخرەکەی ڕۆژێك پێوە دەبم و هەموویان لە بەسەرهاتی من تێدەگەن، کەوابێ باشترە بۆ خۆم مەسەلەیان بۆ ڕوون بکەمەوە:
ـ هاوڕێیان اعتراف دەکەم شیاوی میهرەبانی ئێوە نیم. من مامۆستایەکی ساختەم. پیشەی پیرۆزی مامۆستایی لە کوێ و من لە کوێ؟ ئەمن کڵاوم لەسەر هەمووتان ناوە.
گریانم هات و نەمتوانی زیاتری لەسەر برۆم. مودیر ناحیە وەقسە هات و گوتی:
ـ ببوورە. ئەتۆ پیاوێکی زۆر فیداکارو ئەمەگناسی!
گریانەکەم قووت دایەوەو هاوارم کرد:

ـ بەخودا ڕاست دەکەم... من هەقی یەکێکی ترم زەوت کردوە.

نوێنەری جووتیاران و کوێخا کە لە تەنیشت یەکتر دانیشتبوون دەیانگوت:

ـ فلان کەس سەرخۆشە.

نوێنەری تەندروستی گوتی:

ـ بەڵێ، ئێمە هیچ کاممان بایی ئەو پارەی وەری دەگرین کار ناکەین! !

هەر کەسە قسەیەکی دەکرد. هێندەی نەمابوو لە داخان بتەقم! نەیان دەهێشت قسەکەم تەواو بکەم:

ـ برایان! ڕێگام بدەن قسەکەم تەواو بکەم.

سەرۆکی پۆلیس کە لەتەنیشتم دانیشتبوو ئیستیکانێکی تری بۆ تێکردم و داوێنی گرتم و لەسەر کورسی‌یەکەی دانامەوە.

ئیستیکانە ئارەقەکەم خواردەوەو سەرلەنوێ ڕاست بوومەوە:

ـ هاوڕێیان ڕێگا بدەن پێ لە گوناهی خۆم بنێم. زیاتر لەوە ناتوانم خۆم ڕابگرم. من تووشی ئازاری ویژدان بووم. وەرن بمگرن!

سەرۆکی پۆلیس دووبارە لەسەر کورسیەکەی دانامەوەو ئیتر ئاگام لەخۆم بڕا.

بەیانی تێگەیشتم دوو سێ کەس لە هاوڕێیان بردوویانمەوە شوێنەکەی خۆم و خەواندوویانم.

لە ئەنجامی ئەو سەرخۆشی‌یەدا ڕۆژێکی تەواو لە ماڵێ دانیشتم و نەمتوانی بچمە قوتابخانە. شەوی دواتریش لە شەرمان نەچووم بۆ کۆبوونەوەی هاوڕێیان و لە ماڵێ مامەوە. هەتا نیوە شەوێ بەخەبەر بووم و بیرم لە بەدبەختی خۆم دەکردەوە. لەنەکاو لە دەرگایان دا.

هەتا ئێستا قەت ڕێ نەکەوتبوو پاش ڕۆژئاوابوون کەس بێتە لای من. شەوانە لە لادێ وڵات یەکجار بێدەنگەو خەڵکی لادێ یەکجار زوو دەخەون.

بەجارێك جەرگ و دڵم بەربوونەوە. هەستم کرد مەسەلەیەکی گرنگەو سەرۆکی پۆلیس هاتوە بمگرێ. ئەوەندە ترسام ماوەیەك نەمتوانی لە جێی خۆم بجووڵێم و وەڵامیان بدەمەوە.

ئەوەی لە پشت دەرگا بوو دووبارە دووسێ مستی توندی لە دەرگا راکێشاو گوتی:

ـ مزگێنیم بدەیە ژن و منداڵەکەت بۆ هات!

ئەگەر بوومەلەرزە هاتبا، ئەگەر بۆمبای ئەتۆم تەقیبا، ئەگەر دنیام بەسەر دا رووخابا، ئەوەندە نەدەترسام کە بەو خەبەرە تێك چووم: "ئەی دادو بێداد ئەمەی چ لێ بکەم"؟.

فکرم لە کار کەوتبوو. بەڵایەکە ئەوەندە لە نەکاو هاتبوو کە رێگای چارە نەمابوو. هەتا وەخۆ کەوتم دەنگی پێی شەش حەوت کەس و دەنگی پێکەنین و قسەکانیان لە پشت دەرگاوە هاتە بەر گوێم.

ـ بابە خەوتوە.

ـ وەخەبەری مەیەنە.

ـ دەرگاکە بکەوە، مەگەر مردوە؟

هیچ رێگا نەبوو بێجگە لەوەی ڕابکەم و گیانم دەرباز بکەم.

جلەکانم لەبن هەنگڵم ناولە پەنجەرەیەکی بچووکەوە کە لەلای پشتەوەی ژوورەکە بوو خۆم فڕێ دایە کۆڵان و هەڵاتم بۆ دەرەوەی ئاوایی. هەتا مەودایەکی زۆر دەنگە دەنگی ژن و منداڵەکەی نورهانم هەر گوێ لێبوو. بەڵام لەوە زیاتر رێگایەکم نەبوو.

ئەوەندەی سەگی ئاوەدانی بوون وەدەنگ هاتبوون. هەڵاتنی منیش بەو نیوە شەوە هەڵایەکی بەرپاکرد کە هەموو خەڵکی ئاوایی لە خەو هەستاند.

دەمزانی راکردنەکەم بە خۆڕاییە. دیسانیش هەوڵم دەدا هەرچۆنێك بێ بگەمە سەر جادە بەڵکوو لە دەستی ئەوانە رزگار بم.
هێشتا نەگەیشتبوومە دەرکی چاخانەکە کە پۆلیسەکان گەیشتنێ و دەنگی "بوێستە بوێستە"و چەخماخ راکێشانی تفەنگەکانم هاتە بەرگوێ.
وەك داری وشك لە راست خۆم چەقیم و لەگەڵ پۆلیسەکان هاتمەوە ناو دێ.
ژن و منداڵی ئورهان بی بە دیتنی من هەرایەکیان ساز کرد کە پێنج ئاوایی دەوروبەریش پێیان زانی.
ژنی ئورهان بی مێردەکەی لە من دەویست و منداڵەکانیشی داوای باوکیان دەکرد.
کاری ئێمە گەیشتە دادگا. دەرکەوت ئورهان بی ئەو کاتەی چووە بۆ شوێنی کاری خۆی لە رێگادا لە ئوتومبیل هەڵدێراوەو بە ناوی نەناسراو نێژراوە.
بەڵام دیسانیش تۆمەتی من هەر لەجێگای خۆی بوو، بەوە تاوانبار کرام کە بۆ ئەوەی جێگای ئورهان بگرمەوە ئەو نەخشەیەم کێشاوەو بوومە هۆی کوشتنی ئورهان.
ئێستا ئەو کەرەی لەو قوڕەی وەپەڕێنە. لەپێشدا ئەگەر بەتاوانی کڵاو لەسەرنان دەگیرام هیوایەکی بەربوونم هەر هەبوو، بەڵام ئەمجارەیان چی؟ مەسەلەی پیاو کوشتن گاڵتە نەبوو.
هەرچەندی سوێندم خواردو خۆم هێناو برد کەس نەی بیست. ڕواڵەتی کارەساتەکەش جۆرێك بوو کە گومانیان لە تاوانباری من دا نەدەما. بە دۆسیەیەکی زرت و زەلامەوە لە پلیکانەکان رۆیشتمە "خوار" بزانم خوا چ دەکا.

بۆ سبەینێ دیسان ڕۆژنامەکان هەنگامەیەکیان بەرپا کرد. مامۆستای ساختە، بازرگانی ساختەو زۆرشتی تر. لە بەندیخانە وەزع گۆڕابوو:

سولەیمان دایکی خۆفرۆش و مراد ورچ خنکێن کە چەند ساڵ دوژمنی خوێنە خوێنی یەکتر بوون پێکەوە ڕێك کەوتبوون و موویان لەبەینەوە نەدەچوو و گرەویان لە هەمووان بردبۆوە.

لە هەمووی خەراپتر ئەو ساڵە سەرمایەکی سەخت بوو. کەس زستانی وای وەبیر نەدەهات. بەندییەکان لە ژوورەکان دا وەك مێژۆکە دەلەرزین. منیش گیرفانم بەتاڵ بوو. لەبەر ئەوە بە پێچەوانەی جاران کە بەندییەکان میوانداری-یان دەکردم هیچ کەس وەك سەگێکی چاو لێ نەدەکردم، هەموو کاتێك زستانان بەندیخانە موشتەری زۆرترە. بەڵام ئەو ساڵە ئاوەدانییەکەی لەڕادەبەدەر بوو. یەکسەر ڕۆیشتم بۆلای ئەو قەرەوێڵەی جاران لەسەری دەخەوتم. بەڵام دیتم ساحەبی هەیە.

پرسیم: " کێ قەرەوێڵەی منی گرتۆتەوە؟!"

کەس جوابی نەدایەوە.

سەرین و بەتانییەك کە لەسەر قەرەوێلەکە بوون فرێم دان و بەتانی خۆم لێ بڵاو کردەوە.

پاش چەند دەقیقە سولەیمان دایکی خۆفرۆش هات و بێ ئەوەی ئاوڕێك وەسەر من بداتەوە گوتی:

ـ چ والێکراو و واپێکراوێك ئەو بەتانییەی هەڵگرتوە؟

هەر لە جێگای خۆم نەڕاندم:

ـ ئاگات لە زمانی خۆت بێ. منداڵی دوێنێ.هەموو پێنج ساڵ نابێ هاتوویە بەندیخانە چیت لێ قەوماوە؟

خوێن بەری چاوانی گرتبوو. مۆرەیەکی لێ کردم و گوتی:

ـ وەرە خوارێ ئەو جێگایە ساحەبی هەیە.

ـ با ساحەبەکەی بچێ لەسەر بەرد بخەوێ کەس دەستی نەگرتوە.

لە بەندیخانە باوە کە ئەوانی قۆشمەو مل ئەستوور قەرەوێڵەکەیان رووبەرووی دەرگا دادەنێن. قازانجی ئەو کارە ئەوەیە دوژمن ناتوانێ لە نەخافڵ بەسەریان داداو ئەوان هەمیشە دەتوانن خەتەر لە دوورەوە ببینن.

دەمزانی مل بەملە لەگەڵ ئەوانە ئەنجامێکی باشی نیە، بەڵام تازە لەچی دەترسام؟ لەپاش رووت کردنێ تەشتی تەڵا لەسەر سەرت دانێ.

وەختێك قەرارە بە تاوانی پیاو کوشتنێك کە رووحیشم ئاگای لێ نیە لە قوژبنی بەندیخانەدا برزم با منیش داخی خۆم بەوانە برێژم.

ئەم کردەوەم هەنگامەیەکی سەیری لەناو قاوشەکەدا ساز کرد. بەندیەکان کە پێیان وابوو کەس نیە داوی سولەیمان دایکی خۆفرۆش با بدا، لەقسەکانی من واقیان ورمابوو. ئەوان نەیان دەزانی من بەچی دەخورم و پشتم بەچ ئەستوورە کە قسەم وا نێرن.

سەیر ئەوە بوو سولەیمان خۆشی سەری سوڕما. دیارە ئەو دەتگوت دێوەو بەهاسانی دەیتوانی هەموو ئەندامی من تێك بشکێنێ، بەڵام پێی سەیر بوو کە من بە گژی دا چوومەوە!

بێ ئەوەی گوێ بدەمە ئەو هەڵڵایەی سازم کردوە زۆر بێ پەروا لەسەر قەرەوێڵەکەم درێژ بوومەوەو سەرم لەژێر بەتانی ڕاکرد. لەسەرمان ددانم ددانی نەدەگرت و لەژێر بەتانیش دا حەجمینم نەبوو. دیتم "داستان قەدری" بەخۆی و کەشەفێك چاوە پەیدا بوو:

ـ ئەمە سولەیمان بۆی ناردووی!

ـ نامەوێ...

دەستێکیشم لێ دا ئیستیکانە چایەکەی لە دەست بەربۆوە.

وەختی نان خواردن دیسان قەدری پەیدا بوو سینی‌یەکی خواردن هێناو گوتی:

ـ ئەمەش هەر کاك سولەیمان ناردوویە !

دەستێکم بە سینی‌یەکەوە نا:

ـ بیبەوە با دایك و باوکی بیخۆن.

کوڕە پیاوی چاك بە پێ لە کەری شەیتانی بێنە خوار، پەندێکت بەسەر دێنێ...

ـ هەرچی لە دەستی دێ بێمنەت بێ، من لە چەقۆی ئەو ناترسم.

بۆخۆشم نەمدەزانی ئەو کەللەڕەقی‌یەم لەچیە؟ چاك یان خەراپ تووشی یاخی بوونێك ببووم و ئامادە بووم بەقیمەتی گیانی خۆم لەگەڵ خەڵك بەشەڕ بێم.

وەختی خەو دیسان قەدری هاتەوە سێ‌چوار کراسی خوری و پاڵتۆیەکی پێ بوو. پاڵتۆکەی پێ نیشان دام گوتم:

ـ پارەم نیە.

ـ چ سەگبابێك داوای پارەی لەتۆ کردوە؟ بۆ پێت وایە لەم دنیایەدا پیاوەتی نەماوە؟! ئەمانە سولەیمان بەگ بۆی ناردووی.

لە کاتێك دا لە سەرمان هەڵدەلەرزیم پاڵتۆکەم بەسەروچاوی قەدری دا دایەوە:

ـ بۆی بەرەوە با دایکی لەبەری بکا. ئەتۆش بەرێگای خۆت دا بڕۆ. جارێکی دیکە بێیەوە ئێرە ئەوەندەت لێدەدەم هەرچی ئەندامتە لە هەنجیر نەرمتر بێ. تێگەیشتی!!

قەدری تفێکی فڕێ داو ڕۆیشت:

ـ سولەیمان نایەڵێ لەوە زیاتر ئەم غەڵەتانە بکەی. هەتا ئێستا پێنج پیاوی کوشتوون.

بەراستی واش بوو. سولەیمان دایکی خۆفرۆش کەس نەیدەوێرا لەبەری بکۆکێ. بەڵام لەگەڵ من چ سیاسەتێکی هەبوو؟ نەم دەزانی. دیارە چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو.

مەترسی نیزیك بوو. بەگژ پیاوی لەخۆم گەورەتردا چووبووم. هەموو بەندی-یەکان لایان وابوو بەم زوانە کارەساتێکی ترسێنەر لە بەندیخانەدا ڕوو دەدا!

سولەیمان پاڵتۆکەی بەسەر شانی دا دابوو، وەك ورچی بریندار دەهات و دەچوو.

سات بەسات مەترسی نیزیکتر دەبۆوە، بەڵام من بێ پەروا لێی درێژ ببووم و خەوێکی گرانم بەسەردا بار ببوو.

سبەینێ بەیانی هێشتا لەژێر بەتانی دا ئەم دیو ئەودیوم دەکرد کە لێپرسراوی قاوشەکەمان هاواری کرد "فەرید بێتە مەکتەب".

بە دڵەخورپە ڕاست بوومەوە جلەکانم لەبەر کرد. دەمزانی بۆ تەحقیقات بانگم دەکەن.

چوومە بەردەرگای مەکتەب فەرمانبەرەکە گوتی: "لەسەرێ داوایان کردووی سەبر کە با فەرمانبەرێك بێ بت نێرم".

لەسەر پلیکانەکان ڕاوەستا بووم، بیرم لەسەرەنجامی کاری خۆم دەکردەوە.

(ئادەم بابا) لەوسەری داڵانەکەوە دەرکەوت. ئەمیش لەکۆنەوە گیرابوو. بەڵام سەرو گوێلاکی ئەوەندە شپرێوو نارێك بوو کەس حەزی نەدەکرد قسەی لەگەڵ بکا. جلەکانی ئەوەندە شڕو پەتوور بوون هەموو گیانی بە دەرەوە بوو.

شووشەیەکی بەتاڵی بەدەستەوە بوو. هەر کە لێم نیزیك بۆوە شووشەکەی هەڵێنایەوە. خەریك بوو دەست بکەمەوە فریا نەکەوتم. ئەوەندەم زانی گرەشینکەیەکم لە چاوان هەستاو گوێم لەزرینگەی وردە شووشەکان بوو. ئیتر نەمزانی نەشەوە نەرۆژ.

هەموو کەس لای وابوو کارم تەواوە. کەچی بۆ ئێواریێ لە نەخۆشخانە وەهۆش خۆم هاتمەوە. چونکە دەرکەوتبوو بێتاوانم و حوکمی بەربوونم دەرچووبوو هەر ئەو شەوەی لەنەخۆشخانەوە مەرەخەستیان کردم.

سەرم پێچرابوو و جلەکانیشم خوێناوی بوون. بەو سەرو پۆتەڵاکەوە چوویامە هەر شوێنێك دەسبەجێ پۆلیس دەیگرتم. بۆیە بڕیارم دا بڕۆم بۆ دێیەکی زۆر چەپەك و پەنا.

پاسێك بەرەو ئەرزەڕۆم دەچوو لێی سوار بووم و رۆیشتم، بەڵکە بە پاشماوەی ئەو پارەی لە رۆژگاری مامۆستایەتیم دا پەیدام کردبوو لە قوژبنێکی وڵات دا پاروەوە نانێك پەیدا بکەم.

❋ ❋ ❋

لەو کاتەدا دەنگێك لەناو داڵانەکەدا بەرز بۆوە. هەموو گیانم لەرزی. کابرایەك بەناوو شۆرەتی خۆم بانگی دەکردم.

گێلە پێکەنینێکی ساردی کردو هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

ـ ئیشەڵڵا ئەمری بەربوونت هاتوە؟

ئەمن ئەوەندە تێك چووبووم نەمتوانی لەجێی خۆم ببزووم. گێلە کەلێنێکی دایە دەرگاکەو پرسی:

ـ چ باسە؟!

ـ هاوڕێکەت ئازاد بوو!

وەك بارێکی قورسم لەسەر شانی لابەرن قالبم سووك بوو. وەك تەیری سووك باڵ راست بوومەوەو بەشێواوی خواحافیزیم لە گێلە کرد.

ئەوەندەم دەست و پێی خۆم ون کردبوو کە لەبیرم چوو بپرسم دوایی بەسەرهاتەکە چ بوو؟

گێلە خۆی وەبیری هێنامەوە:

ـ هاوڕێ لانی کەم ناوونیشانەکەتم بدەیە بێمە لات و پاشماوەی چیرۆکەکەمت بۆ بگێڕمەوە.

داوای لێ بووردنم لێکردو لە چوونەدەرێدا ناوونیشانەکەمم دایە. قەرارمان دانا ئەگەر زۆر لەبەندیخانە وەمێنێ پاشماوەی بەسەرهاتەکەی بنووسێ و بۆم بنێرێ...

ماوەیەك پێچوو، وەخت بوو بیرەوەری رۆژانی بەندیخانەم لەبیر بچێ کە رۆژێکیان نامەیەکی گێلەم بۆ هات.

ئەم نامەیە باسی بەسەرهاتی سەیرو باوەڕپێ نەکراوی گێلەیە.

دیارە ئێوەش ناتوانن راوەستن تا پاشماوەی داستانەکە لە کتێبێکی سەربەخۆدا بڵاو بکەمەوە. ئەو نامەی گێلە بۆی ناردبووم ناوونیشانی لەسەر نەبوو. راست بەم جۆرە دەستی پێکرابوو:

ـ نیازم نەبوو بەسەرهاتەکەم بنووسم... دەترسم بڵاوبوونەوەی ئەم چیرۆکە هەنگامەیەکی زۆر پەیدا بکاو ناوی من کە لەمێژە لەبیر خەڵك چۆتەوە دووبارە بێتەوە سەرزارو زمانان.

لەلایەکی تریشەوە باش نیە ئەم بەسەرهاتە بڵاو بێتەوەو بکەوێتە دەستی کەڵەکبازەکان. ئەوان بە خوێندنەوەی بەسەرهاتی من لەشەرمان دەبنە تنۆکێك

ئاوو لەوەی کردەوەکانیان لەچاو هی من هیچ و بێنرخ دیارە هەست بە خوێریەتی دەکەن.
ئاخر من هیچ کاتێك نیازی هۆقەبازیم نەبوو. بەخودا ، بە پێغەمبەر قەت پێم خۆش نەبوو زیان بە کەس بگەیەنم، یان کڵاو لەسەری کەس بڕفێنم، بەڵام چ بکەم... پێشهاتەکان لەخۆم زیاتر بەسەر چارەنووسی من دا زاڵ بوون.
من تەنیا عەیبێکم هەبوو. هەر کارێکی پێم دەسپێردرا زۆر بەدڵسۆزی جێبەجێم دەکرد... بەرتیلم نەدەخوارد، مەراییم نەدەکرد، بێشەرەف نەبووم. هەر بۆیەش هەموو دەرگایەکم لێ داخرابوو. ئەوانەی سەریان لەو دەرگایانە هێنابووەدەر نەیاندەهێشت من بچمە ژوور.
هەرچەندی دەمەویست بە رێگای راستی و پاکی دا برۆم هەمووان بۆلای هۆقەبازی و بەدبەختی پاڵیان پێوە دەنام.
لێم گەڕێ ئەسڵی داستانەکەمت بۆ بگێرمەوە:
ئەگەر لەبیرت بێ باسم کرد کە بەسەری شکاوو پێچراوەوە سواری ئوتومبیل بووم و بەرەو ئەرزەرۆم وەڕێ کەوتم، بەڵکوو لە شوێنێکی پەسیو پاروەنانێك پەیدا بکەم.
ئەو جێگای دەمەویست بۆی بچم هەر ناوم دەزانی. کورێکی خەڵکی ئەو ناوە کە ماوەیەك لە بەندیخانە پێکەوە بووین زۆری باسی دێهاتی خۆیان بۆ کردبووم و سوێندی دابووم کە پاش بەربوونم سەری بدەم.
ئەوەشم پێگوتی کە ئێمەی خاوەن رابردوو ناتوانین لە شاری گەورە لەبەردەمی پولیس بژین.

خەڵکیش ئیتر پیاوی وەرناگرێ. کاتێك پیاو لاقی هەڵخیسکا هەموو کەس دەڵێ "نەکا بەسەر من دا بکەوێ". یەکەم کەس بەلەقە دوورت دەخاتەوەو دووهەم و سێهەم و چوارەمیش هەروا.

هەروا کە بەرێگادا دەڕۆیشتم لەناو ئوتومبیلەکەدا بیرم لە چارەنووسی خۆم دەکردەوەو نەخشەم بۆ داهاتووم دەکێشا. "ئێمە کە لەناو کۆمەڵدا دۆڕاندوومانە ڕواڵەتێکی سەیرمان هەیە، بەڵام بڕوا بکەن ئینسانی بەشەرەفین و نیازمان پاکە". شەوێکی تاریك بوو، زۆربەی نەفەرەکان وێژینگیان دەدا.

دەنگی ئۆتۆمبیل کە لەنێو بێدەنگی بیابان دا ئاوازێکی ترسێنەری هەبوو گوێچکەی منی ئازار دەدا.

ئەوەی لە تەنیشتم دانیشتبوو سەرو سیمایەکی شپرێوی هەبوو، بەڵام پیاوێکی تێك سمڕاو و بەخۆوە بوو. لێم پرسی:

ـ کەنگێ دەگەینە ئەو گوندە؟

کابرا دەستێکی بەسمێڵە زل و داچۆڕاوەکانی دا هێنا کە گەیشتبوونە سەر چەناگەی و بەدوودڵی‌یەوە وەڵامی دامەوە:

ـ خوا دەزانی... ئەگەر...

ـ ئەگەر چی؟

ـ ئەگەر ڕێگر پێشمان پێ‌نەگرن بەیانی دەگەینێ.

ـ ڕێگر؟ چ ڕیگرێك؟!

ـ ڕێگر ئیتر. نازانی ڕێگر چیە؟!

بەخۆم نەبوو دەستێکم بۆ پارەکەم برد کە لە گیرفانی چاکەتەکەم دا بوو، پرسیم:

ـ لێرە ڕێگر هەیە؟

ـ چما جێگا هەیە ڕێگری لـێ نەبێ؟ ئەویش ئێرە کە هەمووی چیاو حەستەمە. ئەو ڕێگرانەی لێرە هەن لە دنیادا هاوتایان نیە!

کابرای تەنیشتم باسی ئازایی و بێ ڕەحمی چەتەکانی لای خۆیانی بۆ دەکردم و منیش وەك مێژۆکە دەلەرزیم. پرسیم:

ـ چما ئێرە پۆلیسی لـێنیە؟

زەردەخەنەیەکی پڕمانای کرد:

ـ هە... یە... مەگەر دەکرێ دێیەك پۆلیسـی لـێ نـەبێ؟! دیـارە پۆلیسـیش هەیەو ڕێگریش هەیە.

خوا ڕزقی هەر کەسە لەڕێگایەکەوەدەنێرێ کاری ڕێگـر شـتێکەو کـاری پـۆلیس شتێکیتر! واش ڕێدەکەوێ جار جار دەست لەکاری یەکتر وەربدەن.

ـ کامەیان دەست لە کاری ئەوی تر وەردەدا؟

ـ دیارە، چەتە کاری بەکاری پۆلیس نیە، کەوابوو پۆلیس دەست لە کاروبـاری چەتەکان وەردەداو ئەو وەختەیە کە کار خەراپتر دەبێ!

کابرای گۆڕین کە دیتی زۆرم ئەو قسانە پێ سەیرن پرسیاری کرد:

ـ "تۆ کوێندەری؟"

ـ خەڵکی ئەستەمبووڵم.

ـ چما لە ئەستەمبوول دز نیە! لەوێش گیرفانبڕ نیە؟

ـ هەیە.

ـ چما پۆلیسی لـێ نیە؟

ـ ئەویش هەیە.

ـ دەی باشە... پۆلیسیش هەیەو دزیـش هەیـە. لێـرەش هەروایـە. ڕێگریشـمان هەیەو شوکور پۆلیسیشمان هەیە!

ـ باشه ئێستا ڕێمان پێ دەگرن؟

ـ کەس نازانێ. برای من! قیسمەت و نسیب. ئەگەر ئەمشەو نۆرەی ئەم جادەیە نەبێ بە ساخی دەردەچین و ئەگەر نۆرەشی بێ کاری هەمووما (تەواوە). دەتگوت باسی بەرنامەی ڕۆیشتنی کەشتیم بۆدەکا.

ترسم لێ پەیدابوو و دڵەخورپەم وێ کەوت.

"خوایە هاوار تووشی ڕێگرەکان نەبین. دیسان کارێکم بدەنە دەست... پارەکەم لێ دەستێنن جەهەننەم. دەترسم دیسان تووشی پۆلیس ببمەوەو ماوەیەکی تریش ئاوارەو سەرگەردان بم تا ئیسبات دەکەم بۆکوێ دەچووم و چ نیازێکم هەبوو!"

لەو بیرو بەرژەوەندانەدا بووم و چاوم گران ببوون کە بەجارێك دەنگی سێچوار تەقە هات. شۆفێرەکەمان کە دیار بوو چاوەڕوانی پێشهاتێك بوو زۆر تەڕدەستانە دووسێ جار ڕۆڵەکەی باداو ڕای گرت.

بەقەو سەرم وە میلە ئاسنەکانی ئۆتۆمبیلەکە کەوت و ژن و منداڵ دەستیان کرد بەزێرەزیر.

لەپێش هەمووان دا شۆفێرو شاگردەکەی دابەزین و پاشان ئەوانی تریش هاتنەخوارو ڕیز بوون.

لە خوار پاسەکەوە دووکەس کە سەرو چاویان بە گۆرەوی ژنانە داپۆشێبوو تفەنگ بە دەست و قامك لەسەر پەلەپیتکە ڕاوەستابوون.

شۆفێرو شاگردەکەی وەك منداڵان دەستیان دەهەوا کردبوون و لاقیان کەمێك بڵاو چەقاندبوون.

کیسەباخەڵ، سەعات، ملوانکەو ئەنگوستیلەی ژنانیان لە گوونی‌یان دەئاخنی.

دووسێ کەس مابوون نۆرەم بگاتێ.

بەندیەکان قانوونێکیان هەیە. "دز قەت شت لەدز نادزێ"

دەمەویست پێیان بڵێم هاوڕێیان! منیش لە خۆتانم، پەروەردەی بەندیخانەو کەڵەکبازم.

بەڵام پێش ئەوەی ئەم قسەیە بکەم یەکێك لە پشتەوە لوولە تفەنگەکەی لەسەر شانم دانا:

ــ دەست بەرز کەوە، زوویە درەنگە...

زمانم گیراو وەك فەنەریان خستبێتە بن باڵم دەستم بەرز کردەوە.

کابرای کە سەرو چاوی خۆی داپۆشیبوو گیرفانەکانم گەڕا. هەموو پارەکەو تەنانەت پاندان و قەڵەمبڕو چەرخەکەشمی دەرهێناو بەوەش ڕازی نەبوو دەستی بۆ پێڵاوەکانم درێژ کرد:

ــ دایان کەنە.

کەوشەکانم تازە کڕیبوون. لەسەرمانیش لێوەلەرزەم گرتبوو. ئەگەر کەوشەکانیشیان بردبام لە سەرمان دەمردم. بەپاڕانەوەوە گوتم:

ــ ئەمەیانم لێ مەستێنن.

کابرا مستێکی وای لە پەراسووم راکێشا سەری جەرگم پێوە یەشا!

ــ زووکە... بابە زووکە...

ــ بەسەرچاو.

دەسبەجێ کەوشەکانم وێدان و وەك منداڵی هەتیو دەستم لەبن هەنگڵم گرتن و لە قەراخێك ڕاوەستام.

خواخوام بوو کاری چەتەکان زووتر تەواو بێ و بڕۆن تا بچمەوە ناو ئوتومبێلەکەو نەختێك گەرمم بێتەوە.

وەختێك هەموو شتەكانیان باش تێك ناو لە چەند ئێسترێكیان باركرد، هێندێكیان لەگەڵ ئێسترەكان ڕۆیشتن و دووسێ كەسیشیان بە نەفەرەكانیان گوت سوار بن!

پاشان بۆ خۆشیان هاتنە ناو پاسەكەو گوتیان لێ خوڕە. هەتا چوار پێنج كیلۆمیتر دەڕۆیشتین دووسێ كەسیان دادەبەزاندو لەو بیابانە بەجێیان دەهێشت.

ئەوەندەم سەرما بوو شەقەشەقی ددانم ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت. باوەڕ كە لەوەختەدا پڕبەدڵ ئارەزووم دەكرد بمرم و ڕزگاریم بێ.

"ئاخر ئەمەش بوو بە ژیان! پیاو ببێ بە دەنكەدەسحێب لەنێو قامكی چارەنووس دا ڕۆژ هەتا شەوو شەوو هەتا ڕۆژ بێت و بچێ؟!".

دووسێ جار خەریك بوو ڕاست بمەوەو خۆم بەیەكێك لەچەتەكان دا بدەم، بەڵكوو گوللەیەكم لێدەن و خەلاسیم بێ، بەڵام لەلایەك لە سەرمان و لەلایەكیش وا دیار بوو لە ترسی گیانم بوو كە دەتگوت بەكورسی‌یەكەوە دووراوم.

بەرە بەرە خەریك بوو دنیا ڕووناك بێ، دیمەنی دەرەوە دەبینرا. گەیشتینە هەورازێك. لای ڕاستی جادەكە زۆر هەڵدێرێكی سەخت بوو. لای چەپیشی كێوو كۆسارێك بوو سەری لە ئاسمان دەدا.

چەتەكان فەرمانیان دا ئۆتومبیل ڕاوەستی و هەستانە سەرپێ. كاتێك دابەزین یەكیان كە لە هەمووان بەخۆوەتر بوو و ئەمری بەوانی تر دەكرد، سەری هێناوە نێوە ئۆتومبیلەكەو دەستی بۆمن ڕاداشت:

ـ هاكوڕە وەرە خوارێ!.

لە ترسان هەموو گیانم بوو بە ئارەق.

"ئەی هاوار لێرە کاریان بەمن چیە؟".

وەك مقەبا لەجێی خۆم راست بوومەوەو کەوتمەرێ. کاتێك بەلای کابرای تەنیشتم دا تێپەریم تەماشایەکی سەرتابەخواری کردم و بە ئاردئاوێژێکی تایبەتیەوە گوتی:

ـ بەستەزمانە کاری تەواوە!

پیرەژنێکی قەڵەو و تەنگەئەستوور کە تەنیا ژێر کراسێکی کەتانیان لەبەردا هێشتبوو سەرێکی راوەشاندو بەپەرۆشەوە گوتی:

"پیاو دەگێر گورگی کێوان بکەوێ دەگێر ئەم پیاوکوژانە نەکەوێ".

ئەم قسانە بۆنی خوێنیان لێدەهات، بۆنی ئازارو کوێرەوەری و بەدبەختیان لێ دەهات.

باوەڕ بکەن هێندە لە مردن نەدەترسام کە لەلێدان دەترسام، لەوەش ناڕەحەت بووم کە ئەم چەتانە لەنێو ئەو هەموو ژن و پیاوەدا کاریان بەمن چیەو بۆچی منیان هەڵبژارد!

ئەوەندەی دوعای دەمزانی لەبن لێوانەوە خوێندم و فووم لەخۆم کرد: "خوایە بەتەمای تۆ" و دابەزیم.

لە تەنیشت جادەی دووکەسی سەروچاوداپۆشراو و چوار ئەسپ ئامادە بوون. سەرۆکی چەتەکان تفەنگەکەی بەدەستەوە گرت و چەند تفەنگێکی لەتایەی ئوتومبیلەکەداو کون کونی کرد.

پاشان ئیشارەی بۆ ئەوانی تر کرد کە سوار بن و منیش لە پاشکۆی یەکێك لەچەتەکان سوار کەن.

ئەسپەکان بەغار بەرەو کوێستان دەڕۆیشتن. ئارام و ئۆقرەم لێ هەڵگیرابوو. دەمگوت ئێستا نا ئێستا ئەسپەکان رادەگرن و گوللەیەکم لە مەشکی دەدەن.

لە قوتابخانەی عسکەری مامۆستایەکمان هەبوو، زۆر پیاوێکی بەئەزموون و دنیادیدە بوو، هەمیشە پێی دەگوتین:

ـ کورینە لە تەنگانان دا هەمیشە پشووتان لەسەرخۆ بێ. زۆر پێشهاتی وا هەیە کە بە ڕواڵەت ناخۆشە بەلام ئەنجامی باشی هەیەو بە پێچەوانەش لەوانەیە پێشهاتێك بەڕواڵەت باش بێ بەلام ئەنجامێکی خەراپی لێ شین بێتەوە.

زۆر نموونەی بۆ دێنایەنەوەو دەیەویست بە هەرجۆر بێ ئەو فکرەمان بەرێتە مێشکەوە کە لە بەرامبەر ناخۆشییان دا لەسەرەخۆ بین.

ئەودەم زۆرم گوێ نەدەدا قسەکانی. بەلام لەو کاتەدا کە دیلی دەستی چەتەکان بووم و نەمدەزانی چارەنووسم بەکوێ دەگاو بەرەو چارەنووسی نادیاری خۆم دەڕۆیشتم ، نازانم چۆن بوو ئەو مەسەلەم وەبیر هاتەوەو تەواوێك سەبووری بە دڵم دا.

ئێستا دیلییەتی دەستی ڕێگرو پیاوخەراپان چۆن دەکرێ بەرهەمی باش بێ. بۆ خۆشم نەمدەزانی! دنیا بە تەواوی ڕووناك ببوو و هەتاو کەم کەم لەپشت کێوەکانەوە دەردەکەوت. دیمەنی خانووە قوڕینەکانی گوندێکی چکۆڵە لەدوور دەرکەوت.

سەرۆك ئەسپەکەی ڕاگرت و ئەوانی تریش کە بەدوایەوە بوون، ڕاوەستان...

هەموومان دابەزین... چەتەکان گۆرەوییەکانیان لەسەر دەم و چاوی خۆیان هەڵگرتبوو. هەر لەگەڵ چاوم بەرووکاری سەرۆك کەوت ناسیمەوە.

"ئاڵتانەشەل" کۆنە هاواڵی بەندیخانەم بوو.

ئاڵتان بە دەنگێکی بەرز پێکەنی:

ـ فەریدە گێل ئەتۆچی و ئێرە چی...؟!

لێی چوومە پێش و خۆمانە پێم گوت:

ـ خودا بت کوژێ ئاڵتان... بۆچی زووترت دەنگ نەکرد! ئەو قوماربازی‌یەت لە چیە؟

ـ نەمدەویست نۆکەرەکانم مەسەلەکە بزانن!

لە بەندیخانە خزمەتێکی باشی ئاڵتانم کردبوو... ڕۆژێکیان کە ئەو لەگەڵ سێ‌چوارێکی مل ئەستوور شەڕی بوو لەسەرم کردبۆوە...

ئاڵتان بەو دەستە قورسانەی مستێکی لەشانی دام:

ـ دەی هاوڕێ! پێت نەگوتم بۆچی هاتوویە ئەو ناوە؟

ـ دەستێك چاکەت و شاڵواری زیادیم هەبوو هاتم پێشکەشتانی بکەم!

ئاڵتان بەم گاڵتەیە پێکەنینی هات:

ـ مەترسە سێ چەندانە بۆت دەبژێرمەوە... من قەت چاکەی هاوڕێیانم لەبیر ناچێ.

پاشان دەستێکی بۆلای گوندەکە ڕاداشت:

ـ ئێرە ماڵی ئێمەیە... هیچ کەس نازانێ ئێمە ئەو کارانە دەکەین، لەهیچ مەترسە. دەستت وەدەستی من دەو کارمان لەگەڵ بکە، بەڵێنت دەدەمێ پاش ساڵێك ببیە میلیۆنێر. پاشان کوێت پێ‌خۆش بوو بڕۆ دانیشەو تا ماوی بەخۆشی بژی..

تەواوی لەشم کەوتە تەزووان... بڕوانە چارەنووسی من؟ هەر ئەوەندە مابوو ببمە چەتە. من کە لەبەر دزی و کاری چەپەڵ هەڵاتبووم، ئێستا تووشی کوێ ببووم؟

هیچ ڕێگام نەبوو جگە لەوەی قبووڵی بکەم. بەزۆری زەردەخەنەیەکم کردو گوتم:

ـ باشە، بەڵام دەترسم نەتوانم باشتان خزمەت بکەم.

ـ بە پێچەوانە، تۆ بەو هەموو هۆش و لێزانیەتەوە زۆر بەکەڵکی دەستەکەمان دێی. بۆ کۆڕێکی وەك تۆ حەیفە ژیانت بەهیچ و پووچ بگوزەرێ!
قەرارو مەدارمان بەست و چووینەوە ناو دێ. ئاڵتان ژیانێکی رازاوەی هەبوو. هەموو پێویستیەکی ژیانێکی خۆش و ئاسوودەی بۆ خۆی دابین کردبوو.
بەڵام بۆمن کە دەمەویست بەپاکی بژیم و بە رێگایەکی حەڵاڵ دا پاروە نانێك پەیدا بکەم، بەشداربوون لە کاری ئەوانەدا عەزابێکی گەورە بوو.
هەر لە یەکەم ساتەوە کەوتمە بیری ڕاکردن، هەرچەند دەمزانی ئەگەر دەگیر کەوم حەتمەن دەکوژرێم، بەڵام لە هەڵاتن بەولاوە چارەیەکم نەبوو.
هەر چۆنێك بوو ئەو رۆژەم ڕابوارد. شەوێ ئاڵتان و هاوڕێکانی خۆیان سازکرد بچنە "ڕاو"و منیش بەبیانووی ماندوویی و سەرمابوون لە ماڵێ مامەوە.
ئاڵتان هەر چەند زۆریشی بڕوا پێ دەکردم. جلەکانمی لە وچخان هاویشت و دایخست و گوتی جا بۆخۆت بحەسێوە.
نیوەشەوێ ئەوان رۆیشتن. کاتێك دڵنیا بووم ڕۆیشتوون لە ماڵێ هاتمەدەرو هەر بەتوێی کراس و دەرپێیان کەتەکەوشێکم بەسەر پێوە کردن و بەرێگایەك دا کە نەمدەزانی دەچێتە کوێ وەدوای چارەنووسی نادیاری خۆم کەوتم. زۆر بەرێگادا ڕۆیشتم. لەدڵی خۆم دا دەمگوت ئەگەر تووشی چەتەکان بم یان پۆلیس بم بینێ جوابم چ بێ؟
بێدەنگی شەو و رێگای ناهەموارو لە هەمووی خەراپتر سەرما، تینیان لەبەر بڕیبووم. خەریك بوو لەپێ بکەوم کە بەدبەختیەکی تازە، هاتەپێش.
هەورێکی رەش و چڵکن بەری ئاسمانی گرت و دای دایە بارانێکی بەخوڕەم.
"ئەی خوایە ئەمە چ بەدبەختی‌یەکە... خۆ ناکرێ بەو بارانە بەرێگادا بڕۆم".

هەموو گیانم تلّیسابۆوە. دەتگوت گوێلکت لە مانگایە راکێشاوە. ناچار لە پەنای گاشە بەردێك پاڵم لێ دایەوە.

لە پشت گاشە بەردەکەوە ئەشکەوتێکی بچووك هەبوو. چوومە ژوورو بەترس و لەرزەوە دەستێکم لە دەوروبەری خۆم کوتا "نەکا درندەیەکی تێدابێ و لەبەریێکم هەڵدڕێ".

لە قوژبنێك بوخچەیەکم دۆزیەوە. لەسەرەخۆ دەستم لێ کوتا دیتم باڵتۆیەکی تێدایە.

دەسبەجێ خۆم ڕووت کردەوە کراس و دەرپێیەکەم فرێ دان و پاڵتۆکەم لەبەر کرد. لەشم گەرم بۆوە، بەڵام نەمدەزانی برینەکەی سەرم چ لێ بکەم. ئاوو سەرما کاریان لە برینەکە کردبوو زۆری ئازار دەدام. دانیشتم دەستم لەبن باخەڵم ناو بۆ ئەوەی برینەکەم نەختێك هێدی بێتەوە دەستم کرد بە سەرڕاوەشاندن.

نازانم زۆرێ پێچوو بوو یان کەم، لەبەر بێ خەوی ئاگام لەخۆم نەبوو، ژانی سەریشم دەقیقەیەك هێدی نەبوو. لەو حاڵەدا ڕەنگە قسەشم پەڕاندبن و دەردی دڵم کردبێت و لەبەر خودا پارابمەوە، هەر ئەوەندەم زانی گوێم لە دەنگێك بوو، کە چاوم هەڵێنا دیتم یەکێك لەپێشم راوەستاوەو سەرم بۆ دادەنوێنێ و دەپارێتەوە.

لەو ناڕەحەتی و بێهێزی و سستی‌یەدا پرسیم: "کێیە؟!"

ـ خاکی بەرپێی حەزرەتی شێخم.

واقم وڕما، چاوم چاك هەڵێنان. کابرای لەپێشم راوەستابوو موویەکی درێژو ریشێکی ئەستووری هەبوو. لەسەرو سیمای ڕا دیار بوو دەروێشێکی

گۆشەنشینەو لە ئاکارو رەفتاری دا تێگەیشتم منی لەگەڵ پیرو مورشیدەکەی لێ گۆڕاوە.

دیسان هێندەی نەمابوو پێبکەنم، ئەگەر رۆژی رووناك بوایە، ئەگەر زانیبام بۆ کوێ دەچم و بەرنامەم چیە هەر لەوێ راست رەوان دەمگوت:

"بابە گیان! مام دەروێش! بەهەڵە چووی، ئەمن پیرو مورشید نیم و خاوەن رابردوویەکی لە هەموو جێگا دەرکراوم کە لەبەر بەدبەختی و ناچاری پەنام بۆ ئەم ئەشکەوتە هێناوەو لەسەرمان باڵتۆکەی تۆم لەبەرکردوە".

بەڵام لەو کاتەدا هیچ چارەم نەبوو، دەبوو ئەم قسانەی لێوەرگرم و بەسەر ڕاوەشاندن بۆی تەئیید بکەم.

دەروێش کە پێی وابوو خەریکی تاعەتم و "وردو زکر"م تەواو نەبووە بەسپایی لەئەشکەوتەکە وەدەرکەوت و بەو چەقی سەرمایە لەبەر دەرکی ئەشکەوت دەستی لەبن هەنگڵی ناو ڕاوەستا.

یەك دووسەعات پێچوو. هەرچی بیرم کردەوەو سەری خۆم هێناو برد کە چ بکەم و چارم چیە هیچ ڕیگایەکم نەدۆزیەوە بێجگە لەوەی ماوەیەکیش ئەم "رۆڵ"ە یاری بکەم.

بیستبووم زۆر کەس لەو رێگایەدا بوونە هەموو شتێك و ئێستا کە بێئەوەی من بمەوێ، هەموو هەل ومەرجێك پێك هاتوە بۆچی شەق لەبەختی خۆم هەڵدەم؟

رۆژ رووناك ببوو کە لە دەروبەری ئەشکەوتەکە گوێم لەدەنگەدەنگێك بوو. گوێم هەڵخست بزانم چ باسە؟ دوسێکەس لە شوانەکان لەگەڵ دەروێش قسەیان دەکرد. ئەمانە جیرەی رۆژانەیان بۆدەروێش هێنابوو. دەروێشیش خەبەری هاتنی پیرو مورشیدی گەورەی پێدەدان!

دەیگوت زوو خەبەر بە خەڵکی ئاوایی بدەن کە خواردن و جل و بەرگی بۆ بێنن...

" ئەی هاوارو داد. خەریکە کارەکە زل دەبێ... نەکا بە جارێك پیس ببێ! ".

دەرویش پرێسکەیەکی هێنا ژووری، لە پێشی دانام و دەستەونەزەر ڕاوەستا. چاوێکم لێهەڵتەکاند بچێتەدەر دەسبەجێ وەدەرکەوت. پرێسکەکەم کردەوە نان و گۆشتی سوورەوە کراوو پیواز بوو. لەبرسان لینگم دەلەرزین، دووسێ پارووم خوارد هاتمەوە سەرەخۆم . پاشان پرێسکەکەم پێچایەوەو دووبارە دەستم کردەوە بە سەر ڕاوەشاندن.

ڕۆژ درەنگ بوو هەتاو بەرز ببوو، ئەشکەوتەکەی رووناك دەکرد کە دەنگە دەنگێکی زۆر لەدەرێ پەیدا بوو.

دەنگی پیاو، ژن، منداڵ... پیرو لاو تێکەڵ ببوو. هێندێك دەیانەویست من ببینن، بەڵام دەرویش نەیدەهێشت:

ـ ڕاوەستن، لەسەرەخۆ بن تا ئیجازە لەپیر وەردەگرم.

زوو خۆم کۆکردەوە. دەرویش هاتە ژوور، دەست لەسەر سنگ لەبەر دەستم ڕاوەستاو گوتی:

ـ چەند کەس هاتوون بۆ زیارەتی جەنابت.

بە ئیشارەی سەر گوتم با بێن. دەرویش چووە دەرو بە دەپازدە پیاوو ژنەوە هاتەوە.

ئەوان زۆر بەرێزو ئەدەبەوە هاتنە پێش، دەستیان ماچ کردم و لەسەر سەریان داناو پاشەوپاش کشانەوە.

ڕەنگە پێت وابێ ئەو قسەیەم ساز کردوە، بەڵام سوێند دەخۆم درۆی تێدا نیەو هەروا سووك و هاسان بوومە پیری گەورەی ئەو مەڵبەندەو نازناوی "پیری عوریان"م وەرگرت.

پاشان تێگەیشتم کە ئەو پایەبەرزەیان هەروا بەرێکەوت نەداوە بەمن ، بەڵکە زۆر لەمێژ بووە کە خەڵکی ئەو ناوە چاوەڕوانی هاتنی پیری گەورە بوون. ئەم باسە داستانێکی سەیری هەیە کە لە جێگای خۆی دا بۆت باس دەکەم.

هەرچۆنێك بوو هاتنی من لەگەڵ جێژن و شادمانی خەڵك بەرەو ڕوو بووو هەموو خەڵکی گوندەکانی دەروبەر بۆ زیارەت! ! هێرشیان هێنا !

زۆریان پێشنیاریان دەکرد بچمە گوندی ئەوان. ئامادە بوون ماڵ و خانەقام بۆ دروست بکەن. بەڵام سەرم لێ ڕادەوەشاندن و ڕووم پیشان نەدەدان.

کەس نەیدەپرسی کێم و لە کوێوە هاتووم. یەکێك دەیگوت "لە سەمەرقەندو بوخاراوە هاتوە" هێندێك دەیانگوت "لە شیرازو حیجازەوە هاتوە"، بەشێك دەیانگوت "لە پێشدا تەشریفی لە عیشق ئاوا بووە".

هەموویان تکایان لێ دەکردم کە لەمەودوا هەر لە ناویان بمێنمەوەو بەجێیان نەهێڵم.

منیش جوابێکی روونم نەدەدانەوە. بێ ئەوەی نیازێکی تایبەتیم هەبێ خۆم دابووە دەستی قەزاو قەدەرو چارەنووس "هەرچی دەبێ با ببێ".

خەڵك هەر لەو شوێنە خانەقایەکی گەورەیان بۆ دروست کردم و دوو ئێشکچی-یان بەخەرجی خۆیان بۆ بەکرێ گرتم.

ئەو بزن و مەڕانەی بەدیاری هەموو ڕۆژێ بۆم دەهاتن هێندە زۆر بوون کە ناچار بوون شوانێکیان بۆ بگرن. سێ چوار هەفتە بەسەردا تێپەڕیبوو، نەمدەزانی

لەگەڵ دەروێش تەگبیرم چیە. لەو ماوەیەدا لەدەپازدە وشە بەولاوە قسەم لەگەڵ نەکردبوو.

لەو بێدەنگی و کەش وفشەی بۆ خۆم تاشی بوو زۆر نارەحەت بووم. دەترسام ئەگەر خۆمانە قسەی لەگەڵ بکەم و لەمەسەلەی حاڵی بکەم کارەکە خەراپتر بێ. ئەگەر تا سەریش بم ویستبا هەروا بمێنمەوەو ئەو رۆڵە یاری بکەم لەبەر تەنیایی خۆم شێت دەبووم.

بۆیە زوربەی زۆری شەو و رۆژ بە بیانووی تاعەت و زیکر بەتەنێ لەژووری دەمامەوەو دەنوستم!

دەروێش زۆر بە ئەدەبەوە ئەرکی دەرکەوانی بەجێ دەگەیاندو کاتێك لە ژوورەکەی خۆم بووم نەیدەهێشت هیچ کەس بێ ئیزنی من بێتە ژووری.

رۆژێك دەروێش هاتەژوورو گوتی:

ـ ئاغا دەیەوێ بێتە زیارەتت. ئیزن دەفەرمووی؟ لەبەر ئەوەی هەموو کەس لای وابو هەموو شتێك لە غەیبەوە دەزانم نەم دەوێرا بپرسم "ئاغا کێیە؟!"

گوتم: "بابێ!".

پێم وابوو ئاغا هاتوە بەڵام دوای تاوێك چاوەڕوانی تێگەیشتم نۆکەرەکەی ناردوە ئیزنی بۆ بخوازێ، بۆ خۆی دوایە دێ.

پاش نوێژێ دیسان بەبیانووی نوێژەوە دەژوورێ خزابووم و نوستبووم، بە دەنگی هەراو هوریایەك وەخەبەر هاتم. چاکم گوێ لێبوو لە دەرێ چەند کەس لەگەڵ دەروێش کێشەیان بوو. دەروێش دەیگوت:

ـ شێخ خەریکی "ذکر"ە تا تەواو نەبێ ناتوانم ئیزنی لێوەرگرم. کابراش دەیگوت:

ـ ئاخر باش نیە گیری بکەین.

لە قسەکانیان وا تێگەیشتم فەرمانبەرانی رەسمی دەوڵەت هاتوونە سەردانم، بەڵام دوایە حاڵی بووم "ئاغا"یە...

هەر لە ژوورێ ڕا هاوارم کرد لێی گەڕێ "ئاغا" بێتە ژوور. لەوەی کە لە ناو ئەو هەموو هاتوچۆکەرانەدا لە ژووری دەرگا پێوەدراو ڕا دەزانم کێ دەیەوێ بێتە لام دەروێش زۆر سەربەرز بوو، گوتی:

ـ دیتان! "مورشید" کەرامەتی هەیەو لەپشت دیوارەوە ئاگای لە هەموو کاروباری ئەم دنیایە هەیە؟ توندتر هاوارم کرد:

ـ کوڕە دەڵێم ئاغای ڕامەگرن. با بێتە ژوور.

دەروێش لە دەرێ ڕا وەڵامی دایەوە:

ـ بەسەر چاو... ئێستا دێ!!

لەسەر تەختە دارینەکە لەسەر چۆکان دانیشتم و پاڵتۆیەکەم توند دەخۆمەوە پێچا!

لەو رۆژەوە هاتبوومە ئەو جێگایە ریشم نەتاشیبوو، بەسەری پێچراوو مووی تێك چرژاوەوە سەرو سەکوتێکی سەیرم هەبوو.

دەرگا کرایەوە. پیاوێکی لاوی جوان چاك بەخۆی و پێنج شەش نۆکەرەوە هاتنە ژوور.

"ئاغا" زۆر پیاوێکی بە دیمەن و لەبەردڵان بوو، بەڵام نۆکەرەکانی مل ئەستوورو سمێڵ فش و ڕەزاگران بوون.

وەك پەیکەرێکی لەبەردتاشراو و بوتێك کە لەسەر چوار پێچکە دای دەنێن جووڵەم لەخۆم بڕیبوو. "ئاغا" بەرێزەوە سەلامێکی کردو بە ئەدەب هاتە پێش دەستی گرتم و ماچی کرد.

منیش بە ئیشارەی سەرو بە دەنگێکی گڕو شێخانەوە گوتم:

ـ خوا بت پارێزێ.

که چاکی لێ ورد بوومەوە دیتم "ئاغا" زۆریش گەنج نیەو چل، چل و دوو ساڵێك دەبێ.

"ئاغا" هەر بەو جۆرە کە دەستی بە سنگیەوە گرتبوو، گوتی:

ـ من هاتووم لە نفوسی پاکی جەنابت داوای دوعای خێر بکەم .

لە کاتێك دا ڕیشم بە قامکی دەستم شانە دەکرد گوتم:

ـ دوعای خێری ئێمە هەمیشە هەموو خەڵکی ئەم ناوە دەگرێتەوە.

"ئاغا" سەرێکی بۆ دانواندم و منیش لەدڵی خۆم دا دەمگوت ئەگەر ئەم کابرایە بزانێ من چ کارەم، چیم پێ دەڵێ؟

ئاغا گوتی:

من خاوەنی ئەم گوندانەی دەوروبەرم. تکات لێ دەکەم زەحمەت بکێشی و گەورەمان بکەی و ماڵەکەمان بکەیە موتفەڕك.

ـ بەسەر چاو... وەختێك دێم.

ئاغا داوێنی ماچ کردم و پاشەوپاش کشایەوە، منیش هەروا لە جێگای خۆم دانیشتبووم تەنیا سەرم دەلەقاند.

چەند ڕۆژ دواتر کە قەرار بوو بچمە سەردانی ئاغا، دە نۆکەری لە دوا ناردبووم. دەئەسپی زیادیشیان بۆ پیاوەکانی من هێنابوو. بەدبەختی لەوەدا بوو کە من قەت سوار نەبووم و شارەزای ڕێ و شوێنی ئەسپ سواری نەبووم.

دڵم زۆر ترسا "ئەی هاوار خوایە ! نەکا لە ئەسپەکەم بەربیمەوەو ئابڕووم بچێ؟!".

بە گەورە نۆکەری ئاغام گوت:

ـ ڕۆڵەگیان من قەت رازی نیم حەیوانی بەستەزمان ئازار بدەم هەمیشە بە پێیان دەڕۆم. هەمووان بنێرەوەو بۆ خۆت وەمێنە پێکەوە دەچین.

"مەکۆ" زۆری پێ خۆش بوو کە گوتم بەتەنێ وەمێنەو لەگەڵ من وەرە. ئەمە نیشانەی ئەوەبوو کە زۆرم باوەڕ پێ هەیە.

دەسبەجێ فەرمانی دا هەموو ڕۆیشتن و بە ئەدەبەوە گوتی:

ـ ئەگەر لەبەرت بەزەحمەت نەبێ نێو قەدبڕ بڕۆین پێش وان دەگەینێ. گوتم:

ـ نا خاترجەم بە، ئەمن بە هیچ شتێك نارەحەت نابم.

"مەکۆ" هەموو کوێرەڕێکان شارەزا بوو، بەڕێگایەکی چۆڵەپێچەی دا بردم، ڕێگایەکی زۆر دژوارو ناخۆش بوو، بەڵام دەمزانی بچوکترین سکاڵا بکەم ئابڕووم دەچێ. ئەمانە لە کەشف و کەرامەتی من چاوەڕوانی شتی زۆر لەوە گەورەترن. لە دڵی خۆم دا هەزاران جنێوم بەخۆم دەدا. لە ماندوویێتی و لەترسان و لەبەر دڵەکوتە هێندەی نەمابوو لەپێ بکەوم کە گوندی ماڵی ئاغا وەدەرکەوت.

ئەمجار ڕێگاکەمان سەرەوژێر بوو. پاش چەند دەقیقەیەك گەیشتینە قەڵای ئاغا. ئاغا بەخۆی و نۆکەرەکانیەوە بە پێشوازمەوە هاتبوو، دەستی ماچ کردم و پرسی:

ـ ئەوانی دیکە لەکوێ بەجێمان؟

"مەکۆ" لەجیاتی من جوابی دایەوە:

ـ ئەوان لە ڕێگادان.

بەراستیش ئێمە پێش ئەوان گەیشتبووینەجێ و ئاغاش و نۆکەرەکانیش سەریان لەمە سوڕمابوو!

چووینە ژووری قەڵا. بەدیتنی ماڵی ڕەنگین و شتوومەکی جوان و نایاب و ئاخر مودێلی ئاغا بەجارێك واقم وڕما.

دیوەخانـەی ئاغـا لـە سـالۆنی میلیونێرەکـانی ئەسـتەمبوولیش جـوانتر بـوو. کتێبخانەیەکی گەورەی پڕ لە کتێبی زانستی و هونەری تێدا هەبوو.

قاوەیان هێناو یەك لێرەو یەك لەوێ دەست بەقسان کرا. ئاغا بـۆی بـاس کـردم کـە سـالێ تـەنیا سـێمانگ لێرەیـەو ئەوەکـەی تـری لـە ئەسـتەمبوول دەبـێ. دووکوڕی لە بەریتانیان و کچەکەشی لە سویسرا مێـردی کـردوە. سـات بەسـات زیاتر سەرم سوڕدەما. نۆکەرەکانی نیو سەعات دوای ئێمە گەیشتنەجێ.

پاش ماوەیەك یەکێك لە نۆکەرەکان هات و گوتی:

ـ نیوەڕۆژ حازرە.

ئاغا نۆکەرەکانی ئیزن داو زۆر بە ئەدەبەوە فەرمووی منی کـرد بـۆ ژووری نـان خواردن.

هەتا ئەودەم قەت سفرەی وا رازاوەم نەدیبوو.

چـەند جـۆرە خـواردن لەسـەر مێزەکـە دانرابـوو. لـە ناوەڕاسـتی مێزەکـەش دا سینییەکی پڕ لە خواردنەوەی جۆراوجۆر دانرابوو.

ـ تۆ چ مەشرووبێك دەخۆیەوە؟

بەشێوەیەکی سەیر گۆیا بێزم لەوشتانە هەڵدەستێ سەرێکم ڕاوەشاندو گوتم:

ـ بۆ ئێمە خواردنەوەی ئەو شتانە حەرامە.

خۆزگە ئەم قسەیەم نەکردبایەو احترامی خۆم نەشکاندبا. لەگەڵ ئەو قسەم کرد ئاغا بە راوێژێکی تایبەتیەوە گوتی:

ـ سەگی سەگباب درۆ لەگەڵ منیش دەکەی؟

بەو قسەیەی هەموو گیانم لەرزی. پێم وابوو گاڵتـە دەکـا، بـەڵام کـە سـەیرێکی چاوانیم کرد دیتم بەڕاستی وا دەڵێ.

هەوڵم دا خۆم نەدۆڕێنم، پێکەنینێکی ساردم بۆ کردو گوتم:

ـ جەنابت فەرموو تۆشی گیانت بێ بەڵام من ببوورە.

نەڕاندی:

ـ پیرەسەگ ها بگرە بخۆرەوە لەگەڵ تۆمە.

بەو فەرمانەی دوایی بەندی جەرگ و دڵانم پسا، لەبنەوە سەیرێکی چاوانم کردەوە. دیمەنی تەواو وەك جانەوەرێکی دڕندە دەچوو، تێگەیشتم رێگا نیە دەبێ بەقسەی بکەم.

تێ نەدەگەیشتم ئەم لە نەکاو گۆڕانە مانای چیەو چۆن بوو ئاغا کە ئەو هەموو رێزەی لێ دەگرتم بە جارێك هێندە گۆڕا.

بێ ئەوەی متەقم لەبەر بێتە دەرێ پەرداخەکەم هەڵگرت یەك بێن چۆڕپڕم کرد.

ئاغا بە گەرمەوە سەیرێکی سەرو چاومی کردو گوتی:

ـ ئافەرین، ئەگەر نەت دەخواردەوە ئەوەندەم بە مستان لەپشت ئەستۆیە رادەکێشای تا خۆت پیس دەکرد!

پەرداخێکی ترم خواردەوە ئەمجار ئاغا بە دەستی خۆی مەزەی لەزارم دەخست و گوتی:

ـ ئێستا دڵنیا بووم کە بۆ ئەم کارە لێوەشاوییت هەیە!

قسەکانی زۆر بە توێکڵ بوون. هێشتا نەمدەزانی مەبەستی لە "ئەم کارە" چیە؟

بیرم لەوە دەکردەوە کە خوایە ئەمە چ بەڵایەکە تووشی بووم.

"ئاغا" پەرداخی سێهەمی پڕکردو دایە دەستم و پرسی:

ـ چۆن بوو هاتیە ئێرە؟! نەمدەزانی چی جواب بدەمەوە. راستیەکەی پێ بڵێم یان هێندێك درۆ تێك بکەمەوە.

"ئاغا" زەحمەتی منی کەم کردەوەو گوتی:

ـ تا ئێستا چوویە بەندیخانە یان نا؟ نەختێك پێ کەنیم:

ـ ببوورە قوربان، کارم بە بەندیخانە چ بووە؟

گوتی:

ـ درۆ لەگەڵ من مەکە لەسەرتاپات دیارە کە خاوەن رابردووی!

بێدەنگ بووم. وەك ئەوە دەچوو کە ئاغا ئاگای لە هەموو ژیانی من هەیە.

ـ ئەگەر بەندیخانەت نەدیبێ نایەڵم دەقیقەیەکیش لێرە وەمێنی. دیتم قسەکانی بەراستین و درۆی لەگەڵ ناکرێ:

ـ ڕاستیەکەی. چەند رۆژێك گیراوم.

ئاغا گوڵی کردو لەقاقای پێکەنینی دا:

ـ ئێستا بوویە پیاوێکی حیسابی، باشە بڵێ بزانم لەسەرچی گیرای؟

چما دەکرا بڵێم بەتاوانی کەڵەکبازی؟ گوتم:

ـ لەگەڵ کابرایەك بەشەڕ هاتبووم.

ئاغا تەماشایەکی سەرو سەکوتی کردم:

ـ تۆ وەك ئەوەی ناچی لە خەڵك بدەی. ڕاستیەکەی بڵێ، دیارە دزیت کردەوە؟

ـ بەڕاستی، لەهیچ و خۆڕا بە تاوانی کەڵەکبازی چوومە بەندیخانە.

ـ ئاها... ئەمە تەواوە. ئیتر لەتۆ باشترمان دەست ناکەوێ. لە ئاسمانێت لێ دەگەڕام، لە عەرزێم وەگیر کەوتی. پرسیم:

ببوورە. دەکرێ بفەرمووی بۆچی بەدوای من دا دەگەڕای:

ـ ئێمە هەمیشە کەسێکمان دەوێ خەڵکی سەر گەرم بکا. پێش تۆ یەکێك لێرە بوو نەیتوانی خۆی بپارێزێ و پەتەی کەوتە سەرئاو.

بەڵام تۆ باشت دەست پێکردوە. ئەگەر بتوانی تاسەر وا بچیە پێش هەتا دەمری پارووت دەڕۆنی کەوتوە.

کاتێك نۆکەرەکانم گوتیان پیاوێکی رووت و قووت لە ئەشکەوتێ پەیدا بووەو ئامادە نیە بێتە ئاوەدانی، زۆرم پێخۆش بوو، لەدڵی خۆم دا گوتم "دیارە ئەمە یەکێك لەو قومارباز‌انەیە). فەرمانم دا پێویستیەکانی ژیانت بۆ رێك بخەن و بۆ ئەوەی لە پێش چاوی خەڵك حورمەتت زۆر بێ بۆ خۆشم هاتمە سەردانت.

ئەمە قانوونێکی گشتی‌یە: شێخ و ئاغا دەبێ هەمیشە دوور لە خەڵك بژین.

وەك "کوێر ئوغڵی" دەڵێ ئەوەتا دیموکراسی پەیدا بووە گەورەیی لەناو چووە. هەر پیاوێکی گەورە زۆر هاتوچۆی خەڵك بکاو ڕووی خۆشیان پێشان بدا احترامی کەم دەبێ.

شێخی پێشوو لەبەر ئەوەی ئەم قانوونەی بەرێوە نەبرد ناچار بوو بەشەو بۆی دەرچێ!

پرسیم: کام قانوونی بەرێوە نەبرد؟

وەڵامی دایەوە:

ـ سێ قانون هەیە دەبێ زۆر بە وردی لە پێش چاوت بن.

کەسێك بیهەوێ لەبەندیخانەدا هیرۆئین بفرۆشێ دەبێ چ بکا؟ لەپێش دا دەبێ لە دەرەوەی بەندیخانە فرۆشیارێك بدۆزێتەوە. ئەمجارە دەبێ لە ناو بەندیخانەش دا بەهێز بێ و هەموو کەس رێزی لێ بگرێ. دوای ئەمانەش دەبێ کاربەدەستانی بەندیخانە بەدزیەوە ئاگایان لەو مەسەلە هەبێ.

ئەمە وەك لا دیوارە سەرەکیەکانی خانوو وایە. ئەگەر لا دیوارێکی کەم بێ یان سست و ناتەواو بێ ناتوانێ لە بەندیخانەدا هیرۆئین بفرۆشێ.

کاری تۆش ڕاست وەك ئەمە دەچێ. لەپێش دا دەبێ دڵی ئاغای ئەم ناوە ڕابکێشی کە ئێستا بەرامبەرت دانیشتوەو بەتەواوی لەگەڵت یەکە.

دووهەم قەدرو ڕێزی خۆتە کە ئێستا ئەویشت هەیەو هەموو خەڵکی ئەو ناوە بە شێخێکی گەورەو کەرامەتدارت دەزانن. ئێستا لە هەمووماڵێك و هەموو مەجلیسێکی ئەم مەڵبەندە باس باسی تۆیە.

خەڵك قسەی سەیر سەیر دەکەن. دەڵێی گرۆدرۆیان پێکەوە کردوە. هەرچەند هەموویان دەزانن قسەکانیان درۆیە تێدەکۆشن بە هەزار سوێندو قورعان کەرامات و کاری دوور لە باوەڕ بۆتۆ داتاشن.

هەر ئەمڕۆ کە تۆ بەرێگای چیاو نێو قەدبڕدا هاتووی و نۆکەرەکانم بەجادەدا هاتوون و درەنگتر گەیشتوونەجێ مقۆ مقۆیەکی زۆری لێ پەیدا بووە. گوێم لێبوو چەند کەس سوێندیان دەخوارد کە بەچاوی خۆیان تۆیان لەپشت هەورانەوە دیتوە کە بەباڵان فڕیوی!

ئەم خەڵکە ئەخلاقێکی سەیریان هەیە. جاری وا هەیە شتەکە وا ساز دەکەن کە لە خۆشیان دەگۆڕێ و باوەڕ بەدرۆی خۆیان دەکەن.

شێخەکەی پێشووشمان تووشی ئەو بەدبەختیە بوو. ئەتۆ دەبێ زۆر وریا بی خۆت لێ نەگۆڕێ، دەنا زۆر بەپیسی لێرەت وەدەر دەنێن و سەر لە نوێ ئاوارەو دەربەدەر دەبیەوە، دزی دەکەی دووبارە دەتگرنەوەو دات دەکەنەوە.

پرسیم: قانونی سێهەم کامەیە؟

ئاغا سەرێکی ڕاوەشاند:

قانونی سێهەم ڕازی کردنی پۆلیسە.

لەگەڵ بیستنی ناوی پۆلیس مچوڕکێکم بەلەش دا هات خەریك بوو لەجێی خۆم وشك بم.

"ئەی هاوارو داد هەرچەندی لەبەر پۆلیس هەڵدێم چارەنووسی ژیان لەگەلیانم گرێ دەداتەوە".

ئاغا کە تێ گەیشت ڕەنگم پەڕی و زۆر تێك چووم پرسی:
ـ چما باسی جندۆکەم کردەوە؟... پۆلیس بۆ لێ ترسان نابێ...؟!
ئەگەر لە رابردووەکەت دەترسی، خاترجەم بە. هەتا بە قازانجی ئەوان بجووڵێیەوە کاریان بە کارت نیە. کاربەدەستانی دەوڵەتیش ڕێیان ناکەوێتە ئێرە.
تەنیا نوێنەرانی پارلەمان لەوەختی هەڵبژرادن دا پەیدا دەبن و ئەمەش یەکێك لە دژوارترین ئەرکەکانی تۆیە کە دەبێ بە لێزانی و تەڕدەستی رۆڵی خۆت یاری بکەی.
تووشی تەڵەیەکی باش هاتبووم. گوتم:
ـ ئاغا ئەمن ئەو پیاوە نیم کە تۆ بیرت لێ کردۆتەوە. من شیاوی شێخایەتی نیم و ئەم کەڵەکبازیەم پێناکرێ. ئەمن پیاوێکی پیشینەدارو کەڵەکبازم کە هەموو کەس دەمناسێ‌و کارێکم لە دەست نایە. ڕێگا بدە بڕۆم وەدوای کاری خۆم بکەوم.
ئاغا سەرێکی لێ ڕاوەشاندم:
ـ پێت وایە ماڵی پوورتە هەروەخت کەیفت لێ بوو بێی و هەر کاتێك وەڕەز بووی بڕۆی... چۆن گاڵتە بە بیروڕای گشتی دەکرێ.
ئەو وەختەی دەکەوتیە ناو "چاڵ" فکری وات کردبایە، نەك ئێستا کە هەموو بەشێخێکی گەورەت دەزانن و هومێدیان پێتە.
بە پاڕانەوەوە گوتم: چما ئاسمان دەرووخێ، یان بوومەلەرزە دێ کەمن بڕۆم چاوی خۆم دەربێنم و وەدوای کاری خۆم بکەوم؟ یەکی دیکە راست بکەنەوە.

ـ یەکەم لەتۆ زیاتر کەسمان دەست ناکەوێ کە هەموو شتێکی تـەواو بـێ. خـۆ ئەگەر دەستیشمان بکەوێ ماوەیەکی پـێ دەچـێ... و ئێمـەش نابـێ تەنانـەت تاقە ڕۆژێکیش بێ شێخ بین.

پرسیم:

ـ مەبەستت چیە؟ بۆچی بێ شێخ ناژین؟

ـ دیارە ئیتر. خـەڵکی ئێـرە دوکتوریـان نیـە، مامانیـان نیـە، دەرمانیـان نیـە، پارەشـیان کـە هـەر نیـە. لانـی کـەم دەبـێ شـێخێکیان هـەبێ دەردو ئازاریـان دەرمان بکا.

بوونی تۆ بۆ ئەمانە جێگای هیوایە. ئەمانەی کە خۆڵی بەرپێی تـۆ بـۆ متفـەڕك دەبـەن، ئەگـەر هومێـدیان بـبڕێ یـاخی دەبـن، هـەراو هۆریـا سـاز دەکـەن و دەردیسەری بۆ دەوڵەت و بۆ منیش کە ئاغاو خـاوەن مڵکـم دروسـت دەکـەن. بۆیە هاتمە سەردانی تۆو لە پێش چاوی خەڵك دەستم ماچ کردی. ماڵ نەوێران! من لـە پاتـەخت جـوابی سـڵاوی مـل ئەسـتوورەکانیش نادەمـەوە، هـەتا دەگـا بەوەی احترامیان بگرم یان دەستیان مـاچ بکـەم. بـەلام لێـرە بـۆ پێشـکەوتنی کاری خۆم لە بەرامبەر درێکی پێشینەداری وەك تۆدا چۆکم دادا.

منیش و ئاغاش مەست بووین، بەلام بەو حاڵەش حەوسەلەمان بـاش بـوو. لـەو حاڵەدا پێکەوە قەرارو مەدارمان دانا. قەرار درا من بە گورج وگۆڵی خەریکی کار بم و ئاغاش بۆ خۆی کارێکی وا بکا کە لەگەڵ فەرماندەی پۆلیسی ناوچە یەکتر ببینین.

ئەو شەوەی ئەوەندە سەرخۆش بووم نـەمتوانی بگەڕێمـەوە خانـەقا. سـبەینێ بەیانی ئاغا بۆ چوونەوەی من تەشـریفاتێکی گـەورەی سـاز کردبـوو. دەپـازدە نۆکەر بۆ بەرێ کردنی من ئامادە کرابوون.

دەمەویست سواری ئەسپ نەبم و دیسان بەپێ بەرێگای چیادا بڕۆمـەوە، بـەڵام ئاغا بە گوێمی دا چپاند:

ـ بەدبەخت لەم سەرەوە هەورازە لانی کەم هەشت سەعاتەرێ دەبـێ، نـاتوانی بە پێ بڕۆی.

ئەمن کە لە ئەسپ دەترسام گوتم ئەدی تەگبیر چیە؟

ئاغا فەرمانی دا نۆکەرکان جڵەوی ئەسپی من ڕاکێشن.

وەختێك کە خەریکی سواربوونیش بووم بۆ خۆی هات و ڕکێفی بۆ داگرتم.

بەسپایی پێم گوت:

ـ ئەو هەموو جنێو و قسە سووکەی دوێنێ چی و ئەم هەموو احترامەی ئەمڕۆت چی؟

ئاغا پێکەنی، سەرێکی بۆ دانواندم و بەسپایی لەبن لێوانەوە گوتی:

ـ دەبێ من حورمەتت بگرم بۆ ئەوەی خەڵکی دیکە بەفریو بچێ.

بەڵام وریای خۆت بـە هەڵنەخەڵـەتێی و لـەبیرت نەچـێ چ کەسـی و خـۆت لــێ نەگۆڕێ. کوڕە تەپڵی سەرت وەعەرزی دەکەوێ. لەو ڕۆژە بـەدواوە ژیـانی مـن ڕەنگێکی دیکەی گرت.

ئەو پـەردەی لـە بـیر چـوونەوە کـە چـەند هەفتەیـەك بـوو بەسـەر رابـردووم دا کشابوو، وەلاچوو.

هەتا نەچووبوومە ماڵی ئاغا جارجار بۆ خۆشم لێم دەگۆڕا، وەختێك دێهاتیەکان دیاریەیان بۆ دێنام و داوای نوشتوویان دەکرد خۆم لــێ ون دەبـوو، پـێم وابـوو بەڕاسـتی پیـاوێکی پـاك و دروسـتکارم. بـەڵام ئـەمجار دەقیقەیـەکیش لـەبیری دەغـەڵبازی خـۆم و ئەنجامـدانی ئـەو "ڕۆڵ"ە کـە پـێم ئەسـپێردرابوو خـافڵ نەبووم.

شەوانە کە دنیا بێدەنگ دەبوو بیرو بەرژەوەندی سبەینێ و ترسی ئەوە کە دوارۆژی کارم دەگاتە کوێ گیانمی ئازار دەدا.

بۆ ئەوەی خۆم لە دەست ئەم فکرو خەیاڵانە نەجات بدەم پەنام بۆ ئەلکۆل دەبرد.

بەرۆژیش زۆربەی وەخت بە بیانووی نوێژو دوعا لە ژووریّ دەخزام و دەنوستم. لەو وەختانەدا کەس هەقی نەبوو بێتە ژوورەکەی من و دەروێش زۆر بە داوودڵ ئەرکی پاسەوانی بەجێ دەگەیاند.

رۆژێکیان کە لە ژووریّ خزابووم و شەرابم دەخواردەوە دەروێش بە پێچەوانەی جاران بەبێ ئیجازە وەژوور کەوت.

ئەمن لەو پڕ ڕووبیەی زۆر ترسام. ئەگەر وەختێکی دیکە بایە وام تەمبێ دەکرد تا ماوە غەڵەتی وا نەکاتەوە. بەڵام ئەو رۆژە لەبەر دووشت نەمتوانی هیچ بڵێم: یەکیان ئەوە کە دەزگای خواردنەوەم لە مەیدانێ بوو، دووهەم ئەوە کە دەمزانی خەبەرێکی گرنگی پێیەو لەوانەیە خەبەرێکی زۆر فەوری و ترسناکی بۆ هێنابم.

دەروێش دیتنی دەزگاکەمی هیچ پێ سەیر نەبوو. دەتگوت دەزانێ دنیا چ باسە !

لە ڕەنگ و ڕوخساری شێواوی ڕا دیاربوو ڕاسپاردەیەکی گرنگی پێیەو بۆ کارێکی گەورە ناچار بووە بێ ئیزن بێتە ژوور.

بێئەوەی داوای لێ بووردن بکا، یان ڕاوەستێ من پرسیاری لێ بکەم گوتی:

ـ فەرماندەی پۆلیس دەیەوێ بێتە سەردانت. بەبیستنی ناوی فەرماندەی پۆلیس وا تێك چووم هێندەی نەمابوو دڵم ڕاوەستێ.

پرسیم:

ـ چ کارێکی بە منە؟

دەروێش بێدەنگ بوو، منیش کەوتمە ناو دەریای بیرو خەیاڵات! "ناکا لە مەسەلەی من ئاگادار بووبێت و بۆ گرتنم هاتبێ؟...".

تەواوی ئەو کەش و فشەی جاران دەم نواند وەلام ناو لە دروێشم پرسی:

ـ ئەم فەرماندەی پۆلیسە چۆن پیاوێکە؟

دەروێش زۆری پێ سەیر بوو کە نایناسم، لێی پرسیم:

ـ چما تا ئێستا نەت دیوە؟!

ـ نـا.!

ـ ئەدی چۆن هاتوویە ئێرەو بوویە شێخ.

نەمدەزانی چی جواب بدەمەوە. پاش نەختێك ڕاوەستان گوتم:

ـ کاری من لە سەرەوە جێ بە جێ بووە، پێویستیمان بەدیتنی ئەو جۆرە کەسانە نیە.

دەروێش زەردەخەنەیەکی تایبەتی کرد کە هەزار مانای هەبوو، دوایە گوتی:

ـ باش وایە جارێ جوابی پیاوەکەی نەقیب بدەیەوە دوایە قسان دەکەین!

نەمدەزانی چی جواب بدەمەوە، لە دەروێشم پرسی:

ـ بە فکری تۆ چی لێ بکەین؟

ـ بفەرموو بابێ، ئەگەر ئەو ڕازی نەبێ لێرە هیچ شتێك ناکرێ.

سەرێکم بۆ لەقاندو گوتم باشە، کاتێك دەروێش خەریك بوو بچێتەدەر گوتم:

ـ زوو وەرەوە کارم پێتە.

دەروێش ڕۆیشت و منیش لەگژ فکرو خەیاڵی خۆم ڕا چووم:

"خوایە گیان... تەگبیر چیە؟ ئەمە چ بەدبەختیەکە تووشم بووە. ئەگەر بمناسێتەوە چ پەندێکم بەسەردێنێ؟".

هەتا دەروێش قەراری هاتنی نەقیبی داناو هاتەوە نیوەی گۆشتی لەشم بوو بە ئاو.

لەگەڵ هاتەوە ژووری چاوم لێ هەڵتەکاند دانیشێ، بێ ئەوەی هیچ بڵێ بەرامبەرم دانیشت، ئیستیکانێکم ئارەق وەدەست دا:

ـ بخۆوە کەمێك نەشەت ببزوێ.

ئیستیکانەکەی بە قومێك هەڵچۆڕاندو بەبەری دەستی سمێڵە شۆڕەکانی ئەسترییەوە. چاوەکانی رەنگێکی سەیریان هەڵێنابوو، پیاو نەیدەتوانی چەند دەقیقە تێیانەوە رامێنێ.

بۆ خۆشم کە بەخەبەری هاتنی جەنابی نەقیب خومار ببوومەوە دووسێ ئیستیکانم تێ کردو پاش ئەوەی هاتمەوە سەرەخۆم پرسیم:

ـ باشە ئەم بەرێزە کەنگێ دێ؟

ـ ئەمڕۆ ئێوارێ.

ـ زۆر باشە بڵێ بزانم ئەو کابرایە چۆن جانەوەرێکە. دەروێش دەستی بە تاریفان کرد:

ـ پێش ئەوەی جەنابی نەقیب بێتە ئەم ناوە، تەواوی ئەو کێوانە پڕ لە چەتە بوون.

هێزەکانی دەوڵەت هەرچی دەیانکرد نەیاندەتوانی پێشیان پێ بگرن. هەموو رۆژێ چەند ئوتومبیلیان رووت دەکردن. کارێکیان بەسەر ژن و منداڵی خەڵك دێنا هەر مەپرسە.

هەموو حەوتووان فەرماندەی پۆلیسیان دەگۆڕی بەڵام هیچ کامیان چیان لە دەست نەهات و رۆژ بە رۆژ وەزع خەراپتر بوو، وای لێ هاتبوو هەموو بن

بەردان دووسێ چەتەیان لێ بوون و کەم کەم یەکتریشیان رووت دەکرد. هەتا ئەم جەنابی نەقیبە هات و تۆوی چەتەی لەم ناوە بڕی.

پرسیم:

ـ ئەم پیاوە چۆنی چەتە بڕینەوە؟

ـ هم... چەتەکان کەین و بەینێکیان لەگەڵ شێخەکەی پێش تۆ هەبوو... شێخ پشتیوانی لێ دەکردن. جەنابی نەقیب بەهەر فێڵێك بوو شێخی رازی کرد بچێتە ئەستەمبووڵ. لەگەڵ پێی لێرە ترازاند یەکسەر بردی لە بەندیخانەی ئەستەمبووڵ دایە دەست پۆلیس و هاتەوە. پاش رۆیشتنی شێخ چەتەکانیش کلکیان لەگەلۆزیان گرت و هەڵاتن!

تەنیا من مابووم کە دوای رۆیشتنی شێخیش بە کەللەڕەقی خۆم ڕاگرتبوو.

دەروێش نەختێك ڕاوەستاو منیش کە بەبیستنی ئەم قسانە سەرم دەسووڕا لەبنەوە چاوێکم لێ کردو بێ اختیار گوتم: "داستانێکی سەیرە!".

دەروێش سەرێکی راوەشاند:

ـ بەڵێ هەتا دوومانگ لەمەوبەر ڕۆژێك جەنابی نەقیب وەڵامی بۆ ناردم بچم بی بینم... منیش بە تەنێ لەو کێوو چیایە وەجان هاتبووم. ئاغاش تینی بۆ هێنابووم. ئەوە بوو شەوێکیان چوومە لای ئاغاو پرسیم "تەگبیر چیە؟".

ئاغا فەرمانی دا بچمە لای جەنابی نەقیب بزانم دەڵێ چی...

بێ اختیار قسەکەی دەروێشم بڕی:

ـ چما ئێوە کەین و بەینتان لەگەڵ ئاغاش هەیە؟!

ـ تەحا! ئەدی چۆن...! چما بەبێ رازی بوونی ئاغا دزی و رێگری دەکرێ...! چما تو بۆخۆت بەبێ ئیجازەی ئاغا هاتوویە ئێرە!!

لەدڵی خۆم دا هەزار جنێوم بەم بەخت و شانسەی خۆم دا "بڕوانە ئەو بەدبەختیە بارگەو بنەم لەکوێ خستوە؟" تەنانەت هەناسەهەڵکێشانم دەبێ بە ئیجازەی خەڵکی دیکە بێ!.

بۆ خۆشم نەمدەزانی سەرەنجامی ئەم کارە بە کوێ دەگا. ئیستیکانەکانمان هەڵداو پرسیم:

ـ باشە دوایە چ بوو؟

ـ بەترس و لەرزەوە چوومە لای جەنابی نەقیب. پێم وابوو هەرچاوی پێم بکەوێ دەمارم دەردێنێ...

بۆیە هەر کە دەرگام کردەوە خۆم بەسەر کەوشەکانی داداو گوتم:

"سەهوم کرد... ئیتر کاری وا ناکەم... مەعاشێکی نەمر و نەژیم بۆ وەبڕە. ئەگەر پەلم بزاوت ئیعدامم بکە...".

کەچی بەگ پێکەنی و راستی کردمەوە:

"ئافەرین... هیچ باوەڕم نەدەکرد ئەوەندە تێگەیشتوو بی. هەڵستە دەتکەمە سوڵتانی کێوان. بە پێچەوانەی قسەی خۆت تۆ نابێ دەست لە چەتەیی هەڵبگری، بەڵام دەبێ لەقسەی من دەرنەچی.

ـ هەرچی بفەرمووی بەسەرچاو جێبەجێی دەکەم.

ـ بارك الله... دەبێ هەر ئێستا بچیەوە چیاو بچیە ناو ئەشکەوتی شێخەوەو کەسیش نەزانێ پێکەوە تەون و بەستمان هەیە. چەند کەس هەواڵنووسی رۆژنامەو وێنەگر دەنێرم وێنەت بگرن و لە رۆژنامە دا بڵاوی بکەنەوە.

تەنیا ئەوەندەیە وریا بە لە وەڵامی رۆژنامەنوسەکان دا قسەی نالەبار نەکەی و نەڵێی لەبەر برسیەتی و بەدبەختی بوومە چەتە، نەچی بڵێی مەعاشێکی کەمم

بدەنێ دەست لەم کارە هەڵدەگرم. ئەم قسانە ئاشکرا بن وەك سەگ دەت تۆ پێنم!

پرسیم: باشە چیان پێ بڵێم؟

ـ ها... دەڵێی من بۆ پارستنی ناموسی خۆم ئەم ڕێگایەم ڕەچاو کردەوەو خەبات دەکەم بۆ کۆمەگی لێقەوماوان و لەو جۆرە قسە زل زلانە.

چارە نەبوو دەبوو بەقسەی بکەم. لووس و باریك هاتمەوە ئێرەو چاوەڕێی هاتنی ڕۆژنامەنووسەکان بووم.

خواردن و جل و بەرگ هەموو شتێکم لەلای بەگەوە بۆ دەهات. هەوڵم دەدا بەموو لەقسەی دەرنەچم. من کە بە جارێك دەست و پێی خۆم ون کردبوو گوتم:

ـ مەبەستی لەو کارە چ بوو؟

ـ ئەو ئەفسەرێکی خاوەن تەجرەبەو دنیا دیدەیە، دەزانێ ئەگەر تۆوی چەتە لە دنیا ببڕێ نانی ئەویش دەبڕێ...

کەوابوو چ لەوەی چاکتر چەتە هەبێ، بەڵام بەقسەی ئەو هەڵسووڕێ.

ئاخرەکەی ڕۆژێك هەواڵنوسەکان هاتن. منیش ئەوەندەم باش ڕۆڵی خۆم یاری کرد کە هەواڵنووسی قوربەسەریش زگی پێم سووتاو گوتی "حازرم لە ڕۆژنامەکەم دا دیفاعت لێ بکەم و لەلای کاربەدەستانیش کارەکەت بۆ چاك بکەم"

دیسان چاك بوو تەسلیمی قسەکانی ئەو هەواڵنووسە نەبووم، ئەگینا دەردێکیان دەدامێ تا ماوم لەبەری بناڵێنم.

لەگەڵ ئەوەش دا ڕووشاڵێکم هەر لێ هەڵ بوو. چەند ڕۆژ دواتر لە پێشدا نەقیب و دوایەش ئاغا، وەلامیان دامێ کە بەم زوانە شێخێکی زۆر باش پەیدا

دەکەن و جێگەکەی من دەدەن بەو. هەتا ئەو رۆژەی تۆ هاتی ئـەمن سـەعاتێك خەوو ئاسوودەییم نەبوو. راستیان گوتوە "چاوەروانی لە هەموو شتێك ناخۆش ترە".

ئیستیکانەنمان هەڵدان. لە دڵـی خـۆم دا پێکـەنینم بـە سـاویلکەیی دەروێـش و قوماربازی رۆژگار دەهات "کەوایە بۆیە دەروێـش هـەر کـە چـاوی بـەمن کـەوت دەسـتی کـرد بـە سـەردانەواندن و ئـیکلام کێشـان". بەرەبـەرە خـەریك بـوو تێدەگەیشتم بۆچی وا لەپڕ بوومە شێخ.

کەوابوو، بۆیە ئاغا پێی وابوو من مەئمووری جەنابی نەقیبم و لەبنـەوە لەگـەڵی شەریکم. هەر بۆیەش کە بەتەنیا ماینەوە وای رەفتار لەگەڵ کردم و ئەو هەموو جنێوەی پێدام؟؟!

هەروا دەهات کارەکە قووڵ دەبـوو. "ئێسـتا ئـەمرۆ بـەهاتنی جـەنابی نـەقیب کارەکە هێندەی تریش پیس دەبێ. چ بکەم! تەگبیر چیە؟".

ئەوەندە بەو فکرانـەوە خـەریك بـووم کـە لـە بـیرم چـۆوە دەروێـش بەرامبـەرم دانیشتوەو چاوی برەیوتە هەڵس وکەوتی من.

پێم وابوو فەرماندە بەرابردووی منی زانیوەو ئێسـتا هـاتوە بمگـرێ و تحقیقـاتم لـێ بکا. دەستم کرد بە دەست هەڵتەکاندن و رەخنە گرتن.

دەروێش پێکەنین گرتبووی. بەدەنگی پێکەنینەکەی وەخۆ هاتمەوە گوتم:

ـ باش وایە جارێ بنووم بزانم ئێوارێ چ دەبێ؟

ئێوارێ کە دەروێش خەبەری دامێ فەرماندەی پۆلیس هات لەپشتێنێ بەرەژێرم مرد. نەمدزانی چ بکەم؟ بەپیریەوە بچم یان راست لەجێی خۆم دانیشم.

ئاخرەکەی بریارم دا پێش ئەوەی جەنابی نەقیب بێتە ژوورێ بەپێوە ڕاوەستم تا ناچار نەبم لەبەری هەڵستـم و ئەویش پێی وانەبێ حورمەتم نەگرتوە...

ئوتومبیلەکە لەپێش خانەقا ڕاوەستا، چەند کەسێکی لێ دابەزین.
هێندە نارەحەت و پەرت و پەرێشان بووم نەمزانی کێی لەگەڵە! و چۆن ئۆتومبیل هاتۆتە سەر ئەم کێوە؟ بەتایبەتی وەختێك دەنگی جەنابی نەقیب هات و پرسی:
- جەنابی شێخ تەشریفیان لە ماڵەوەیە!،
هێندەی نەمابوو خۆم پیس بکەم. دەنگ و قسەکردنەکەی وەك ئینسان نەدەچوو. دەتگوت دەنگی تۆفان و هەورە تریشقەیە...
پیاوەکانم وایان سەر لێ شێوابوو جوابیان پێ نەدرایەوە. جەنابی نەقیب دیسان بەو دەنگە بە سامەیەوە گوتی:
- کوڕە نەکا جەنابی شێخ خەریکی نوێژو تاعەت بێ؟
هێندەی نەمابوو لەپشت دەرگاوە بڵێم "بەڵێ خەریکم" ئەوەندی بڵێی یەك و دوو تەواوی ژیانی رابردووم هاتەوە پێش چاو: "ئاخر بابی بابم کارت بە شێخایەتی چ بوو...؟ بۆچی نەچووی کارێکی پیاوانە بۆ خۆت پەیدا بکەی؟".
لە دڵی خۆم دا گوتم "چۆنە لەو پەنجەرەی پشتەوە خۆم فڕێ دەم و بۆی دەرچم، پارەشم کە هەیە. با هەتا کارەکە پیس نەبووە خۆم دەرباز کەم".
بەڵام تازە درەنگ ببوو، دەرەتانی هەڵاتنم نەمابوو.
جەنابی نەقیب گەیشتبۆ پشت دەرگای ژوورەکەم و هەر بەو دەنگە ئەستوورەی گوتی:
جەنابی شێخ ئیزن دەفەرمووی؟ یاالله...
ئەوەندەی گوت و دەرگای وا لەنەکاو کردەوە کە سواخی ئەم لاو ئەو لای هەڵوەری... لاقی راستی بەو چەکمە زل و تروسکەدارەوە هێنایە ژوور.

من پێش ئەو ڕۆژە زۆرم کوێرەوەری دیتبوو، چاوم بە زۆر دیمەنی سەیرو ترسێنەر کەوتبوو، بەڵام قەت وەك ئەو ڕۆژە نەترسابووم و خۆم نەدۆڕاندبوو. ئەوەندە تێك چووم کە بۆ یەکەم جار بە ڕاستی و لە دڵەوە لەبەر خودا پاڕامەوە.

"خوایە کەرامەتی شێخی بەڕاستیم بدەیە تا دوعایەکی لێ بخوێنم و بیکەم بە بەرد!".

پێنەکەنی... پێنەکەنی... ئەمە گاڵتە نیە. پێشتر بۆ تۆشم باس کردوە. ئێمەی پێشینەدار ئیمان بەو کارە درۆیینانە دێنین کە بۆخۆمان دروستمان کردوون و وامان لێ دێ کە پێمان وایە شتەکە لەڕاستی دا وایە.

بە دوای چەکمەکەی دا پەیکەری زل و زەبەللاحی جەنابی نەقیب وەژوور کەوت. بەدیتنی ئەو سەرو سیماو قەدو قەوارە وا راچەنیم بێ اختیار لەبەر خۆمەوە دەستم کرد بە دوعا خوێندن.

نازانم فەرماندە چ فکرێکی کرد کە لەگەڵ چاوی بەمن کەوت پاشەوپاش کشایەوەو بەیەکێك لە نۆکەرەکانی منی گوت کە دەستەونەزەر لەوێ ڕاوەستابوو:

ـ توڵەباب! ئاخر لەتۆم نەپرسی بزانە شێخ خەریکی تاعەتە یان نا؟ بۆ دەنگت نەکرد؟!

پاشانیش زللەیەکی وای لەبنان گوێی نۆکەرەکەم دا فەقیرە چوار پێنج جار بەدەوری خۆی دا سووڕاو سەری وەدیوارەکە کەوت.

من زۆرم ئەو شیرینکاریانە دیبوو. جەنابی نەقیب دەیەویست بەو کارە سامی خۆی بەمن نیشان بدا. لە بەندیخانەو لەنێو لاتەکان دا ئەوە باوە کاتێك بەندی-

یەکی مل ئەستوور دێتە بەندیخانە مل ئەستوورەکەی پێشتر بۆ ئەوەی خۆی بنوێنێ ئەم جۆرە دەستە گوڵانە بەئاودا دەدا.

ئەم رەفتارەی جەنابی نەقیب وەك پۆلوویەك بوو کە لەکڵۆباڕووتێکی نیزیك بخەنەوە. زۆری کار کردە سەر من.

منی وا گۆڕی کە بە جارێك لەو قالبی روحانیەت و شیخەتی‌یە هاتمەدەرو بوومەوە هەمان گێلەی کە لە بەندیخانە لەگەڵ تاقمێك لاتی مل ئەستوور بەرەوڕوو بووم.

هەروەك لە بەندیخانە هەموو کەس بۆ ئەوەی بتوانێ بژی دەبوو سەر بۆ مل ئەستووری دیکە نەوی نەکا، منیش خۆم ئامادە کرد بەرپەرچی مل ئەستووری-یەکەی جەنابی نەقیب بدەمەوە.

وەك مەکینەیەك کە قورمیش کرابێ بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێ دەمم کرایەوە گوتم "هۆپ".

بەڵام هێشتا وشەکە بەتەواوی لەدەمم دەرنەچوو بوو و دەنگی "پ" کە لە کەلێنی ددانم دا بوو کە وەك بریسکە لێی دابم دەمم وشك بوو.

ئەو ئەفسەرەی هێندەیان باسی ئازایی و کەللەڕەقی و دەسەڵاتی دەکرد "شاهین چەنگل" کۆنە هاوپۆلی من لە قوتابخانەی عەسکەری بوو. سەرتاپام دەستی بە لەرزین کردو وەك ئاوێك بە ئاگرێك دا بکرێ لەراست خۆم دامرکامەوە. لە دڵی خۆم دا گوتم "ناکا ئەویش من بناسێتەوە؟"

بەزەحمەت خۆم کۆ کردەوەو لەسەرەخۆ گوتم:

فەرموو حەزرەتی نەقیب ماڵی فەقیری وەك من قابیلی جەنابت نیە!

جەنابی نەقیب هەروا بە هەنگاوی توند هاتەپێش و دەستە قورسەکانی خستە سەرشانم و بەزۆر لەسەر دۆشەکەکەی دانامەوە. بەم کارە دەیەویست لەگەڵ رێزلێگرتنەکەدا هێزی شان و باهۆی خۆشی بەمن نیشان بدا.

ئەمن پیاوێکی شەڕفرۆش نیم بەلاّم لە قوتابخانە لە کەسم قبوڵ نەدەکرد. ئێستاش لەگەڵ ئەو هەموو رەنج و کوێرەوەرییە کە کێشابووم ئەگەر جەنابی نەقیب بابایەکی خۆمانە بوایە دەگژی ڕا دەچووم، بەلاّم ئەم دەرەجانەو هێزی دەوڵەت کە بەپشتی ئەفسەرانەوەیە دەسەلاّتێکی زیاتریان دەدەنێ. بۆیە لای خوارەوەم گرت و گوتم:

– تا جەنابت دانەنیشی بێ ئەدەبی وا ناکەم.

– عەفوو فەرموو قوربان! ئەمن خاکی بەرپێی جەنابتم.

دەنگێکی وەك اس. اس س لە دەمم دەهاتەدەر دەمەویست بڵێم "استغفرالله ! !.

جەنابی نەقیب لەسەر چۆکان لەولای دۆشەکەکە دانیشت و گوتی:

– هیوادارم بم بووری کە درەنگ هاتوومە خزمەتت. لە کۆنەوە گوتوویانە "لەپچووکان خەتاو لە گەوران عەتا".

نەمدەزانی چی جواب بدەمەوە. تەنیا سەرم ڕاوەشاندو هارەیەکم لەگەرووم هێنا.

جەنابی نەقیب گوتی:

– جەنابی شێخ هەموو شتێك لە خۆت عەیانەو ئەمن زۆر ئازارت نادەم. هەر بۆیە هاتبووم بەرەکەتێکم پێ ببڕێ داوای دوعا خێرم هەیە.

پێکەنینێکم هاتبوو وەخت بوو بتەقم. بە زەحمەت خۆم ڕاگیر کرد:

ـ ڕۆڵە خوا بت پارێزێ. بیستوومە بۆ لە نابردنی چەتەکان زۆر زەحمەت دەکێشی؟

جەنابی نەقیب جوابی دامەوە:

ـ لە سایەی سەری جەنابتەوە شوکور وەزع ئارامە. دیارە نەفەرەکانم کەمن و ئەگەر شەخسێکی وەك جەنابت نەبێ چیان بۆ ناکرێ. ئەم وڵاتە یەکەم بە خوداو دووهەم بە جەنابت سپێردراوە.

سەرم لێ سوڕمابوو، چۆنە ئەو جەنابی نەقیبە لەگەڵ هەموو دەسەڵاتی خۆی دا زۆر لە ئاغا بە ئەدەب تر دەدوێ.

خەریك بووم بەرەبەرە ئاشقی کردارو قسەکانی دەبووم کە لەنەکاو پرسی:

ـ بیستوومە جەنابت خەڵکی سەمەرقەندو ئەو ناوەی؟!

چاك بوو لەسەر وەڵامی من ڕانەوەستا، ئەگینا هەر لەوێ دا کارەکە پیس دەبوو. هەروا کە چاوی تێوەبڕیبووم لێی زیاد کرد:

ـ تۆ زۆر وەك دۆستێکی من دەچی!

ئەگەر بۆمبا لەبن گوێم تەقیبا، ئەگەر خانووم بەسەردا ڕووخابا، قەت ئەوەندە نەدەترسام و تێك نەدەچووم کە بەو قسەی جەنابی نەقیب ناڕەحەت بووم.

نەم دەزانی بڵێم چی؟ سەرم داخست و دەستم بەڕیشی خۆم گرت. نەقیب کە دەستی هەڵنەدەگرت گوتی:

ـ توخوا نەختێك ڕوو بکە لای پەنجەرەکە.

سەرم وەرگێڕا، وەك بەرگدرووان کە قوماشی وەبەر ڕووناکی دەدەن و لێی ورد دەبنەوە، بەوردی تەماشای کردم و گوتی:

ـ زۆر وەك ئەو دەچی. ئەگەر ریشت نەبایە عەینەن فەرید پەتاتە بووی. پاشان دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانەکانی ئەو سەردەمە.

هەرچەند دەقیقەش جارێك بێدەنگ دەبوو و لەسەروچاوی من ورد دەبۆوە.
دڵم واتوندی لێدەدا بۆ خۆم گوێم لە دەنگی بوو. دەترسام لە نەکاو بمناسێتەوە.
بۆ ئەوەی تێ بگەم داخوا ئاگای لەبەسەرهاتی من هەیەو دەزانێ دۆستەکەی سەرەنجام چی بەسەر هاتوە یان نا لێم پرسی:
ـ باشە ئەو دۆستەت چی بەسەر هات؟
ـ لە قوتابخانە دەریان کرد. ماوەیەکی زۆر ئاگام لێ بڕا هەتا ڕۆژێك وێنەم لە رۆژنامەدا چاو پێکەوت.
دیسان لە نەکاو قسەکەی بڕی و لەسەرو چاوی من ورد بۆوە.
وا دیار بوو ئەویش منی ناسیوەتەوە، بەڵام هەردووکمان خۆمان نەناس دەکرد.
جەنابی نەقیب پرسی:
ـ ئاکا جەنابت فەرید پەتاتە بناسی؟
ـ نەخەیر نایناسم. باشە چی کردبوو کە وێنەیان لە ڕۆژنامە دا چاپ کردبوو!!
نەقیب پێکەنی:
ـ کەڵەکبازی، ئەویش نەك جارێك و دووجار، بەڵکە شەوو ڕۆژێ سێچوار جار.
دەمەویست ئەو یارییە ترسناکەی دەستمان پێکردوە تەواو بکەم. پرسیم:
ـ ئێستا لە کوێیە؟
ـ پێم وایە لە بەندیخانە بێ. چونکە هیچ باسی نیە.
هەردووکمان نەختێك بێدەنگ بووین و من پرسیم:
ـ چۆن بوو تووشی ئەو ڕێگایە بوو؟
نەقیب بەو پرسیارەم تێك چوو، هەناسەیەکی هەڵکێشاو جوابی دایەوە:

ـ کوڕێکی خەراپ نەبوو. لە قوتابخانە هەموو کەس خۆشی دەویست. هیچ کەس پێی وانەبوو ڕۆژێک لە قوتابخانە دەردەکرێ. بەڵام چارەنووس کاری خۆی کردو ئەو کوڕەی تووشی ڕێگای خەراپ کرد بێ گومان ئەفسەرێکی هەڵکەوتووی لێ پەیدا دەبوو.

کوڵەگرووم لە ئەوکێ مابوو. خەریك بوو فرمێسکم بێ، بەزەحمەت خۆم ڕاگیرکردو گوتم: "بۆچی یارمەتیتان نەدا؟"

جەنابی نەقیب پێکەنینێکی وشکی کردو گوتی:

ـ ئەو هیچی لە ئێمە داوا نەکردو ڕۆژێك من لەوەزعی ئەو ئاگادار بووم کە کار لە کار ترازابوو، ئیتر نەدەکرا فریای بکەوم. پرسیم:

ـ ئەگەر ئێستا بێت و داوای یارمەتیت لێ بکا چ دەکەی؟

ـ فەرمان دەدەم بیگرن!

ـ بێ خەتا!

ـ کەسێك فێری کارێك بوو ئیتر دەستی پێ لێ هەڵناگیرێ.

هەردووکمان کەمێك ڕاوەستاین. نەقیب جگەرەیەکی داگیرساند:

ـ لەبەر کارێکی کە بە منیان سپاردوە بە خزمەت گەیشتم. ئەم قسەی زۆری مانا تێدا بوو، لەگەڵ قسەکانی چەند دەقیقە پێشتر زۆری فەرق هەبوو. کە وای گوت بەندی جەرگ و دڵانم پسا گوتم "نەقیب هاتوە بمگرێ و حەپسم بکا".

ئەو ریشە دریژانەش نیعمەتێکی باشن. بە تایبەتی ریشی رەش و بەپشتی من کە نیوەی دەم چاومی داپۆشیبوو. ئەگەر ڕیش نەبایە نەقیب دەی بینی ڕەنگم پەریوەو دەیزانی "ئەو ماستە بێموو نیە".

ئەوەندی بۆم دەکرا سەرم دەبردەوە نێو قەپێلك و یاریم بەریشم دەکردو چاوەڕێ بووم نەقیب فەرمانی گرتنم بدا. ئەویش کە دوایە تێگەیشتم چ

خەیاڵێکی بووە، دەیەویست هەرچی زووتر قسەکەی بکا دەستی کرد بە "من من" هەتا بۆ خۆم گوتم:

ـ بەڵێ فەرموو چ ئەمرێکت هەیە؟

ـ راستیەکەی ئەوەیە نامەیەکیان لە ئەنقەرەوە ناردوەو کارێکی گرانیان لەمن خواستوە کە پێوەندی بە جەنابتەوە هەیە.

"خوا کوێرت کا هەتیو، دەخێرا چاوی خۆت دەرێنەو مەسەلە چیە بڵێ و بیڕیتەوە لەترسان وەختە زراوم بچێ، تفی قووت دایەوەو گوتی:

ـ ئەمڕۆ و سبەی بورهان دێتە ئێرە. بەجارێك خۆمم لەبیرچۆوە، پرسیم:

ـ کام بورهان؟

نەقیب پێکەنی. ئەویش یەکێك لە هاوڕێیانی سەردەمی قوتابیەتی ئێمەیە. من و فەرید پەتاتەو بورهان شەیپووری سێهاورێی گیانی گیانی بووین. لەونێو ئەوسێکەسەدا ئەمیان لە هەمووان باشتر دەرچوو، زۆر ئاقڵ و زیرەك بوو. دووساڵ پێش ئێستا لە خزمەتی سوپا دەرچوو. ئێستاش دەیەوێ ببێتە نوێنەری پارلەمان.

هەناسەیەکی ڕەحەتم هەڵکێشاو لەسەروبنی مەسەلە حاڵی بووم. گوتم:

هەرچی خوا بەقیسمەتی بکا ئەوە باشە. لەسێ هاورێی قوتابخانە یەکێك فەرماندەی پۆلیس و یەکێك نوێنەری پارلەمان. نەقیب قسەکەمی بڕی و گوتی:

ـ قەرار وایە لەم ناوچەیە هەڵبژێردرێ. بۆیە بۆ سەردان و قسەکردن لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوە دێ. جاران زۆر باش بوو. پێویستی بەم کارانە نەبوو. ئەوەتا قانوونی دێموکراسی هاتۆتە وڵاتی ئێمە کاری نوێنەرانیش تێك چووەو ناچارن وەختی هەڵبژاردن پێنج شەش رۆژ بچنە ئەو ناوچەی لێی هەڵدەبژێردرێن و چاك و چۆنی لەگەڵ خەڵك بکەن.

منیش هەر بۆیە هاتمە خزمەت تۆ و زەحمەتم دای. کاری بورهانی بەدەست جەنابتە. هیوادارم لوتف بنوێنی و یارمەتیمان بدەی.

ـ لە لوتفی خۆتەوەیە. جا من چیم لە دەست دێ؟

ـ جەنابت زۆر کاران دەتوانی بکەی. هەر ئەوەندە بەو خەڵکە نەزانە بفەرمووی "دەنگ بۆ فلان کەسی بدەن" کار تەواوە. ئەمانە قەت لە فەرمانی جەنابت دەرناچن. ئێمە پێیان بڵێین دەنگ بۆ بورهان بدەن کارەکە پێچەوانە دەردەچێ. سەیری رواڵەتیان مەکە لێم دەترسێن و حورمەتم دەگرن. ئەمانە هەموو ساڵێ کۆڵێك پارە لە حەمید ڕەسوولی وەردەگرن و لە قسەی تۆش بەولاوە قسەی کەسیان گوێ لێ نیە. تەنانەت خوسرەوخانی ئاغاش قسەی ناڕوا.

بەسەر سوڕمانەوە پرسیم:

چۆن بەقسەی ئاغا ناکەن؟ چۆن دەتوانن بێئەمری ئەو بکەن؟!

سەری لێ ڕاوەشاندم:

ـ بیستوومە نێوانتان زۆر خۆشە!

ـ بەڵێ! پیاوێکی باشە.

ـ منیش خۆشم دەوێ، بەڵام باوەڕ بفەرموو کاری دەوڵەت و بەجێگەیاندنی فەرمانی دەوڵەت کاری بەسەر دۆستایەتی و خۆش ویستن و شتی واوە نیە.

قامکی خۆم گەزی. تێگەیشتم ئاغاو جەنابی نەقیب ناکۆکییەکیان لە بەیندا هەیە.

پرسیم:

ـ چۆن؟ چما ئاغا نەزەرێکی دیکەی هەیە؟!

ـ بەڵێ. بەلام خەراپ حاڵی بووە فێڵی پێ لە من ناکرێ. هێلکە لەقەلێ نادزرێ.

خۆم گێل کردو گوتم:

ـ پێم وایە خەراپ لێك حاڵی بوون!

ـ نەخەیر! من ڕاستەڕێ چوومە لای و گوتم هاتووم تکایەکت لێ بکەم. گوتی "فەرموو هەرچی هەبێ بەسەرچاو جێبەجێی دەکەم".

گوتم: "دەبێ یارمەتیمان بدەی بورهان هەڵبژێردرێ".

وەك جنێویان پێدابێ چاوی دەرپەڕاندو گوتی:

"بڵێ سێسەد سوارم بۆ ساز کە بەسەرچاو. بڵێ کوڕەکانتم بدەیە بۆ سەربازی دەیاندەم. بڵێ ئازووخەی مانگێکی نەفەرەکانم بدە، مانگێك هیچ دوومانگی دەدەم، بڵێ ئەوانە دوژمنی منن لێیان دە، بەسەرچاو هەمووانت دەسبەجێ بۆ لەناودەبەم. بەلام داوای ئەوەم لێ مەکە کە دەنگ بۆ حەمید ڕەسوڵی نەدەین. ئەم کارەم لە دەست نایە. هیوادارم دڵت نەیەشێ".

ـ بۆیە هاتوومە خزمەت جەنابت. هەر تۆ بەڵێن بدەی کار تەواوە.

بورهان پیاوێکی زۆر بەدین و ڕووناکبیرەو بەتایبەتی زۆر موخلیسی جەنابتەو بۆ خۆشت کاتێك هات بۆ زیارەتت دەی بینی. لە دڵی خۆم دا گوتم:

"ئەی نەحلەت لەدایك و بابی پیاوی درۆزن!".

جەنابی نەقیب پێکەنینێکی تایبەتی بۆکردو گوتی:

ـ بۆئەوەی قسەی لێ پەیدا نەبێ، ڕۆژێك کە بورهان بێتە ئێرە من لەگەڵی نایەم. تکات لێ دەکەم کارەکەی بۆ جێبەجێ بفەرموو! ئیتر خۆت باشتر دەزانی.

لەو ڕستەی دوایی دا بەئاشکرا ئەم مانایەم بۆ دەرکەوت کە "ئەگەر ئەو کارە نەکەی خۆت دەبینیەوەو هۆبالّی خۆشت بەستۆی خۆت".

نەقیب هەستایە سەرپێ بڕوا. لە کونی پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوەی کردو نەڕاندی:

ـ هۆی، لە چ جەهەننەمێکن؟

دەسبەجێ پۆلیسەکان کۆبوونەوەو دەست لەسەرسنگ لە بەردەرگا ڕاوەستان.

جەنابی نەقیب لەبەردەرگا بەئەدەب و ئیحترامێکی بێئەندازەوە گوتی:

ـ جەنابی شێخ تکایە بۆ دوعای خێر لەبیرمان مەفەرموو.

کاتێك دەنگی ئوتومبیلەکە دوور کەوتەوە دەتگوت سێ شەوو ڕۆژە نەخەوتووم. بەماندوویی و شەکەتی خۆم بەسەر دۆشەکەکەم داداو گوتم: "بابە، وەڵلا من سەرم لەسیاسەت دەرناچێ".

بیری سەیر سەیرم دەکردنەوە. نەم دەزانی ئەم بەدبەختییە چۆن چاك بکەم. فکرم کردەوە تا کارەکە پیس نەبووە فیزماڵکی بدەمێ، بەڵام ڕوو لەکوێ بکەم و چۆن دەتوانم ڕابکەم؟، بۆخۆی مەسەلەیەکی زۆر سەخت بوو.

"چما هەروا بەهاسانی دەکرا پیاو لەدەست ئەم فەرماندەیە ڕزگاری بێ؟".

نەخەیر. ئەمجار ئیتر ڕێگای دەربازبوونم نیە، ئەمجار وادەکەوم پێش هەموو جێگایەك تەپڵی سەرم وەعەرزی کەوێ، هەڵلاو هەنگامەی ئابڕووچوونی ئەمجارم عەرزو عاسمان پڕ دەکا. بەکورتی هیچ چارەیەکم نەدۆزیەوەو دیسان هەروەك جارەکانی پێشوو خۆم دایە دەستی چارەنووس.

ئەو ڕۆژەی قەرار بوو بورهان شەیپووری بێتە "زیارەت"م جەنابی نەقیب بە یەکێك لە پۆلیسەکان دا خەبەری بۆ ناردم:

ـ "میوانەکەتان ئەمڕۆ لە ئەنقەرەوە دەگاتە جێ. تکایە لەگەڵ هێندێك لە خەڵکی گوندەکان بە پێشوازیەوە بچن.
هەر بە پۆلیسەکەدا وەڵامم بۆ ناردەوە کە "خاترجەم بە".
پۆلیسەکە ڕۆیشت و هێشتا من فریا نەکەوتبووم هیچ بڕیارێك بدەم کە کوێخاو لادێییەکان دەستە دەستە دابارین. هیچیان بە دەستی بەتاڵەوە نەهاتبوون، هەریەکە دیارییەکی بۆ هێنابووم.
ئەوەندەیان ڕۆن و پەنیرو ڕۆنەکەرە بۆ هێنابووم ئەگەر ساڵێکی تەواو لەسەری لەوەڕابام لەبەرم دەمایەوە. بۆمن باش نەبوو بیان فرۆشم، واتە وەسیلەم نەبوو. ئەگەر بشمابایەوە خەراپ دەبوو.
گوتم باش وایە هەمووی بەسەر لادێییەکان دا دابەش بکەم. ئەو کارە باوەڕی هەموانی بۆ لای من ڕادەکێشاو ئیحترامی بۆ زیاد دەکردم.
لای ئێوارێ بورهان شەیپووری لەگەڵ سێچوار کەس لە هاورێکانی پەیدا بوو. من باشم خۆگران کردو لەجێگای خۆم نەبزووتم.
بورهان شەیپووری لەگەڵ هاتە ژوورێ غاری دا لە سەر لایەکی دۆشەکەکەم دانیشت. پێشان شاقەلی کەواکەم و دوایە دەستمی ماچ کرد.
گوتم: "ڕۆڵە خوا پشتیوانت بێ".
بۆخۆم پێکەنینم بەخۆم دەهات. هێندەی نەمابوو دەست بکەمە ئەستۆی ئەو کۆنە دۆستەم و دووسێجار ئەم لاو ئەولای ماچ بکەم، بەڵام خۆم کۆ کردەوەو گوتم:
ـ بەخێرهاتی بورهان بەگ؟
بورهان بەگ وای تەعزیم بۆ کردم کە ترسام لووتی لە عەرزی بچەقێ و جوابی دایەوە:

ـ جەنابی شێخ! نازانی چەند تامەزرۆی زیارەتی جەنابت بووم:

پرسیم:

ـ هۆی زیارەتی من چیە؟

بورهان کە لەمن زرینگتر بوو، دەسبەجێ وەڵامی دامەوە:

ـ دیارە جەنابی شێخ هەموو شتێکیان لێ ڕوونە، من لە ئەنقەرە ئەوەندەم باسی کەشف و کەرامەتی جەنابت بیستوە کە لەزیارەت و دەست ماچکردنی جەنابت بەولاوە ئاواتێکم نەبوو.

بەتایبەتی چەند ڕۆژ لەمەوبەر کە خەوم پێتەوە دی، ئیتر تاقەتم لێ هەڵگیراو هەرچەند کاروباریشم زۆر بوو بەڵام دەستم لە هەموو کارێك هەڵگرت و کەمەندکێش بووم بۆ زیارەتت.

ئەوەندەم ڕق هەستابوو خەریك بوو تفێکی لەدەم و چاوان کوتم. سەگبابە خۆی وا لێ کردبوو هەرکەس دیتبای باوەڕی دەکرد. پاش هەموو قسەیەکیش ئاوڕێکی وەسەر لادێییەکان دەدا. دەیەویست تێیان بگەیەنێ کە چەندە ئیحترامی شێخەکەیان دەگرێ. پاش ئەوەی قاوەیەکی خواردەوە گوتی:

ـ جەنابی شێخ! من نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم نەکردوە. ئێزن دەفەرمووی لە سووچێك نوێژەکەم بکەم. دەترسم بچێ.

لە دڵی خۆم دا گوتم: "بڕوانە سەگبابانە چۆن خەڵکی فریو دەدەن" پێم خۆش بوو ڕاست و ڕەوان پێی بڵێم "ئاخر کێ نوێژی کردوە تا تۆ بەجێ مابی؟".

بەڵام چما دەکرا پیاو شتی وا بڵێ؟ هاوار بۆ ڕۆژێك کە پەردەی ڕیاو دووڕوویی وەلاچێ. پێکەنینێکی بەدرۆم بۆ کردو گوتم:

ـ فەرموو لەو ژوورەی پشتەوە نوێژەکەت بکە.

پاش نوێژ ژوورەکەمان چۆڵ کردو باسە ئەسڵیەکە دەست پێ کرا.

بورهان بەپاڕانەوەو لالانەوەدەیەویست بەڵێنی یارمەتیم لێ وەربگرێ. ویستم بزانم منی ناسیوەتەوە یان نا. مەسەلەی سەردەمی قوتابخانەی ناوەندی و ئەو ڕووداوانەم هێنایە گۆڕێ کە بە سەری هاتبوون. بورهان سات بەسات زیاتر سەری سوڕدەما. بەتەواوی باوەڕی کردبوو کە کەرامەتم هەیەو ڕابردووی هەموو کەس دەزانم. بەتایبەتی وەختێك مەسەلەی نەقیب بالێۆز هەقی و لێدانی بورهانم گێرایەوە سەری قامکی خۆی گەزی و ئیتر هیچ لەبیری نەما کە لەخزمەت حەزرەتی شێخ دا ڕاوەستاوە بە دەنگێکی بەرز گوتی:

"سەگبابە دەڵێی عیلمی غەیبی هەیە؟!"

دەمزانی ئەگەر ڕۆیشتەوە هەموو قسەکان بۆ شاهین دەگێڕێتەوەو بەو شك بۆ چوونەی شاهینیشەوە کارەکە پیس دەبێ، بەڵام نازانم چ ژانە سەرێکم هەبوو کە سەرسوڕمانەکەی بورهانم ئەوەندە پێخۆش بوو.

ئاخرەکەی بەڵێنم پێدا هەموو دەنگەکانی خەڵکی ئەم ناوە هی ئەون و لە هەڵبژاردن دا سەردەکەوێ.

بەو ڕۆڵەی کە چەند دەقیقە پێش ئێستا یاریم کردبوو، ئەو بەشەی دوایی قسەکانم بۆ بورهان وەك نیدای ئاسمانی وابوو.

زۆر بە ئەدەب و دڵسۆزی چۆکی داداو داوێنی ماچ کردم و ئیزنی ڕۆیشتنی خواست:

ـ خوات لەگەڵ کوڕم خەفەت مەخۆ.

بورهان ڕۆیشت و منیش تووشی خەیاڵ و ناڕەحەتی بووم "خوایە چ بکەم؟ ئەگەر یارمەتی بدەم ئاغا پێی ناخۆشەو تووشی ناڕەحەتیم دەکا. ئەگەر یارمەتیشی نەدەم نەقیب تالاوم بە گەروودا دەکا".

وەك دەنکە گەنمی ناو دووبەرداش لـە هـاڕان بـەولاوە ڕێگـای نیـە، بـۆ منـیش ڕێگای هیواو دەربازبوون نەمابوو.

پاشان من شارەزای ئەو جۆرە کارانەش نەبووم و نەم دەزانـی دەبـێ چ بکـەم. لەترسی ئابڕووی خۆشم نەمدەوێرا لە کەسێك بپرسم. ئەگەر دێهـاتی‌یـەکان لـێم بپرسن ئەو کابرایە دەناسی یان نا چیان جواب بدەمەوە؟

هێندەم بیرکردەوە ژانەسەرم گرت. ئاخرەکەی نەمتوانی ڕێگایەکی دەربازبوون لەو بەدبەختی‌یە بدۆزمەوە. دڵنیا بووم کە ئەم جـارە بـە تـەواوی کارەکـە قـۆڕ دەبێ‌و سەرەنجام یان لەگەڵ ئاغا یان لەگەڵ فەرماندە تووشی "ڕیشـم بـەردە. ڕیشم بەردە" دەبم.

جـارو بـار ڕۆژنامـەکانی ئەسـتەمبووڵم پـێ دەگەیشـت. بـەڵام حەوسـەلەی خوێندنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەم نەبوو. هەروا سەرسەرەکی چاوێکم بەسەر وتارو تیترەکـان دا دەخشـاندو دام دەنـان. بـەڵام ئێسـتا لەبـەر نیزیـك بوونـەوەی هەڵبژاردن دەبوو ڕۆژنامەکان ببینم.

لە ڕۆژنامەکان دا باسێکی سەیرو سەمەرە دەهاتە بەرچاو... لـە سـەروتارەکان دا نووسـرابوو: "پارلـەمانی داهـاتوو بەرنامـەی دابـەش کردنـی زەوی وزار جێبەجێ دەکا".

"لەداهاتوودا هەموو جووتیاران دەبنە خاوەنی زەوی و ئاوی خۆیان".

بەکورتی هەر کام لـە پاڵێوراوەکـان هێنـدێك چـاووڕاوی کردبـوو وبەرنامەیـەکی خستبۆ بەرچاوی خەڵك:

"ئەگـەر دەنـگ بـۆ ئێمـە بـدەن وادەکـەین وابچـێ" هـەموو قسـە شـیرین و بەتامەکانی نێو ڕۆژنامەکانم لەبەر کردبوو تا وەختی وتاردان بـەگوێی دێهـاتی-یەکانیان دا بدەمەوە.

نەخشەی کارەکەم دووسێجار لەبەرخۆمەوە هەڵسەنگاندبوو دیتم ڕێگا نیە دەبێ لایەنی فەرماندە بگرم و بە قازانجی بورهان دەست بەکاریم. ئەم کارە دوو قازانجی هەبوو. هەم دەمتوانی لە بورهان کەلك وەربگرم و هەم دڵی فەرماندەشم بەجێدەگەیاند کە لە ئاغا گرنگتر بوو. بەو حاڵەش ئارام و ئۆقرەم لێ هەڵگیرابوو بە هیچ جۆر دڵخۆشی خۆم بۆ نەدەدرایەوە.

بۆیە ئەو شەوە ئەوەندی شەڕابی بووم خواردمەوە، کەچی دیسان بێسوود بوو، وەك کەسێك کە قەرار بێ سبەینێ ئیعدامی بکەن، دڵم هێدی نەدەبوو و ترس بەری نەدەدام.

کاتێك لەسەر جێگاکەم درێژ بووم یادی بەندیخانە لەسەری دام. دەتگوت لەغەیبەوە خەبەرم پێدراوە کە بەم زوانە دەبێ لێفەو دۆشەکەکەم لە بەندیخانەدا بڵاو بکەمەوە.

تووشی ورێنە ببووم. پێم وابوو هەموو دێهاتیەکان بەریز ڕاوەستاون و بۆ وەرگرتنی زەوی نۆرەیان وەرگرتوە. کوێخا لەپێش هەموانەوە ڕاوەستابوو، هاواری دەکرد:

"لەسەرەخۆ... بەریز ڕاوەستن... هەرایە مەکەن... هەرچی بەریز نەوێستێ زەوی نادرێتێ".

بەڵام لادێییەکان بێدەنگ نەدەبوون. یەکێك هاواری دەکرد:

ــ من زەوییەکی باشم دەوێ. یەکی تر دەی نەڕاند:

ــ دەبێ زەوییەکەم لە نیزیك کارێز بێ. سێهەم دەیگوت:

ــ زەوی دێمەکارم ناوێ.

ــ هی ئێمە دەبێ لەدەم ڕووبار بێ.

هەر کەسە جێگای زەوی خۆی دیاری دەکرد. ئاخرەکەی لێیان بوو بەشەڕ، ژن و پیاوو کچ و کوڕ پێك وەربوون و بەپێمەڕەو پاچ و قولینگ و نوێلە کەوتنە سەرو گوێلاکی یەکتر.

هاوارم کرد:

ـ وست بن! ئەگەر بێدەنگ نەبن کەس زەوی نادرێتی! ئەمن بۆ خۆم دەزانم هەر کەسە لەکوێی زەوی بۆ دادەنێم!

یەکێك لەپێش منەوە ڕاوەستابوو، لێم پرسی:

ـ تۆ زەوی چۆنت دەوێ؟

ـ من زەویم ناوێ!

ـ بۆچی؟

ـ دەترسم ئاغا بەگۆڕی بابم دا بڕیەنێ و هەنگوینم پێبکاتە ژەهرەمار؟ ئەودەم ئەم پاروەنانەی ئێستاشم دەبڕێ. نەخێر نامەوێ. نامەوێ. نامەوێ.

لەپڕ هۆشم هاتەوە بەرخۆم. بەڕاستی دەتگوت ئاغام لەبیر چۆتەوە. دەمەویست ملکەکانی بەسەر دێهاتی‌یەکان دا دابەش بکەم!!

هەموو گیانم دەستی کرد بە لەرزین: "ئەگەر یەکێك ئەم قسانەی گوێ لێ بووبێ تەگبیر چیە؟

نا... بەڕاستی ڕوو لەکوێ بکەم؟"

لەترسان تابەیانی چاوم لێك نەنان و خەوم لێ ڕەوی.

هێشتا دنیا تاریك بوو و ڕۆژی مەعلوم نەکردبوو دیتم لە دەرگایان دا.

نازانم بەسەرهاتی ئەو بەندیانەت خوێندۆتەوە کە حوکمی ئیعدامیان دراوە یان نا؟ بەیانی زوو قازی عسکەرو فەرمانبەرەکان دێنە ژووری بەندیخانەو حوکم دراو لەخەو هەڵدەستێنن و دەڵێن هەستە چ وەسیەتێکت هەیە بیکە. دەزانی

ئەو حوکم دراوە بەدبەختە تووشی چ حاڵێك دەبێ؟ منیش ڕاست دوچاری ئەو حاڵە ببووم. ئەو کەسەی لەدەرگای دەدا لە پێش چاوی من پەیکی مردن بوو. بێگومان خەبەرێکی ناخۆشی پێبوو، ئەگینا بەو بەیانییە لەچی دەگەڕا؟ هەروا بەترس و لەرزەوە گوتم:

ـ کێیە بەو بەیانیە چ خەبەرە؟

ـ قوربان! ئاغا چەند سوارێکی ناردوون دەیانەوێ دەسبەجێ تۆ ببینن.

ـ چ خەبەرە؟ بۆ بەو شەوە بەسەریان دا داوین؟ ئاغا چ کارێکی پێمە؟

نۆکەرەکەم لەپشت دەرگاوە گوتی:

ـ ئاغا دەیەوێ بچێتە شار. ویستی پێش ڕۆیشتن تەگبیرێك بەتۆ بکا.

ـ فکرم بۆ مەسەلەکەی دوێشەو چوو، ترسێکم ڕێ نیشت هەر مەپرسە: "کوڕە خۆ لە مردن زیاتر نیە؟ باهەستم بزانم چیە؟!".

بەڵام دەترسم ئەوەندەم لێدا بە زەلیلی بمرم. هەستامە سەر پێ: "ئەو سەگبابە چۆنی زانیوەتەوە کە دەمەویست مڵکەکانی دابەش بکەم؟".

"ناکا بیستبێتی کە لەگەڵ بورهان بەگ زۆر خۆمانە دانیشتووین و دڵی پەشابێ؟"

پەردەکەم لاداو تەماشایەکی دەرەوەم کرد، بەڵام چ ببینم؟

ژمارەیەکی زۆر سواری چەکدار دەورپشتی ماڵەکەمیان گرتبوو، تێگەیشتم ئەگەر بەخۆشی نەچم شەپ دەزانێ قۆناخ لە کوێیە.

دەسبەجێ جلەکانم لەبەر کردو چوومە دەرێ. نوێنەری ئاغا لەپێش پلیکانەکان دانیشتبوو، بەڵام بەپێچەوانەی جاران زۆر ڕوو گرژو تووڕە دیار بوو. هیچ لەبەرم هەڵنەستاو گوێی نەدامێ.

تێگەیشتم هەواکەی تووشە. گوتم:

ـ بەخێر هاتی جەنابی نوێنەر!

کابرا وەك بزمار لە شوێن خۆی چەقی بوو، زۆر بەوشکی وەڵامی دامەوە:

ـ سوپاس. ئاغا هەر ئێستا تۆی دەوێ.

ـ مەسەلە چیەکە بەو پەلەیە ناردوویە؟ سەبر کەن نوێژەکەم بکەم.

ـ ئاغا زۆر بە پەلەیە، دەیگوت دەبێ دەسبەجێ وەڕێ کەون.

"کەوابوو ئەوەی دەمگوت ڕاستەو هەر بگەمە قەڵاتی ئاغا چوار میخەم دەکێشن!".

دووکەس لاقیان هەڵێنام و سواری ئەسپێکیان کردم. زۆر دەترسام، بەڵام ناوچاوانی نۆکەرەکان هێندە تاڵ بوو لەخۆم ڕا نەدی بڵێم: "بەزەییم بەم بەستەزمانەدا دێتەوە بەپێ دەڕۆم". دەمزانی سوارەکان ناهێڵن.

لە ڕێگا هەر دڵخۆشی خۆم دەدایەوە "ڕەنگە مەسەلەیەکی تر بێ، ئەمن بەخۆڕایی تۆقیوم".

"باشە، ئەگەر شتێکی ترە بۆ بەم بەیانیە پیاوی بەدوادا ناردووم؟".

هەتا گەیشتینە قەڵات ئارەقی مەرگ لەهەر حەوت کونی ئەندامم هەڵدەچۆڕا.

کاتێك گەیشتینە قەڵات دیتم ئاغا لەبەر دەرگا ڕاوەستاوەو بە پێشوازمەوە هاتوە، نەختێك هاتمەوە سەرخۆم.

لاقی ڕاستم لە ئاوزەنگی دەرهێناو بە احترامێکی زۆرەوە بەقەو گوتم:

ـ استغفرالله، بمبوورە، تکا دەکەم.

ـ جەنابی شێخ دیارە دەبێ بمبووری کە بەم بەیانیە زووە جەنابتم ئەزیەت دا. دەمەویست بچمە شارو پێویست بوو ماڵاوایی لە جەنابت بخوازم.

پرسیم:

ـ بۆچی وا بەپەلە دەچی؟.

ـ باش نیە وەختی هەڵبژاردن من لێرەبم. ئاغا دەبێ بێلایەن بێو لایەنی کەس نەگرێ!.

بە قسەکردن چووینە ژوورێ، نۆکەرەکان ڕۆیشتن و هەر لەگەڵ ئاغا دووبەدوو ماینەوە دەسبەجێ هەوای زاری ئاغا گۆڕا:

ـ دەی پیری سەگباب! بیستم لەگەڵ بورهان بەگ زۆر گەرم بووی.

ـ ئاغا بەگیانی خۆت، ئەمە سیاسەت بوو، ڕۆڵ بوو یاریم کرد.

ـ بە کورتی ئاگات لە خۆت بێ، نەچی فریوی ئەمانە بخۆی!

باش پێوە ببووم "ئەم لام تات و ئەولام تات" دەمزانی ئاخرەکەی لەگەڵ یەکێك لەمانە تووشی کێشە دەبم.

ئاغا شووشە شەڕابەکەی کردەوەو پەرداخەکانی پڕکردو دایە دەستم:

ـ بگرە بخۆوە هەتا ڕاستیەکەی بڵێی.

گوتم:

ـ ئاغا! لەخورێنی باش نیە.

ـ بخۆوە سەگباب! هیچ لۆتی‌یەك سەبووحی ڕەت ناکاتەوە.

ـ بۆ خۆشتان هەر باش نیە بەم بەیانیە بخۆنەوە!

ـ لێم مەبە دوکتۆر هەڵدە یاڵڵا.

ئاغا پێکەکەی خواردەوەو منیش بەنابەدڵی خواردمەوە. پێکی دووهەم و سێهەمیش خورایەوە من زیاتر وریای قسەکانم بووم نەوەك قسەیەکی خەراپم لەدەم دەرپەڕێ و بەدبەخت بم.

ـ خوا دەزانی لەم هات و چۆیە ماندوو بووم. خۆزگە زوو ئەو هەموو داراییەیان لێ وەردەگرتم و ئاسوودە دەبووم. لەم ئاغایەتی و هەڵسووڕدا سووڕە ماندوو بووم. ئەگەر خوا بکا ئەم زەوی دابەشکردنە زوو دەست پێبکا ئاسوودە دەبم.

کە ئەم قسەی کرد، سەرخۆشی مانای بێ لە کەللەم دا نەما: "ئاغا دەڵێ چی! باسی دابەشکردنی زەوی دەکا. چۆن ئەمە لایەنگری دابەشکردنی زەوی و زارە؟ دیارە دەیەوێ قسە لە من دەرکێشێ؟ دیارە یەکێك قسەکانی دوێنێ شەوی منی بیستوەو هاتوە بۆی گێڕاوەتەوە".

کەمێك کشامە دواوەو گوتم:

ـ خوا نەکا ئاغا! اسغفرالله! ئەم قسانە چیە. دابەشکردنی زەوی وزار یانی چی؟ چۆن دەکرێ ماڵی یەکێك بدەن بە یەکێکی تر؟

ئاغا نەختێك لێم ورد بۆوە.

ـ خوا چ نەکا؟

ـ نافەرمووی زەوی دابەش دەکرێ. خوا نەکا زەوی وزار دابەش کرێ.

ئاغا پتێکی لە ژێر چەناگەی من داو سەرم هەڵبڕی.

ـ نامەرد! هەی (...) بەڕیشی ئەو کەسەی تۆی کردە گەورەی ئێمە! ئەتۆ دەزانی زەوی دابەش کردن چیە؟ ئەم قسانە دەکەی؟!

ـ ئاغا گیان بە سەدەقەت بم خۆ ئەمە مەسەلەی ریازی نیە. دەیانەوێ ئەو مڵکەی لەباب و باپیرت بە میرات بەجێماوە لێتی بستێنن و بیدەن بەو کەسانە کە قەتیان هیچ نەبووەو هەمیشە نۆکەرو ڕەعیەت بوون!

ـ زۆر باشە با بیان دەنێ! مەگەر ئێمە رێگایەکی ترمان هەیە؟ چەند ساڵە بەردی دیموکراتی لە سنگم دەدەم بۆ رۆژێکی وایە ئیتر!

ئاغا لای وابوو بەراستی "گێلە"م. خۆی لەپاپا بەکاتولیکتر نیشان دەداو دەیەویست قسە لەمن بکێشێتەوەو مەسەلەن بڵێم: "بەڵێ ئەم لادێییە بەستەزمانانە زۆر زەحمەت دەکێشن و هیچیان پێ نابڕێ". بەڵام من هێندە کاڵ نەبووم کە خۆم پێوە بکەم.

وام نیشان دا کە زۆر بەم قسانە ناڕەحەتم گوتم:

ــ چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەگەر تۆش بتەوێ ئێمە نامانەوێ. دێموکراتی و عەدالەت یانی چی؟ ئەمانە قسەی غەیرەدینەکانن! !

ئاغا بەڕاستی پێی ناخۆش بوو، قامکی خستە سەر لێوی:

ـ س س س. نامەردی غارنیشین. تۆ هەقی ئەم غەڵەتەت چیە کە دەم لە مەسایلی سیاسی وەربدەی! ئەتۆ دەبێ گوێلکان بلەوەڕێنی. ئێستا هاتووی لەگەڵ من باسی سیاسەت بکەی! !

ئەو ملکانەی لە باپیرانمانەوە بۆمان هاتوون کەڵکیان چیە. ئەم کێوانە لە زەحمەت و کوێرەوەری بەولاوە چ قازنجێکیان بۆ من هەیە. هەموو کەس دەڵێ فلانەکەس ٢٣ گوندی هەیە. یەکێك نایە حیسابی قازانج و زەرەرەکەی بکا.

من زۆر لە داهاتی ئەو ملکانە زیاتر دەدەم بەم سوارانە و بەم نۆکەرانەم.

ئەگەر دەسەلاتم بوایە پێم خۆش بوو زۆر قسانی پێبلێم. "ئاخر بە بابەوەت بە قوڕێدا کەم ئەگەر ئەم گوندانە زیانیان بۆ تۆ زیاترە ئەی بۆچی ڕات گرتوون؟ بۆچی ساڵێ دوو سێ مانگ وەختی خۆت لێرە بەفیڕۆ دەدەی؟ ئەی ئەم هەموو پارە لەکوێ دێنی کە خەرجی سەگەکەت بەقەدەر ماڵێکی پێنج سەر خێزانی دەبێ...؟

بەلام کوا؟ کێ دەوێرێ دوو قسەی ڕاست بکا؟! خۆ من خوا شێتی نەکردبووم، بەمن چی؟

تەنیا شتێکی ناڕەحەتی دەکردم قسەکانی ئاغا بوو. تووشی گومان ببووم، نەمدەزانی ئەم قسانەی بەڕاستە یان دەیەوێ من تاقی بکاتەوە.

گوتم:

ـ ئاغا! لەگەڵ ئەوەش دا سێبەری جەنابت لەسەر ئەم ملکانە بێ زۆر باشە.

ـ دەمەوێ باش نەبێ. خۆزگە دابەشکردنی زەوی وزار زووتر دەستی پێ کردباو رزگاریم هاتبا.

ـ ئاخر ئاغا زەوییەکانت لێ دەستێنن.

ـ کوڕە با لێم بستێنن. کێ ئەم زەوییانە دەکڕێ!

هیچ نەبێ دەوڵەت پارەیەکمان دەداتێ. نەحلەت لەبابی من ئەگەر پێش هەموو ئاغاکان رازی نەبم. پارەکە وەردەگرم و دەچمە ئەستەمبووڵ، سی چل دەستە خانووبەرە دەکڕم.

پێت وایە ئەم گوندانە ساڵێ داهاتیان چەندە. بەخودا ئەگەر ئەمانەم لێ بستێنن و دەپازدە دەستم خانووبەرە بدەنێ زۆر رازیم.

گوتم:

ـ ئاغا خۆ پارەی ملکەکان نەغد نادەن!

ـ باشە، هەر پێش قیستەکەیم بەسە. کارێکی وا دەکەم کە پارەی هەموو ملکەکانم بەناوی پێش قیست وەربگرم و ئەوەکەی تری لەسەر قازانجێ بمێنێتەوە.

ئەی پێت وایە بۆچی ئەوەندە هەوڵ دەدەم وەکیلی ئەم ناوچەیە هی خۆم بێ. پێت وایە لەبەر چاووبرۆی "حمید رسولی"یە کە ئەم هەموو پارە بۆ هەڵبژیرانی خەرج دەکەم؟ ئەم زەحمەتەم بۆ وەیە کە سبەێنی پارەی ملکەکەم دووقات وەربگرم.

پرسیم:

ـ کەوایە بۆچی هەموو خاوەن ملکەکان رازی نین؟

ـ ئاخر بابە گیان! خۆ ملکی هەموو کەس وەك دێهاتەکەی من نیە کە دێمەکارو شاخ و داخ بێ؟ زەوییەکانی ئەوان بەقیمەتی خوێنی بنیادەمیش هەرزانن.

قسـەکانمان گـەرم کردبـوون و زۆر لەسـەر ئـەو باسـانە ڕۆیشـتبووین. ئاغـا بـە تەواوی سەرخۆش بوو. لەنەکاو قسەکەی گۆڕی و گوتی:

ــ دەزانـی بۆچـی وا بەپەلـە بـەدوام دا نـاردی؟ مـن بڕیـارم داوە ئـەمڕۆ بچـمە ئەسـتەمبووڵ. مەسـەلەی هەڵبـژاردنی ئەمسـاڵ هـەراو هۆریـای زۆر دەبـێ و لەوانەیە خوێنی تێدا بڕژێ. مانەوەی من لێرە باش نیە. دەستووراتی تەواوم بە وەکیل و نۆکەرەکانم داوە. هەموو لەبەر دەستی تۆ دان. لەهیچ شتێك مەترسە. لێدە، بکوژە، هەرچی دەتەوێ وا بکە. نۆکەرەکانم لـەبن جوابەکـەی دێنـەدەر. ئەمانە پیاوبکوژن و سەگ بکوژن پێیان وەك یەکە.

تـەنیا ئەوەندەیـە وریـای خـۆت بـە. بـەفریو نەچـی. ئـەمن هـەموو شـتێکم تێگەیاندوون. هەر ئەوەندە بەقسەی تۆ دەکەن کە بە قازانجی من کار دەکەی، ئەگینا ئەگەر پێخوار دابنێی بەلایەکت بەسەر دێنن بەداستان بیگێڕنەوە.

دەبی "حمید رسولی" هەڵبژێردرێ. لە شات و شووتی فەرماندەی پـۆلیس هـیچ مەترسە.

گوتم:

ـ دڵنیا بە، هەرچی لە دەستم بێ درێخی ناکەم!

ـ چی؟ هەرچی لە دەستت بێ درێخی ناکەی؟ دەبێ هەڵبژێردرێ و بڕایەوە.

ئاغا منی بەڕێ کردەوە. بە احترام و ئەدەبی جارانەوە لەپێش چاوی هـەمووان دەستی ماچ کردم و گوتی:

ـ دوعای بەخێرمان بۆ بکە. جەنابی شێخ فەرامۆشمان مەفەرموو.

لەگەڵ سوارەکان گەڕامەوە. خۆم وەك کەسێك دەهاتە بەرچاو کە بـۆ مەیـدانی ئیعدامی دەبەن.

زۆرم پێخۆش بوو خۆم ون بکەم و دەست لـە هـەموو قازانجـەکانی هـەڵبگرم. ئەو بڕیارەشم دا. لەدڵی خۆم دا گوتم:

"بابـە گیـان! هـەتا کارەکـە پـیس نـەبووە لێـدە بـڕۆ! شـەوێك، نیوەشـەوێك پارەکەت هەڵگرەو ڕاکە. ئێرە ئـیتر بـۆ مانـەوەی تـۆ نابـێ. ئـاخر یـەکێك لـەم دووکەسە ئاخری هەر هەڵدەبژێردرێ و ئەتۆ دەکەویە داوی ئەوەکەی تریان".

ئەم نەخشەیەم پێباش بوو. لـەڕێگا لـەدڵی خـۆم دا هـەر بـیرم لـێدەکردەوەو نەخشەم بۆ هەڵاتن دەکێشا.

کاتێك گەیشتمەوەماڵێ سوپاسی وەکیلی ئاغام کردو گوتم:

ـ زۆر سوپاس. خواحافیزتان.

بەڵام وەکیل زۆر بەمۆنی و جیددی گوتی:

ـ ئاغا فەرمانی داوە چەند کەس لە سوارەکان لە خزمەت تۆدا بن و هـەتا دوای هەڵبژاردن پارێزگاریت لـێبکەن.

دڵم بە جارێك داخورپا. بەو پێیە هەموو نەخشەکانم هەڵدەوەشان. ئاغـا لـەمن زرینگتر بوو.

گوتم:

ـ نا بابە گیان! ئێمە ئازارمان بۆ کەس نیەو کەسیش کاری بەئێمە نیە.

ـ ڕاستە، بەڵام کـاری هەڵبـژاردن گاڵتـە نیـە. لەوانەیـە خوانەخواسـتە تووشـی وەزەندییەکت بکەن. پاشان بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی من بێ، ڕووی کـردە سوارەکان و گوتی:

ـ ئێوە لێرە وەمێنن. شەوو ڕۆژ دەبێ لەدەوری ئەم ماڵە ئێشـك بگـرن. ئەگـەر لێی خافڵ بن و موویەك لەسەری شێخ کەم وەبێ، بەگۆڕی بابتـان دا دەڕیـەنم. بۆ خۆشم هەموو ڕۆژێ سەرتان دەدەم.

فەرمانی وەکیل ئەم لاو ئەولای بۆ نەبوو. لەپێش چاوی هەمووان داوێنی ماچ کردم و خواحافیزی کردو ڕۆیشت. لەو ساتەوەماڵەکەم کەوتە ژێر دەسەلاتی سوارەکانی ئاغا.

بەم جۆرە دیتم هەموو نەخشەکانم هەڵوەشاونەوەو تازە ناتوانم لە چنگ ئەم سوارانە دەربازیم.

چوومە ژووری، ماندوومجرۆ، لەسەر جێگاکەم کەوتم: "خوایە بۆ خۆت روحم بکە" نەمدەزانی سەرەنجامی من چ دەبێ.

بەیانی سەردەستەی سوارەکان بەتۆکەرەکەمی گوتبوو کارێکی بەپەلەی هەیەو دەیەوێ بم بینێ و ڕاسپادەیەکی گرنگی ئاغام پێ ڕابگەیەنێ.

ڕێگا نەبوو بێجگە لەوەی دەسبەجێ ئیزنی بدەم بێتە ژوورو ڕاسپاردەکەی بگەیەنێ.

وەختێك هاتە ژووری سەری بۆ دانواندم و گوتی:

ـ قوربان "حمید رسولی" وەڵامی داوە تا چەند سەعاتی دیکە دێتە سەردانی جەنابت. ئاغا هەموو کوێخاکانی ڕاسپاردوە یارمەتی بدەن. دیارە جەنابیشت لوتفت لەگەڵی دەبێ.

سەرێکم بۆ لەقاند:

ـ دیارە، ئەوان نووری چاوی ئێمەن.

سەردەستەی سوارەکان وەدەرکەوت و منیش لەبیرو بەرژەوەند ڕاچووم.

"ئەگەر فەرماندەی پۆلیس پێبزانێ کە من "حمید رسولی"م بۆ ماڵی خۆم ڕێگا داوە، تەگبیر چیە. حەتمەن پێش دەزانێ. خۆ کابرا پنگ نیە، بابایەکە ئەمن و ئەمانی هەموو ئەم مەڵبەندەی دابین کردوە، هەزاران دزو درۆزنی ناردۆتەوە ماڵی خۆیان، من سەگی کوێم تا بتوانم فێڵی لێبکەم".

چ بکەم، چ نەکەم، فکر. فکر. فکر، لەنەکاو فکرێکی خۆش وەك بریسکە لەمێشکی دام:

"زۆر باشە. رێگا لەوەی باشتر نابێ".

دەسبەجێ هەستامە سەرپێ. جلەکانم لەبەر کردو بانگی سەردەستەی سوارەکانم کردو گوتم:

ـ بۆئەوەی "حمید رسولی" هەڵبژێردرێ سەرێکی ئەم گوندانە دەدەم و دەنگی بۆ کۆ دەکەمەوە.

سەردەستە پرسی:

ـ ئەی تەگبیری کاك "حمید رسولی" چیە کە گوتوویە دێتە ئێرە؟

ـ وەڵامی بدەنێ بێتە ئاوایی لەوێ یەکتر دەبینین. ئەمە زۆر باشترە، لەوەی ئەو بێ بۆ ماڵی ئێمە.

ئەم فێڵەم ئەوەندە بەلێزانی بوو کە هیچ دوودڵی و دردۆنگی بۆ سەردەستەی سوارەکان نەهێشتەوە. گوتی:

ـ چۆنێکی جەنابی شێخ بەباشی بزانێ ئەو ڕاستە.

دەسبەجێ چەند کەس لەسوارەکانی بانگ کردو فەرمانی پێویستی پێ دان کە بەڕواڵەت لە خزمەت من دا بن، بەلام لەڕاستی دا لێم وریابن. گوتم:

ـ ئەم سوارانەم لەگەڵ بن قسەی لێ پەیدا دەبێ و خەڵك وەك پێویستە باوەڕ ناکا کە من بەڕاستی لایەنگری "حمید رسولی"م. دیار بوو پڕ بەدڵ باوەڕی بەقسەکانم هەیە بەلام ئیجازەی نیە بەقسەم بکا. کاتێك دیتم دوودڵە گوتم:

ـــ شتێکی دیکە دەکەین. با سوارەکان ئەسپەکانیان بەجێ بهێڵین و جلەکانیشیان بگۆڕن و بە دوای من دا بێن.

ئەم پێشنیارەی قبووڵ کرد. ئاغا لەپێش دا پێی گوتبووم کە چوونی ناو خەڵك وەك ئەوەیە لەزستان دا بچیە ناو دەریا. نابێ زۆریان لەنێو بمێنیەوە، ڕاستیشی دەکرد. ئەمە مەسەلەیەکی نەفسییە.

خەڵك هەر ئەوەندە ڕێز لەیەکێك دەگرن کە پێیان وایە لەخۆیان نیە. ئەگینا کاتێك دیتیان ئەویش یەکێکە وەك خۆیان ئیتر هیچ نرخی بۆ دانانێن.

چووم بۆ ئەو گوندە کە ناوەندی ناحیەکە بوو.

بەرێکەوت ئەو ڕۆژە هەینی بوو. خەڵك کە خەبەری منیان بیستبوو تا دەری ئاوایی بەپیرمەوە هاتبوون.

ژن، پیاو، پیر، لاو، تەنانەت منداڵەکانیش هاتبوون. ئەگەر پادشایەك لە هیندستانەوە هاتبا ئەو پێشوازییەی لێ نەدەکرا. بۆم دەرکەوت ناوی من لەو ناوە چاك دراوە.

پاش تۆقە لەگەڵ چەند کەسی ناسراو و سەربەدەرەوە ڕۆیشتین بۆ تەکیەی ئاوایی.

خەریك بوو بچمە ژووری تەکیە دیتم کابرایەك دڕ بە خەڵك دەداو بەپەلە دێتە پێشەوە.

زۆر ترسام. نەگەیشتم ببزووم کە کابرا گەیشتە سەرم و خۆی بەسەر کەوشەکانم دا دا:

– بەقوربانی تۆزی بەرپێت بم حەزرەتی شێخ لە ئاسمانێم دەویستی لە عەرزێم وەدەست کەوتی. هەموو شەوێ خەونت پێوە دەبینم. هاتووم دوعای خێرم بۆ بکەی.

هەتا ئەو ڕۆژە حمید رسولّیم نەدیبوو.بەلاّم لەڕەفتارو جوولاّنەوەی ئەم کابرایە تێگەیشتم کە ئەم پیاوە زمان لووسە ئەو کەسەیە کە دەیەوێ ببێتە وەکیل. قۆلّم گرت، ڕاستم کردەوە گوتم "استغفرالله".

پاشان چووم لەلای سەرەوەی تەکیە لەسەر دۆشەکێکی گەورە کە بۆمن دیاری کرابوو دانیشتم.

هەموو خەلّکی ئاوایی دەستەدەستە دەهاتنە زیارەتی من و منیش دوای دەست دەنێو دەست نان بەدزی بە گوێم دا دەچپاندن:

ـ وەکیلی ئێوەو تەنیا کەسێك کە دەتوانێ خزمەتتان پێبکا ئەم پیاوەیە. دەنگی خۆتان بۆ ئەو بدەن.

خەلّك کە بیستبوویان وەکیلی داهاتوویان هاتوەو لەتەکیە لەتەنیشت من دانیشتوە کەوتبوونە جم و جۆلّ. هی وا هەبوون دووجار سێجار دەهاتنە تەنیشتم و دەیان پرسی:

ـ قوربان جەنابی وەکیلی ئێمە ئەمەیە؟

ـ بەلّێ موسولّمان.

دەمدی هێندێکیان تێك دەچن و ڕوو گرژ دەکەن و هێندێك پێیان سەیرە. پێم وابوو چونکە جارێکی تر گووتوومانە بورهان وەکیلی ئێوەیەو ئێستا قسەکەمان گۆڕیوە پێیان سەیرە. بەڕاستی حەیفە ئەو مێشکەی من تا ئێستا ساخ ماوەتەوە. باش وابوو مێشکی منیان ڕۆ کردباو قسلّ و گێچیان تێ کرد بایە.

جەنابی وەکیل بەمەندەش رازی نەبوو داوای لێ کردم کە پێکەوە خولێك بەنێو ئاوایی دا بسووڕێینەوە.

منی نەفام نازانم بۆچی بەقسەم کرد.

وەکیلی بەرێز قۆڵی لەقۆڵی من کرد، بۆ ئەوەی خەڵك چاویان لێ بێ و حورمەت پەیدا بکا. منیش لەبەر دڵی ئاغا گوتم:

"باشە، با ئەمە هەڵبژێردرێ و دڵی ئاغام لێ نەیەشێ ئەوەکەی تری قەی ناکا".

لایەنگرانی جەنابی وەکیل بەدەرفەتیان زانی و بە دەهۆڵ و زوڕناوە بەپیرمانەوە هاتن. بەتایبەتی دەیانەویست هەموو خەڵکی ئاوایی بزانن کە منیش لایەنگری ئەوم.

کارەکە زۆر گەورە ببوو دەمەویست بەجۆرێك خۆم لە دەستی رزگارکەم. بەڵام چما دەی هێشت؟ وەك زەروو پێمەوە نووسابوو، بەری نەدەدام. لەپڕ فکرێکم بۆ هات.

گوتم:

ـ نوێژ درەنگە ئەمن دەبێ بڕۆم.

بەڵام جەنابی وەکیل دەستی بەپاڕانەوە کرد:

ـ بەقوربانت بم تاوێکی تریشمان لەلا گیر بە !

پاشانیش نەی هێشت قسە بکەم بردمی بۆ لای بارەگای حیزبی خۆیان. خۆ نەدەکرا لە نێوەڕاستی کۆلان دا لەگەڵی بەشەڕ بێم.

ناچار دەگەڵی چووم، چای تازەدێمیان هێنا، قلیانیان سازکردو چەند کەسیش بە زەحمەت خەڵکەکەیان لێ تەکاندینەوە.

دەڵێن مریشك بۆ خۆی خۆڵ وەسەری خۆی نەکا بەکەسی وەسەر ناکرێ. منی بەدبەختی لە هەموو دنیا بێخەبەریش بەدەستی خۆم چاڵێکی گەورەم بۆخۆم هەڵکەندبوو کە تێکەوتنم مسۆگەر بوو.

بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر سەرۆکی پۆلیس پێ‌بزانێتەوە تەگبیرم چیە؟

لەوکاتە دا یەکێك لە نێو خەڵکەکە ڕاست بۆوەو پرسی:
ـ جەنابی شێخ ئەگەر ئێمە دەنگ بۆ ئەم زاتە بدەین چیمان بۆ دەکا؟
وەکیلی گەل دیار بوو لە پێشەوە دەرسەکەی حازر کردبوو، هەرکە ئەمەی بیست غاری دا پشت کورسی‌یەك و گوتی:
"بەروخسەتی جەنابی شێخ دەمەوێ بەرنامەی خۆمتان بەدرێژی بۆ باس بکەم.
یەکەمین کاری من دوای ئەوەی هەڵبژێردرام دابەش کردنی زەوی و زارە...
تەواوی ئەم زەوی و زارە هی ئێوە زەحمەتکێشانی ئەم وڵاتەیە...
هەتا ئێستا کەس لەبیری ئێوەدا نەبووەو نەیانویستوە ئێوە لەم هەژاری و برسیەتی‌یە ڕزگار بکەن...
ئاخر لە چ جێگایەکی ئەم جیهانە شتی وا هەیە کە یەکێك خاوەنی ٢٣ پارچە مڵك بێ و سەدان کەسیش لەم گوندانەدا لەگەڵ برسیەتی و هەژاری دەستەویەخە بن.
دیتم کابرا زۆر توند دەڕواو خەریکە قسەکانی بگەنە جێگای باریك. ویستم کارێکی وا بکەم لە کورتی بیبڕێتەوە، بەڵام وەکیلی گەل وازی نەدێنا، هەر مستێکی لە کورسی‌یەکەی دەدا دەتگوت گۆڕی من هەڵدەکەنێ.
بەتایبەتی ئەو جنێوە تەڕو تازانەی بەئاغای دەدان و چەپڵە بۆ لێدانی لادێییەکان بەجارێك زەندەقی برد بووم. گوتم:
جەنابی وەکیل تۆ دڵنیا بە ئەمانە خادم و خاین لێك دەکەنەوە.
لادێییەکان هاواریان کردو چەپڵەیان لێدا. جەنابی وەکیل پەیتا پەیتا سەری دادەنواندو سوپاسی دەکردن. پاشان بەدەنگێکی پڕ لە احساساتەوە گوتی:
ـ زەوی‌یەکانی ئێوە لەدەستی ئەو ئاغا بێ ویژدانانە دێنمەوەدەرو دەتان دەمەوە. بەڵێنتان دەدەمێ کە هەمووتان دەبنە خاوەنی ئاوو زەوی خۆتان.

دێهاتییەکان لە خۆشیان هاوارێکی وایان کرد خەریك بوو پەردەی گوێم بتەقێ.
لەو قسانەڕا کە لەئاغام بیستبوو دڵنیا بووم کە ئەم قسانە لەسەر ڕەزامەندی ئاغا دەکا. بەڵام کابرای پارێزەرم کە لە پشتمەوە دانیشتبوو بەسپایی بە گوێی دا چپاندم:

ـ یا شێخ وریا بە ئەمانە زۆر شلوقی نەکەن، ئاغا بەهی تۆی دەزانێ. ها. !
دیتم ڕاست دەکا. ئاتەکی عەباکەم کۆ کردەوەو گوتم:

ـ نوێژەکەم درەنگ دەبێ، دەبێ مەرەخەس بم. کابرا لە مەمانان زرینگتر بوو گوتی:

ـ قوربان رێگا بدە خزمەتکاری خۆشت لە خزمەتت دابێ.
دەمتوانی چی جواب بدەمەوە؟
دیسان پێکەوە کەوتینە ڕێ. لەرێگا دا لێم پرسی:

ـ ئەگەر لە هەڵبژاردن دا سەرکەوی یەکی چەند هێکتاریان زەوی دەدەیەی؟

ـ بیست هێکتار.
لەدڵی خۆم دا گوتم: "سەگی سەگباب تەواوی زەوییەکان بەشی نیوەی ئەم خەڵکە ناکەن. ئەوەکەی تری لە گۆڕی بابت دەردێنی؟".
دیتم بەو جۆرە هەڵبژیرانی ئەم کابرایە مسۆگەرەو بورهان شەیپووری قوڕپەسەر دەم لە پووش بووە...
دڵنیا بووم فەرماندەی پۆلیس هەروا بەهاسانی لەمن خۆش نابێ و هەر چۆنیک بووە ڕقی خۆی بەمن دەرێژێ. بەڵام هەرچی بێ رازی کردنی ئاغا بۆمن لە فەرماندە گرنگتر بوو.
ئاغا هەموو کارێکی پێدەکرا، ئەو هەم پارەی هەبوو هەم دەسەڵات. دڵم خۆش بوو کە هیچ نەبێ ئەم یەکەیانم رازی کردوە.

کاتێک خەڵکەکە بڵاوەی کردو ئێمە بەرەوماڵ گەڕاینەوە سەر دەستەی سوارەکان هاتە پێش و گوتی:

ـ جەنابی شێخ ئەم دەستە گوڵە چ بوو بە ئاوت دادا؟

ئەم جۆرە قسەکردنەیم زۆر پێ ناخۆش بوو، بەتووڕەیی‌یەوە پرسیم:

ـ مەگەر چ بووە؟

ـ ئەو کابرایەی هێندەت هەوڵ بۆدا کەڵەکبازو سەگبابی وەک خۆی کەمە.

ـ بەمن چی. ئەمن لەبەرخاتری ئاغا پیشتیوانیم لێ‌کرد.

سەردەستە جڕتێکی بۆ ڕاهێشتم و بەپێکەنینەوە گوتی:

ـ پیاوی باش! ئەمە "حمید رسولی" نەبوو. ئەمە یەکێک لە ناحەزانی سەرسەختی ئاغایەو هەمیشە پێکەوە کێشەیانە.

ئەگەر بۆمبام بەسەردا کەوتبایە ئەوەندە ڕانەدەچڵەکیم پرسیم:

ـ بەڕاستیتە؟

ـ درۆی بۆ چیە؟

خەریک بوو هەر لەوێ بەسەر ئەسپەکەوە دیق بکەم. بەڵام بۆ بەدبەختی لەسەگ گیان سەخت ترم. بریا هەرلەوێ گیانم دەر چووباو تووشی ئەو هەموو بەدبەختی و ڕۆژ ڕەشی‌یەی دواتر نەبووبایەم.

دەمزانی لەسەر ئەم شیرینکاری‌یە لە دوولاوە تەمبێ دەکرێم. ئاغاو فەرماندە هەردووکیان ئەمبەر ئەوبەرم پێ‌دەکەن.

ڕاست وەک تۆپی یاری بەڵام ئەم جارە یاری‌یەکە هەر بەدووکەس دەکرا. ئاغاو فەرماندە ڕێك دەکەون و بەهەردووکیان مشووری من دەخۆن.

هەموو دەرگایەکم لەسەر داخرابوو. مەگەر موعجیزەیەك ڕوویدا، ئەگینا هەفتەی دادێ خۆم لە بەندیخانە دەبینمەوە".

هەتا گەیشتمەوە جێ، نیوەی گۆشتی ئەندامم توایەوە. هەرچی بیرم دەکردەوە چۆن خۆم لەم داوە ڕزگار کەم ئەقڵم نەیدەبڕی.

ڕێگای هەڵاتنم لەهەموو لایەکەوە لێ تەنرابوو. دەمزانی لەم شەوەوە بێجگە لە پیاوەکانی ئاغا پۆلیسێکیش بۆ ئێشك لێ کێشانم دیاری دەکەن و خوا دەزانی چ پەندێکم بەسەر دێنن.

لای ئێوارێ ماندوومجڕۆ گەیشتینەوە ماڵ. دەسبەجێ چوومە ژوورەکەی خۆم بۆ ئەوەی ماندووم بحەسێتەوەو بەهیوای ئەوەی لە دەست ئەو فکرە ناخۆشانە ڕزگار بم دەزگای خواردنەوەم لێ داکوتا.

ئەوەندە ناڕەحەت بووم کە سەرخۆش و بێخەبەر کەوتم و نەمزانی کەنگێ خەوم لێکەوتوە. سبەینێ زۆر زوو بەدەنگی دەرگا کوتان لەخەو ڕاپەریم.

دڵم خەبەری دابوو کە شتێکی ناخۆش ڕوو دەدا. ڕاست بوومەوەو پەردەکەم لاداو تەماشایەکی دەرەوەم کرد. دیتم سێ کەس لەلایەن وەکیلی ئاغاوە هاتوون. دڵم داخورپا: "ئەی هاوارو داد ئاغا هەموو شتێکی زانیوەتەوە، ئێستا بەپەل بەستوویی دەمبەنە لای ئەو".

ئەوەی لەپشت دەرگا بوو بەقەوتر لە دەرگای دا. بەدەنگێکی لەرزۆکەوە پرسیم:

ـ کێیە؟

سەردەستەی سوارەکان لەپشت دەرگاوە جوابی دامەوە:

ـ وەکیلی ئاغا وەڵامی داوە کە سوارەکان دەسبەجێوەڕێ کەون و بچنەوە بۆ قەلات.

شادەو ئێمانێکی بەهەقم هێناو لەژوورێ وەدەرکەوتم:

ـ هەر ئەمرێکی وەکیلی ئاغا بیدا لەسەر چاوانە.

سوارەکان وەك سەربازی لەشەڕداشکاو کەل و پەلی خۆیان تێك ناو تەنانەت هێندێکیان بێ ماڵئاوایی خواستن وەڕێ کەوتن. بەرێیشتنی ئەوانە هەم دڵخۆش بووم هەم ترسم ڕێنیشت. یانی چی؟ بۆچی وەکیلی ئاغا سوارەکانی بانگ کردۆتەوە؟ هەرچی هەیە بە جەهەننەم. بەگوڕی بابیەوە. هەر ئەمشەو وا خۆم دەرباز دەکەم هەتا ماون چاویان بەڕوخسارم نەکەوێتەوە.

پاش ڕۆیشتنی سوارەکان چوومە ژوورێ و دەستم بە کۆکردنەوەی ئەو پارەو زێرو جەواهیراتە کرد کە لادێییەکان بەدیاری بۆیان هێنابووم. هەرچی بەوەزن سووك و بەقیمەت گران بوو، لەدوو چەمەدانم هاویشت.

لای نیوەڕۆیە هەموو شتێکم ساز بوو. خواخوام بوو زوو ڕۆژئاوا بێ و بێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێ و بێ ئەوەی پۆلیس پێ بزانێ فیزماڵکی بدەمێ.

هەموو ڕۆژێ پاش نیوەڕۆیان هێندێك لە لادێییەکان دەهاتنە زیارەتم. ئەو ڕۆژە هیچ کەس نەهات. زۆر کەیف خۆش بووم. ئیتر نەمدەویست چاوم بە چاوی ئەو خەڵکە بکەوێ. ئەم تەنیایی و بێدەنگی‌یەم زۆر پێویست بوو.

وەخت بوو ڕۆژ ئاوا بێ. لە نیزیك پەنجەرەکەوە دانیشتبووم. دیتم ژنێك کە توند خۆی لەچارشێوەکەیەوە پێچابوو بۆ لای من دێ.

ئەمن زۆر بەهاتنی ئەو ژنانە قەڵس بووم. بە تایبەتی لەو کاتەدا بەهیچ جۆر نەمدەویست قسەیان لەگەڵ بکەم. پێش ئەوەی نیزیك بێتەوە گوتم:

ـ خوشکێ! هەر کارێکت هەیە سبەینێ وەرەوە. ئەمڕۆ حاڵم باش نیە.

بەڵام ژنەتیو بەجۆرێك شانی هەڵتەکاندو لە پشتێن بەرەژێری لەرزاند کە تێك چووم.

بەتایبەتی کاتێك درزی چارشێوەکەی کردەوەو لەژێر چار شێوەکەوە چاوم بەڕوخساری "فەدیك" کەوت زارم پڕبوو لەئاو.

"فەدیك چ فەدیك؟ لە جوانی دا لە هەموو دنیادا تای نەبوو. ئەندامی لە هـەموو نەخش و نیگاری دنیا جوانتر بوو. ئەوەندە سفت و لـووس و لـەبار بـوو ئەگـەر دەستت بەسەر کەفەڵی دا هێنابایە سیرە سیرِی بە قەدەر دەنگی زەنگی کلیسا دەرۆیشت.

لەو جل و بەرگی فش و فۆڵی دێهاتی دا دیمەنێکی هەبوو پیاوی شێت و شـەیدا دەکرد. فەدیك خانم یەکێك لە مریدە موخلیسەکانی من بوو. پێنج شەش مـانگ بوو مێردی کردبوو بەڵام منداڵی نـەدەبوو. دووسـێ جـار هاتـە لام و نوشـتوو و دەرمانی وەرگـرت. زۆر عـەیار بـوو، زۆریشـی نـاز پیّدەفرۆشـتم، بـەڵام هـەتا دەهات دەورەم ئەوەندە شـلووق بـوو بـۆم نـەدەکرا دووقسـەی خۆمـاڵیيانـەی لەگەڵ بکەم.

خـوا زەلیلـی کـا. چـاوەکانی دەتگـوت چـاوی ئاسـکی بیابـانن. کاتێـك سـەری دادەخست و بەشەرمەوە باسی نێوان خۆی و مێردەکـەی بـۆ دەکـردم هـۆش و اختیارم لەلا نەدەما.

ئاخر جار بەدزی پێم گوتبوو ئەگەر ئەم نوشـتووانە کاریـان نـەکرد، رۆژێـك لای ئێـوارێ وەرە دوعـات بـۆ لەسـەر ناوکـت دەنووسـم و ئـەمرۆ فـەدیك هـاتبۆوە. هەرچی ویستم لە کۆڵ خۆمی بکەمەوە، دڵم نەهات. گـوتم: "وەختێـك ئەمشـەو هەر دەڕۆم بۆچی ئەم لوقمە چەورو شیرینە لەدەست خۆم دەرکەم؟!".

وەك فەنـەرێك کـە تونـد تونـد خرِیـان کردبێتـەوەو لـە نـەکاو بـەری هەڵـدەن دەرپەریم و گوتم:

ماشەڵڵا. ماشەڵڵا فەدیك خانم. بەخێر هاتی. چاومان رۆشن.

پەردەکـەم لاداو بـانگی فـەدیك خـانمم کـرد کـە وەك کـۆتری نێـو شـێوەردان بەلەنجەولار دەرۆیشت: فەرموو بۆ ژووری.

فەدیك بەوعەیاری و نازونووزی جارانیەوە نەختێك كشایەوەو گوتی:
ــ بمبووره جەنابی شێخ! ئەمن حەدم چیە بێمە خزمەت جەنابت. ئەمن قەرەواشی دەرگاتانم.
زارم وا پڕببو لە ناو دەتگوت قەرتاڵەیەكیان سێوە ترشە لەكن خواردووم. پێكەنینێكی درێژم بۆ كردو چونكە باش نەبوو زۆر لەبەر دەرگا ڕاوەستین وەپێش كەوتم و چوومەوە ژوور. فەدیكیش وەك بەرخی دەستەمۆ بەدوام دا وەژوور كەوت. من لەسەر دۆشەكەكەم دانیشتم و فەدیكیش هەر لەبەر دەرگا هەڵتروشكا. گوتم:
ــ خانمی خانمان فەرموو وەرە پێش.
فەدیك دیسان بەئەدەبەوە گوتی:
ــ لەژێر سێبەری جەنابتان دام.
ــ وەرە پێشتر...
هەروا كە دانیشتبوو لەسەر چۆكان توزێك هاتە پێشەوەو چارشێوەكەی كەوتە بەر ئەژنۆی و لەسەری كەوتەخوار. "ئەیەڕۆ"یەكی بۆ كردو ویستی چارشێوەكەی بەسەری داداتەوە، بەڵام خەراپتر بوو، چارشێوەكەی بەتەواوی لەسەر لاچوو شان و مل و سەرو سنگی وەدەر كەوت.
وا مەست و دەبەنگ ببووم دەتگوت پەیكەرێكی بێگیانت لە پەنا دیوار هەڵپەساردوە. ددانم لە چێرەوە بردبوو و چاوم پێدەرپەڕیبوون و مات و حەیران چاوم بڕیبووە ئەو خوای جوانی و دڵدارییە.
ئەقڵ، شەرەف، ویژدان و هەرچی سیفەتی باشی بنیادەمە لەلای من باریان كردبوو.
بەدەنگێكەوە كە لەبەر تاسەو تامەزرۆیی دەلەرزی گوتم:

ـ چما تۆ مەسوڵمان نی؟

فەدیك خانم زۆر تێك چوو، بەخۆ دا شکایەوە کە چارشێوی لەسەر لاچووەو من ناڕەحەت بووم . پرسیارەکەی منیش ئەم مانایەی دەگەیاند. چاك چاك خۆی داپۆشیەوەو بەشەرمەوە گوتی:

ـ بمبوورە حەزرەتی شێخ. بە دەست خۆم نەبوو. دیسان هەر بەو ڕاوێژەی پێشووەوە گوتم:

ـــ کچێ ئەوە چ ئیسلامەتیەکە. بنیادەم هێندە دڵڕەق دەبێ؟! زۆر بەسەرسوڕمانەوە گوتی:

ـ بۆچی؟

ـ تۆ ئاگرت بەردایە من، سووتاندتم، کردتمە خۆڵەمێش.

پێکەنینێکی ئاشق کوژی کردو گوتی:

ـ چما لە ئیسلامەتی دا دروستە قسەی وا بە ژنی خەڵك بڵێی؟

ـ ئەمە چ قسەیەکە کچێ! تۆ کافری کافر.

بریا زمانم لاڵ بایەو بەم زمانە چەورو شیرینە ئەم ئاگرەم بەسەر خۆم دا نەکردبایە. داد لەدەست هەواو هەوەس کە بنیادەم تووشی چ ڕێگایەك دەکا. ئەوەندەم لەگەڵ ئەو پەرییە ناسك و نازدارە گوت و گوتەوە کە بەخەیاڵی خۆم لە خشتەم برد.

بێخەبەر لەوەی ئەم مارە خۆش خەت و خاڵە لەجێدا بۆ یاری کردنی دەوری خۆی و بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکێکی ترسناك هاتۆتە لای من و ئاغاو فەرماندەی پۆلیس ئەو داوەیان بۆ من ناوەتەوە تا تۆڵەی ئەو شیرینکاریانەم لێ وەرگرنەوە.

بەڕاستی فەدیك دەوری خۆی لە هەموو هونەرمەندانی دنیا باشتر یاری دەکرد. خۆی شەرمێون نیشان دەداو بەنزم کردن و بەرز کردنەوەو گۆڕینی دەنگی خۆی زیاتر منی دەبزواند.

ئاخرەکەی گوتی:

ـ بەڕاستی حەزرەتی شێخ! نازانی لەو ڕۆژەوە هاتوومە خزمەت تۆو چاوم بە سیمای نوورانی تۆ کەوتوە چۆن بۆت شێت و شەیدا بووم؟!

قسەکانی غیرەتیان وەبەر دەنام. قدیلکەم دا، ئەویش قدیلکەی دامەوەو سەرەتای یارییە ترسناکەکە دەست پێ کرا. وەك گورگی برسی کە بەرخێکی بۆ هەڵکەوتبێ توند لە باوەشم گرت.

هەر ئەوەندەم زانی بەقەو لە دەرگایان دا. ئەگەر بەچەکوچ لەسەریان دابام هێندە نەدەترسام.

بەڵام فەدیك خانم وەك ژنێکی خەراپەکار دەستی بە پێکەنین کرد:

ـ ئەیەڕۆ پێوە بووین.

خێرا خۆم کۆ کردەوە:

ـ عەباو پانتۆڵەکەم کوان؟

فەدیك لە خۆشیان هەڵدەپەڕی، تازە تێدەگەیشتم کە چ پەندێکیان پێداوم و چۆن بۆ حەوت پشتیمان تەمبێ کردووم، بەڵام سوودی چ بوو؟ هێشتا پانتۆڵەکەم نەدیبۆوە کە هەردوولای دەرگاکە کرانەوەو تەق وەدیوارەکە کەوتن و ژمارەیەك لە دێهاتییەکان لەگەڵ کوێخا وەژوور کەوتن. ویستم قسە بکەم و بیانوویەك بدۆزمەوە، بەڵام وەزعەکە ئەوەندە قۆڕ بوو کە هیچ کارێك و قسەیەك سوودی نەبوو. تەنانەت مۆڵەتیان نەدام عەباکەم بەسەر لاقم دا دەمەوە.

بەرۆکیان گرتم و بە ڕاکێش ڕاکێش بردیانمەدەر. هەرکەس هەرچی وەدەست کەوتبا لەسەری ڕادەکێشام. هیچ کەس گوێی نەدایە دادو هاوارو پاڕانەوەو لالانەوەی من. یەکێك بە قونداخە تفەنگ، یەکێك بە قایشی پشتێنەکەی، یەکێك بە تەناف لێیان دەدام. سەرم بۆ هەرلایەك وەردەگێرا، یەکێك لەسەری ڕادەکێشام و جنێوێکی تەڕو ئاوداری بۆ حەواڵە دەکردم:

" قوڕمساخ! دوژمنی نامووس! ".

" تف لەو ڕیشەت هەی درۆزنی ڕیاکار! "

بەدبەختی لێرەدا بوو کە نۆکەرەکانی خۆم لە خەڵکەکەی تر خەراپتریان پێ دەکردم. دەتگوت دوژمنی خوێنی خۆیان وەگیر کەوتوە.

لە هەمووی خۆشتر ڕق پێ ڕشتنی کوێخا بوو کە هەر داری لەسەرم رادەکێشاو دەیگوت:

ـ سەگباب! دەتەوێ مڵکەکانی ئاغا دابەش بکەی! بگرە لە دەستم ئەمە یەك. ئەمەدوو. چما میراتی بابت دەبەشیەوە؟

لە مردن بەولاوە چارەم نەبوو. هێندەیان لێ دابووم بێحاڵ بووم و لە هۆش خۆم چووم. لەو حاڵەدا گوێم لێبوو پۆلیسێك گوتی:

ـ بەسە چی دیکەی لێ مەدەن دەمرێ.

لە دڵی خۆم دا گوتم "چەند پیاوێکی باشە".

کە دیتی دێهاتییەکان کۆڵ نادەن نەڕاندی:

ـ فەرماندە ئەمری کردوە بە زیندوویی بۆی بەرم.

من ئیتر بەتەواوی لە هۆش چوو بووم. کاتێك وەهۆش هاتمەوە دیتم بەسەتڵان ئاوم بەسەردا دەکەن. سەرتاپام ببوو بە قوڕ.

پۆلیسەکە فەرمانی دا:

ـ دەستانی ببەستن.

بێ ئینسافانە نەیانهێشت پانتۆڵەکەشم لەپێ کەمەوە. توند هەردوو دەستیان شریت پێچ کردم. پۆلیسەکان لە پێشەوەو دێهاتیەکان لە دواوە بەڕاکێش ڕاکێش بردیانم بۆ مەخفەر.

قوڕاوم لەسەرو چاوان دەچۆڕاو خوێن لەلاق و لەتەران.

خەڵکی لادێ کە هیچ هۆیەکی سەیرانیان نیە، هەروەختێك شتێکی وا ڕوویدا دەست لە کاروکاسبی هەڵدەگرن و دێنە سەیرێ.

لە ڕێگا سێ چوار جار خەڵکەکە شالاوی بۆ دێنام. بەلام دیسان پۆلیسەکان ـ ماڵیان ئاوەدان بێ ـ نەیان دەهێشت کەس دەستم بکاتێ. دەنا هەر لەوێ دەیان کوشتم و گۆڕیان بۆ هەڵدەکەندم.

لەوکاتەدا کە بە دەست بەستراوی و بەدیلی بەرەو چارەنووسی نادیاری خۆم دەڕۆیشتم، بیرم دەکردەوە ئەم خەڵکە بۆ پەلاماری من دەدەن و بۆ دەیانەوێ بمکوژن. ئەمانە کە تا دوێنێ ئەوەندە حورمەتی منیان دەگرت چۆن وا بەجارێك گۆڕان؟

خۆ من خەراپەی ئەوانم نەکردوە، بۆچی بەخوێنی سەرم تینوون؟

ئەو ڕۆژە وەلامی پرسیارەکانم بۆ نەدرایەوە، بەلام دوایە تێگەیشتم.

ئەمانە چەندین ساڵ رەنج دەکێشن. بەبرسیەتی و هەژاری دەژین. چەشنی بیرکردنەوەیان جۆرێکە نازانن هۆی بەدبەختی و هەژاری ئەوان کێیە. گرێیەکیان لە دڵ دا هەیە بەلام نازانن ڕقی خۆیان بەکێ بڕێژن. خۆ ناوێرن قسە بە فەرمانبەرانی دەوڵەت و پۆلیسەکان بڵێن. هەر موویان لێ ببزوێ دەماریان دەردێنن و بەدبەختیان دەکەن. بۆیە وەختێك ڕقیان لەبابایەك هەستا

هەموو بێ ئەوەی خۆشیان بزانن هۆی چیە، بێئەوەی بیر بکەنەوە کابرا تاوانبارە یان نا، دای دەوەرنێ و لێی دەدەن.
لەوانەیە بیشی کوژن. دوایە کە ڕقیان نیشتەوە دەپرسن ئەرێ ئەو کابرایە چ کارە بوو؟
چیرۆکی ئەم خەڵکە وەك داستانی ئەو گورگە برسیانەیە کە لە نێوەڕاستی زستان دا لە نێو بەفرو بۆرا ن دا بێ خۆراك ماونەوە. ئەمانە برسین، ماندوون،خەریکن لەپێ دەکەون، بەڵام هەوڵ دەدەن چاویان ئاوەڵا بێ و لە هەموو کاتێك زیاتر بدرەوشێ. دەزانن هەرچی چاو لێك نێ ئەوانی تر دەیخۆن.
ئەم گورگانە چەندین سەعات لەسەر بەفر بەدەوری یەکتردا کۆزیلکە دەبەستن و چاوەڕوانی ئەوەن یەکێکیان چاو پێکەوەنێ هەتا بە هەمووان تێی ڕۆبێن و لەت و پەتی بکەن. ئەمە قانوونی گورگانە.
هاوڕێیانی ئێمەش بۆ ڕزگاری گیانی خۆیان بە چوار چاوان وریای یەکتر بوون. لە نێو ئەوان دا کەس لەمن بێچارەترو ماندووتر نەبوو.
لەبەردەرگای مەخفەری پۆلیس خەڵکێکی زۆر کۆببۆوە. هەر کە دیتیان بە دەست بەستراوی لێیان وەنیزیك کەوتم شاڵاویان بۆ هێنام و سەروچاویان بە تف سواخ کردم. پێیان وابوو بەوکارە خۆیان ڕزگار دەکەن. ئەگەر پۆلیسەکان لێ گەڕابان، دێهاتییەکان هەر لەوێ لەت وپەتیان دەکردم.
نێوچاوانم شکابوو، خوێنی برینەکەم بەری چاوی تاریك دەکردم. هەردووسێ هەنگاو دەڕۆیشتم و لەبەردێك، دارێك، سندەگڵێك هەڵدەنگووتم.
دووجار کەوتم. بەڵام پۆلیسەکان بەتوورەیی ڕاستیان دەکردمەوە.
ـ هەستە سەگبابی بێناموس.
ـ خۆت مەتۆپێنە باوك سەگ.

بردیانمە ژووری مەخفەر، لەسەر پلیکانێك درێژ بووم ، بێحال بووم و بەری چاوم تاریك بوو.
ئەو پۆلیسەی ئێشکی منی دەکێشا ڕاست بۆوە ئیکلامێکی کێشا. سەرم هەڵێنا لە پێشدا چەکمەیەکی مامزدارم دیت و کە هەوراز ڕوانیم دیتم فەرماندەی پۆلیسە لەپشت سەرم ڕاوەستاوە.
پێم وابوو شاهین چەنگڵ لەو حاڵەدا یارمەتیم دەدا. وەك کابرایەکی تینوو کە گەیشتبێتە سەر کانیاوێکی ساف هاوارم کرد:
ـ فەرماندە رزگارم بکە!
بەڵام ماوەی نەدام، پێلەقەیەکی بە نێوشانم دادا. تێگەیشتم ناتوانم چاوەڕوانی یارمەتیم لەو کۆنە دۆستەشم هەبێ.
فەرماندە دەستووری دا حەپسم بکەن تا دۆسیەکەم تەواو دەبێ. دوو پۆلیس بە ڕاکێش ڕاکێش بردیانمە ژوورێکی تاریك و دەستیان کردمەوەو دەرگایان لەسەر داخستم. لەسەر عەرزی لێی دریژبووم و سەرم وەنێو ئەژنۆی خۆم کرد: "خوایە گیان من چیم کردوە، خەراپەی کێم کردوە؟".
پێم وایە بێهۆش ببووم، نازانم چەندی پێچووبوو کە پۆلیسێك وەژوورکەوت و پێلەقەیەکی بە پشتێ دادام!
ـ ئۆ هۆی!... ئێرە ماڵی پوورت نیە، ڕاست بەوە.
ویستم هەستمەپێ نەمتوانی. پۆلیسەکە قۆڵی گرتم و ڕاستی کردمەوە. هەرچۆنێك بوو لاقم چەقاند. بردمیە ژووری نەقیب شاهێن!
دووبەدووماینەوە. جەنابی نەقیب لە کاتێکدا سمێڵەکانی دەجوین گوتی:
ـ سەگبات وات لێهات تەماح لە نامووسی خەڵك بکەی؟
ـ بەمن دەڵێی.

ـ نا، بەبابم دەڵێم کوڕی سەی! ئێستا حاشا دەکەی؟

ـ تۆبە. استغفرالله فەرماندە! ئەم قسانە چیە!

فەرماندە وا توورە ببوو گوتم هەر ئێستا حیسابم تەواو دەکا. بەڵام بۆمن ئەو قسانە قیمەتیان نەبوو. تازە لە هەموو ئاوان پەڕیبوومەوە. بڕیارم دابوو لە فەرماندە قبوڵ نەکەم و ئەگەر بە قیمەتی گیانیشم تەواو بێ بە گژی دا بچمەوە.

جەنابی نەقیب نەڕاندی:

ـ داواکار بێنن.

فەدیك هاتە ژوور. نازانم لە کوێیان فێر کربوو، وەك بلبل دەستی بە قسە کرد: "جەنابی فەرماندە من بێتاوانم. چووزانم ئەو کابرایە گورگەو لە پێستی مەڕ دایە. گوتی دوعات دەدەمێ منداڵت ببێ".

فەدیك قسەکەی پچڕی و فرمێسك وەك بارانەی بەهارێ لەچاوی هەڵڕژان.

ئەوەندە تەبیعی قسەی دەکردو دەگریا کەمنیش بەزەییم پێدا هات و کەوتمە گومانەوە: "نەکا بەڕاستی تەعەدام لێکردبێ و بۆخۆم نەزانم". لە لایەکی تریشەوە ئێرەییم پێ دەبرد: "هێندێك کەس چۆن دەتوانن هێندە جوان ڕۆڵی خۆیان یاری بکەن!"

لە دەنگی فەدیك سێ چوار مل ئەستوور لێم وەژوور کەوتن. گۆیا براو کەس و کاری فەدیك بوون.

یەکێکیان پەیاغێکی بە دەستەوەبوو شاڵاوی بۆ هێنام. ئەگەر پۆلیسەکان پێشیان پێ نەگرتبایە مێشکی سەری دەپرژاندم.

یەکێکی تر کە مووی ڕەشی بە قالبیەوە نەمابوو و پشتی وەك کۆچان داهاتبۆوە نەڕاندی:

ــ ئـەم شـەیتانی رەجیمـە لەگـەڵ قـانوونی جمهـوری موخالیفـەو جنێـوی بـە سەرکۆمار داوە. لەو تۆمەتەی کابرا وا ڕاچەنیم هێندەی نەمابوو دیق بکەم:
"دەبڕۆ ئەمەی چاك بکە، جوابی ئەم تۆمەتە چ بدەمەوە؟"
تفم لەزاری دا وشك ببوو، وەك مەحکووم بە ئیعدامێك کە چاوەڕێ بێ ها ئێستا ها سەعاتێکی دیکە ملی بەپەت دا بکەن لە جێگای خۆم وشك ببووم. بەو پێیـە ئـیتر جێگـای قسـەو دیفـاع نـەمابوو. بەتایبـەتی کاتێـك چـوار پێـنج کـەس لـە دێهاتیەکان شایەتی‌یان دا کە لە دژی قانوونی جمهوری قسەم بۆ کـردوون ئـیتر سەرینی ناهومێدیم وەبن سەرم دا.
دۆسـیبەیەکی تونـدیان بـۆ رێـك خسـتم و بـە چـەند تـاوانی وەك جنێـودان بەسەرکۆمار، دەستدریژی بۆ نامووسی خەڵك، هاندانی خەڵکی لادێ بۆ شـۆڕش و موخالەفەتی قانونی دابەشکردنی زەوی و زار جوان و قـازاخ دەسـت و پێیـان لەخەنە گرتم.
دێهـاتی‌یـەکان لـە خـوارەوەی قسـەکانیان پەنجـەمۆریان کـردو مۆریـان لێـداو چوونەدەر.
کاتێك من و فەرماندە تەنیا ماینەوە وەزعەکە گۆڕا. مـن کـە ئیـزرائیلم لـە ژوور سەری خۆمەوە دەدی، وەك دەڵـێن "پـاش ڕووت کردنـێ تەشـتی تـەڵا لەسـەر سەرت دانێ" پێم داداو بەدەنگێکی توند و بێ پەروا گوتم:
ــ چاو لە من کە شاهێن.
جەنابی نەقیب! لەو قسەیەی من واقی وڕماو نەڕاندی:
ــ هۆپ!! دیسان زمانت کرایەوە!...
لەسەرخۆ، بێئەوەی هیچ تێك چم گوتم:

ـ ئەگەر دەتەوێ بمترسێنی خەیاڵت خاوە. هەرچی لە دەستت دێ تەخسیری مەکە. تۆ دەزانی من فەرید پەتاتەم و منیش دەزانم تۆ شاهین چەنگڵی. هەردووکمان یەکتر باش دەناسین. ئیتر ڕاسان پسانی ناوێ. ئێمە ڕابردووی یەکتر باش دەزانین. خۆ هەرچی لە دەستت هات لەگەڵت کردم، چاوەڕوانی یارمەتیشم لێت نیە.

تەنیا پێم خۆشە بزانم بۆچی ئەو پەندەت بەسەر هێنام! من چ خەراپەیەکی تۆم کردبوو کە ئەم بەڵایەت بەسەر هێنام!

بە قسەکانی من کۆڵە گرووی دە ئەوکی ما. هێندەی نەمابوو لە بانگی گریانێ بدا. بە دەنگێکی خەماوییەوە گوتی:

ـ بۆخۆت دەزانی منیش زۆرم تۆ خۆش دەوێ.

ـ ئەگەر خۆشت دەوێم ئەم کەڵەکبازییانە چین. تۆ باوەڕ دەکەی موخالیفی قانوونی وڵات بم؟!

ـ نا باوەڕ ناکەم.

ـ ئەی چی؟ بۆچی؟

شاهین قسەکەمی بڕی:

ـ چارەم نیە. زۆرم پەرۆشی تۆیە، بەڵام حیسابی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەنجامدانی ئەرکی ڕەسمی لێك جیایە. لەوەبەولاوە نەمدەتوانی هیچ بکەم. دۆسیەی تۆ لەمێژە گەیشتۆتە دەستی من.

هەر ڕۆژی هەوەڵێش تۆم ناسیەوە، ئەمر کرابوو بتگرم، بەڵام بۆخۆم پێم خۆش نەبوو تووشی کێشەت بکەم:

ـ باشە ئەم یارییە چی بوو پێت کردم، مەگەر من دەمەویست ببمە شێخ؟

ـ کاکەگیان! ئەمانە سیاسەتی دەوڵەتن. قازانجی وڵاتەکەمان پێویستی بەم جۆرە شتانە هەیە، هەق نەبوو من ئەم شتانە بە تۆبڵێم، بەڵام باوەڕم بە پاکی و ڕاستی تۆ هەیە کە ئەم قسانەت بۆدەکەم. دەزانم بۆ کەسیان ناگێڕیەوە بۆیە پێت دەڵێم. ئەو وەخت شێخێکمان پێویست بوو. کاتێك ئاغا تۆی پێشنیار کردو زانیم لە کۆنە دۆستانی خۆمی موافەقەتم کرد. تەنانەت بورهانیش تۆی ناسیەوەو گوتی "باشە" بەڵام تۆ نەدەبوو فێڵ لە ئێمە بکەی.

ـ ئەمن چ فێڵێکم لێ کردوون؟

ـ ئەی دەتویست چی دیکە بکەی؟ تۆ بورهانت ماڵ وێران کرد. بەدبەختە کۆڵێکی پارە خەرج کردبوو هەتا توانیبووی سەرەوە ڕازی بکا. تۆش لە هیچ و خۆڕایی هەموو ڕەنجەکەت بە ئاودا دا. تازە لەم ناوچەیە کەس دەنگی بۆ نادا.

ماڵی منیشت خەراپ کرد.

فەرماندە دەقیقە دەقیقە تووڕەتر دەبوو...

ـ بۆچی بە دێهاتی‌یەکانت گوت "زەویتان دەدەینێ... دێهات تان بەسەردا دابەش دەکەین؟".

ـ چما قسەیەکی خەراپم کردوە؟

ـ بەڕاستی پێم وانەبوو هێندە گەوجی... ئاخر دەتەویست ماڵی کێیان بدەیەی؟

ـ ئاغا بۆ خۆی گوتی "ئامادەم ملکەکانم دابەش بکەم" ئەو گوتی "دەوڵەت دەیەوێ زەوی دابەش بکا"؟

ـ سەگی سەگباب! ئاغا پێی وابوو تۆ پیاوی، نیازی دڵی خۆی بە تۆ گوت. دیارە ئەو قازانجیەتی دێیەکانی بفرۆشی و بچێ لە ئورووپا بە پارەکەیان کەیفێ بکا. بەڵام بەو ساکاریەش نا. تۆ نەدەبوو قسەکانی ئەو بدرکێنی.

لە قسەکانی جەنابی نەقیب شێت و شەیدا ببووم. سەرم لەو کارە دەرنەدەچوو. پرسیم:

باشـە ئـەو ڕۆژنامانـە چـیە هـەموو ڕۆژێ لاپـەڕەی هـەوەڵیان بـەم قسـانە پـڕ دەکەنەوە؟

ـ باسی ڕۆژنامەکانم بۆ مەکە... کەیفی خۆیانـە چ دەنووسـن. لـەم دنیایـەدا هـەر کەسە لە ڕێگایەکەوە دەژی. ڕۆژنامەنووسیش کاریان ئەوەیە کێچێك بکەنە گایەك. بـیرورِا دەربـڕین ئـازادە، دیموکراسـیش هـەر مانـای ئەمەیـە. یـەك دەڵـێ زەوی دابەشـکردن باشـە، یـەك دەڵـێ خەراپـە. ئەمانـە هیچـیان کاریـان بەسـەر کـاری دەوڵەتەوە نیە.

کوڕی چاك! تۆ لە قوتابخانە پیاوێکی تێگەیشتوو بووی. ئێستا بۆچی وا مێشکت وشك بۆتەوە؟ من پـێم سـەیرە بـەم ئەقڵـە ناقیسـەوە خـەڵکت بـۆ فریـو دەدرێ. ئەسڵەن چۆن ئەم هەموو کارە سـەیرو سـەمەرانەت کـردوەو بوویـە کەڵـەکبازێکی بەنێوبانگ؟!!

وردە وردە خەریك بوو شتم بۆ ڕوون دەبۆوە. ئێستا تێدەگەیشتم بۆچی کاتێك بە دێهاتیەکانم دەگوت "ئەگەر دەنگ بۆ فلانەکەس بدەن، زەویتان بەسەردا دابـەش دەکەن" خێسەیان لـێ دەکـردم. ئـەوان هـەموو شـتێکیان لـەمن باشـتر دەزانـی. سەرم ڕاوەشاندو گوتم:

ـ بەراستی سەیرە.

ـ بەڵێ. پێت وایە پیاو هەروا بە هاسانی دەبێتە فەرماندەی پۆلیس؟ دەزانی مـن لێرە چەندەم گیروگرفت بە ئەستۆوەیە؟

لێم پرسی:

ـ ئێستا تەگبیری من چیە؟

ـ ئـەتۆ هـیچ ڕێگـای ڕزگاربوونـت نیـە، بـۆ خـۆت مـاڵوێران بـووی هـیچ، منیشـت بەدبەخت کرد.

لەوکاتەدا لە دەرگایان دا.

نەقیب کە زۆر خۆمانە بەرامبەرم دانیشتبوو دەردی دڵی بۆ دەکردم، دەرپەڕی، قایش پشتێنەکەی ڕاست کردو تێی ڕاخوڕیم:

ـ هەستە پێ. برادەرایەتی شتێکەو ئەرکی دەوڵەت شتێکی تر.

منیش هەستامە سەر پێ. جەنابی نەقیب زۆر توندو جیددی بە کابرای پشت دەرگای گوت:

"وەرە ژوور".

پۆلیسێك وەژوور کەوت:

ـ قوربان دۆسیەکە ئامادەیە.

نەقیب دەسبەجێ فەرمانی دا خۆم ساز بکەم.

ئەم فەرمانە وەك حوکمی ئیعدامی من وابوو. چونکە زۆریان سەنگ و سووکی لەگەڵ کردبام حەپسی تا مردن یان لانیکەم پازدە ساڵی بە نێوچاوانەوە بوو.

بۆیە بیرم کردەوە ڕابکەم. بەڵام بەچ فێڵێك دەمتوانی لە دەست ئەم پۆلیسانە دەرباز بم؟ بۆ خۆشم نەمدەزانی.

لەنەکاو فکرێك وەك بروسکە بە مێشکم دا تێپەڕی.

سوێندێ دەخۆم یەکەم جار بوو بە ئەنقەست بڕیارم دا کارێکی بێ قانوونی بکەم. چارەم نەبوو. بۆ پاراستنی گیانی خۆم ناچار بووم بە قیمەتی گیانی خەڵکی تریش بێ خۆم وەپەڕێنم.

گوتم:

ـ جەنابی نەقیب هیچ نەبێ ڕێگام بدە سەرێکی ماڵەکەم بدەمەوەو جلك و شتوومەکی پێویستی خۆم هەڵبگرم.

نەقیب زۆر وشك و بەڕاستی گوتی "نابێ".

بەم وشە کورتە تەواوی نەخشەکانم خەریك بوو هەڵوەشێتەوە. ئەگەر توانیبام خۆم بگەیەنمەوە ژوورەکەم، سەدی سەد دەمتوانی هۆی ڕزگاربوونی خۆم پێك

بێنم. بەڵام بە بیستنی ئەم وشەیە هەناسەیەکی ساردم هەڵکێشاو بەڕاستی زەندەقم چوو. کەوتمە پاڕانەوە:

ـ قوربان تکات لێ دەکەم ڕێگا بدە بەسەرپێوە تا ماڵێ بچم و بێمەوە.

فەرماندە دیسان زۆر بە توڕەیی گوتی "نابێ"

ـ بۆچی نابێ؟!!

دەنگی نزم کردەوەو گوتی:

ـ ئاخر باوک سەگ دێهاتی‌یەکان لەت و پەتت دەکەن.

پێکەنیم و گوتم:

ـ ئەگەر مەسەلە وابێ دێهاتیەکان شاڵاوم بۆ بێنن ئەو وەختەی بۆ شاریش بەڕێ دەکرێم مشوورم دەخۆن.

ـ لێرە فەرمانبەرمان زۆرە. هەتا سەرجادە پێنج شەش کەست لەگەڵ دەنێرم.

ـ باشە. ئێستاش وا بکە.

نەقیب نەختێك بێدەنگ بوو بیری دەکردەوە. منیش کە مردن و ژینی خۆم لەو تۆزە بێدەنگ بوونەدا دەدەی بە دەنگێکی کزەڵۆکەوە گوتم:

ـ تکات لێدەکەم لەبەر خاتری دۆستایەتی ئەوەندەم بەقسە بکە. ئەمن جلکم نیە. پارەم نیە. بۆ خۆشت دەزانی دەبێ بچمە بەندیخانە.

بەزەیی پێمدا هاتەوەو گوتی:

ـ زۆر باشە. هەستە بۆ خۆم لەگەڵت دێم.

بەندی جەرگ و دڵانم پسا. "توخوا تەماشا پاش ئەو هەموو پاڕانەوە ئێستا کە ڕازی بووە بچم بۆ خۆی لەگەڵم دێ. بەو جۆرە هەموو نەخشەکانم لێ تێك دەچێ" دەمتوانی بە پۆلیسەکان بڵێم لەدەرەوە بوەستن. بەڵام نەقیب بەو هەموو ڕابردووە کۆنەوە کە لەگەڵ منی هەبوو هەرگیز لێم جیا نەدەبۆوە. بەهەرحاڵ چارە نەبوو. لەگەڵ فەرماندەو سێ پۆلیس بەرەو ماڵەکەی من کەوتینەڕێ.

ژمارەیەك لە دێهاتیەکان لەبەر دەمی مەخفەرەکەدا دەستیان کرد بە هەراو هوریاو خۆپیشاندان، چەند کەسێکیشیان شالاویان بۆ هێنام، بەلام فەرماندە چاوێکی لە پۆلیسەکان داگرت و بوو بە خرەخری چەخماخان.

دێهاتی‌یەکان کە گوێیان لە دەنگی چەخماخ بوو دوولاقیان هەبوو دووشیان بۆ قەرز کردو وەك جندی بیسمیل کراو لەبەرچاو ون بوون.

لە رێگـادا هیچمان قسەکەمان لەگەڵ یەکتر نەدەکرد.

جەنابی نەقیب لەپێشەوە دەڕۆیشت. منیش بەدوای ئەوداو پۆلیسەکانیش تفەنگیان لە گولمە گرتبوو و لە دوای منەوە دەڕۆیشتن نەوەکا رابکەم.

لە دوور کە چاوم بە ماڵەکەم کەوت واقم ورما، تەواوی دەرگاو پەنجەرەکانیان شکاندبوو. خانەقایەك کە تا چەند سەعات لەمەوبەر زیارەتگای خەڵکی ئەم ناوە بوو دیمەنی وێرانەی شارەکانی دوای شەڕی وەبیر دەهێنایەوە. پێکەنین گرتمی و بێ ئیختیار کەوتمە بیری دیکتاتۆرەکان و حکومەتە بێ پشت و پەناکانیان. هەر ئەوانەی تا چەند سەعات پێش ئێستا سوژدەیان بۆ دەبردم تەنانەت دارو درەختی دەوروبەری خانووەکەشمیان تێك شکاندبوون. دڵنیا بووم کە بەو پێیە پارەو رایەخ و شتومەکیش نەماوە.

ئەمانە هەموو چش! لەدڵی خۆم دا هەردوعام دەکرد ئەو شتەی دەیتوانی ڕزگارم بکا لەجێی خۆی مابێ و تالانچیەکان دەستیان وێرانەکەیشتبێ.

نەقیب پۆلیسەکانی لە دەرێ دانا تا ئاگایان لە دەوروبەر بێ و بۆ خۆشی لەگەڵ من هاتە ژوور.

هەموو شتێك لەبەرێك هەڵتەکابوو. تەنانەت پەردە پەنجەرەکانیشیان بۆ موتفەرك!! لەت لەت کردبوو و بردبوویان. پارەکەو ئەو شتە قیمەتیە کە پێم وابوو گیانی من دەکڕێتەوە لە سندووقێکی پۆلادا بوون. خواو ڕاستان ئەویان پێ نەچووبوو. کلیلەکەشی لە گیرفانی خۆم دا بوو. سندووقەکەم کردەوە، پارەکانم

لە پێش چاوی فەرماندە هێنا دەرێ و بۆ ئەوەی زیاتر باوەڕم پێ بکاو سەرنجی بۆ لایەکی دیکە ڕابکێشم لە پێشم ڕاگرت:

ـ کەم و زۆر لەنێوێ دا بەشی دەکەین.

پارەکە یەکجار زۆر بوو. بۆ ئەوە دەبوو شەرم و شکۆ وەلا بنێ، بەڵام زۆر پیاوانە سەری ڕاوەشاند:

ـ نامەوێ. بۆ خۆت پێویستیت بەپارە زیاترە. ئەو پارە دەتوانێ نەجاتت بدا.

زۆرم پێ خۆش بوو کە پارەکەی وەرنەگرت. ڕاستیشی دەکرد، ئەو پارە زۆر شتی پێ دەکرا.

تەنانەت بە سێیەکێکی دەمتوانی پۆلیسەکان ڕازی کەم و بۆی دەرچم.

چەند پارچە تنۆکەو شاڵوارێکی پینەکراو لە قوژبنێکی ژوورەکە کەوتبوون. بۆ ئەوەی فەرماندە دەقیقەیەك بچێتە دەرو نەخشەکەم جێبەجێ بکەم تنۆکەیەکم بەدەستەوە گرت و بە پێکەنینەوە گوتم:

ـ دەکرێ دەقیقەیەك بچیەدەر تا تنۆکەکەم دەگۆڕم؟

نەقیب پێکەنی:

ـ مەیکە قوماربازی. ئەو وەختی منداڵ بووی چەند جارم ئەم دیو ئەو دیوی دیتوە.

پێکەنینەکەی خەماوی بوو، منیش پێکەنیم. ئەو ڕۆژەم وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ ئەم جەنابە زۆرانێمان دەگرت و کوڕەکان تنۆکەکەمیان دادەکێشا.

نەقیب تێگەیشت بیر لە چ دەکەمەوە، پرسی:

ـ لە بیرتە؟

سەرم ڕاوەشاند:

ـ بەڵێ، بەڵام ئێستا گەورە بووین، ئەو کارانە جوان نین.

ڕووی کردە ئەولاو گوتی:

ـ ها، ئەوە ڕووم وەرگێڕا ئەمەش خاتری تۆ، زووبە.

هەر ئەو دەرفەتە بەس بوو. خێرا پرێسکەیەك کە لە سووچێکی سندووقەکەدا بوو هەڵمگرت و قایمم کرد. پاشانیش تنۆکەکەم گۆڕی و گوتم:

ـ تەواو بـوو.

کاتێك گەیشتینە مەخفەر نەقیب پێش هەموو شتێك گوتی: پارەکەتم وێ بدە.

یەقێکم هاتەوەبەر. چونکە سێ پۆلیسیش لە ژوورێ بوون.

تـێ گەیشـتم مەسـەلە بـەرتیل و شـیرینی نیـە، دیـارە نەخشـەیەکی گرنگـی بـە دەستەوەیە. نەختێك ڕاوەستام، بەڵام فەرماندە بە توندی گوتی:

ـ ماتڵم مەکە، ئەگینا دەڵێم باخەڵیشت بپشکنن.

دیتم کارەکەم پیسـتر دەبـێ ئەگـەر پۆلیسـەکان بمپشـکنن پرێسـکەی گۆڕینیش دەدۆزنەوە.

دەسبەجێ پرێسکەی پارەکەم لەسەر مێزەکە دانا. جـەنابی نـەقیب فـەرمانی بـە پۆلیسەکان دا:

ـ بیژمێرن بزانن چەندە؟

پارەکە درشت بوو، زوو لە بژاردنی بوونەوە. سەدو چل و یەك هەزارو چـوار سـەد لیرە بوو.

فەرماندە گوتی:

چوار سەد لیرەکەی بدەنەوەو سەدو چل و یەك هەزار لیرەش ڕەوانەی سـندووقی مەحکەمەی ئەستەمبووڵ دەکەم.

دەسبەجێش وەسڵی پارەکەی نووسی و دایە دەستم.

دیتم کارەکەم زۆر قوڕ بووە گوتم:

ـ بـەگم مـەردی خـوا بـە تووشـی ئـەم گێرەوکێشـەیەم مەکـە. سـندووقی سـەری منداڵەکانت نارەحەتم مەکە.

نەقیب بە پۆلیسەکانی گوت بچنە دەرێ تا خۆم بانگتان دەکەم".
پۆلیسەکان پێکەنینێکی بەمانایان بۆ کردو وەدەرکەوتن.
نەقیب بە پێکەنینی پۆلیسەکان زۆر ناڕەحەت بوو. داخی دڵی خۆی بەمن ڕشت:
ـ ئاخر بێچووەسەگ ئەمن تۆ باش دەناسم. تۆ بەو پارە دەتوانی سەد پۆلیس ڕازی بکەی. چۆن ڕێگا بدەم ئەو پارەیە لەلای خۆت بێ؟!
ئافەرین بۆ مێشکی خۆم کە وەك مەکینەی ئەلەکترۆنی بەکەمتر لەیەك سانیە ڕێگای چارەسەری گیروگرفتەکان دەدۆزێتەوە.
گوتم:
ـ جەنابی نەقیب زۆر هاسانە. پارەکە بدە بە پۆلیسەکان لەوێ بمدەنەوە.
لەقاقای پێکەنینی دا "پیاوی ئاقڵ! بەزی بەکتکی بسپێرم؟".
ـ ئەی تەگبیر چیە؟
ـ هیچ. بەبانك دا بۆت دەنێرم.
گوتم:
ـ جەنابی نەقیب بیدە بە پۆلیسەکان. با لە ئەستەمبووڵ بیدەن بە سندووقی بەندیخانە. ئەگینا پارەکەم دەچێ و وەدەستم ناکەوێتەوە.
جەنابی نەقیب دەیەویست ئیسباتی بکاك هیچ نابێ و منی ماڵ وێرانیش بە هەزار سوێندو قورعان دەمەویست ئیسباتی بکەم کە قسەی منە.
بریا زمانم لاڵ بوایەو هێندەی لەسەر نەڕۆیشتبام. ڕاستە کە دەڵێن"ئەگەر زمان لێگەڕێ سەر ئاسوودەیە". هێندەم کێشە کرد فەرماندە گوتی:
ـ تەنیا ڕێگایەك هەیە.
ـ ها؟ چ ڕێگایەك؟
ـ بۆ خۆم لەگەڵت دێم و لەوێ پارەکەت تەسلیم دەکەم .

ئەگەر کوتکی ئاسنیان لە سەرم دابا وا گێژ نەدەبووم "ئەی داد و هاوار هەموو نەخشەکانم لێ تێک چوون". بۆ پۆلیسەکان نەخشەیەکی باشم کێشابوو، سەدیسەد سەردەکەوتم. پێتان وا نەبێ دەمەویست بەپارە فریویان بدەم؟

نا. ئەم ڕێگایە سەدی سەد ڕاست نیە. لەنێو پۆلیسیش دا پیاوی ڕاست و بەرتیل نەخۆر زۆر هەیە. نەخشەکەی من زۆ لەمانە باشتر داڕێژابوو، بەڵام بەداخەوە !

هەموو کارەکان تەواو بوون. فەرماندە پارەکەی خستە جانتایەکی چکۆلەوەو بەدەستیەوە گرت و لەگەڵ دوو پۆلیسی مل ئەستوور کەوتینە ڕێ. لەڕێگا هیچ تاقەتی قسەکردنم نەبوو. ڕێگای ڕزگاری لەم داوە بەتەواوی بەسترابوو، لە ڕێگای بەندیخانە بەولاوە ڕۆژنەیەکم بەرچاو نەدەکەوت. ئەویش بەندیخانەیەک کە لانی کەم دەبوو ١٥ ساڵ ئاوی ساردی لێ بخۆمەوە.

جەنابی نەقیب لە پێشەوەی جیپەکە سوار ببوو، من و پۆلیسەکانیش لە پشتەوە کز دامابووین.

هیچمان قسەمان نەدەکرد. هەموو سەرمان بردبووە قەپێلکی خۆمانەوە. نیزیک نیوەڕۆ گەیشتینە بەردەمی چاخانەیەک. بەهەر نرخێک بوایە دەبوو لێرە بەرنامەکەم جێبەجێ بکەم. ئەم دەرفەتەم لەکیس چووبایە فەرماندە یەکسەر دەی بردمە دەرکی بەندیخانەو تەسلیمی دەکردم.

کاتێک لەجیپەکە دابەزین گوتم:

ـ ببوورە جەنابی نەقیب، ڕێگا دەدەی بچمە ئاودەستخانە. دەمزانی بۆ کاری وا ناچارە ئیزنم بدا. گوتی باشە برۆ.

چوومە ژووری ئاودەستەکە دەرگاکەم توند داخست. ترسی ئەوەم بوو کە لەکەلێنی دەرگاوە سەیرم بکەن خێرا ئەو پریسکەی لە پزووی شاڵوارەکەم دا قایم کردبوو و پڕبوو لە بەنگی خالیس دەرم هێنا.

ئەم بەنگە هەمان دەروێشی ئێشکچیم بۆی دەهێنام و جارجارە دووکەڵێکم ساز دەکرد. ئێستا دەبوو لەم کاتە ناسکەدا بەفریام کەوێ و لەم داوەم ڕزگار بکا. لە پشت دەرگای ئاوەدەستەکە دانیشتم، چەند جگەرەیەکم دەرهێناو بە پەلەپەل نیوەی توتنەکەیانم ڕژکردو هێندێك بەنگم تێکردن و نەختێکم توتن دەسەر کردنەوە.

خەریك بووم سێهەم جگەرە دروست بکەم کە پۆلیسەکە لە دەرگای دا:

ـ چیە هەتا کەنگێ؟

ـ ئەوە هاتم.

ـ دەستەکانم وەك تووله بی دەلەرزین. چارەنووسیشم بەو کارەوە بەسترابوو. ئاخرەکەی جگەرەکانم تەواو کردو بەنگ و جگەرەکانی ترم کردە ئاودەستخانەکە. جگەرە خۆشەویستەکانم لە قوتووەکە هاویشتەوەو هاتمەدەر.

فەرماندە کەیفی گاڵتەی بزووتبوو، دەستی کرد بە تانووت لێدانم. لەگەڵ ئەوەی لە پاڵ خۆم دا زۆر نیگەران بووم، بەڵام پێکەنینێکم هەر بۆدەکرد. بۆ نیوەڕۆ داوای مریشکی سوورەوەکراویان کردبوو. بەخەیاڵی خۆیان دەیانەویست بەپارەی من لێی ڕاکێشن.

گوتم:

ـ فەرماندە ئیزن بدە دوا ئارەقیش پێکەوە بخۆینەوە.

قبووڵی نەکرد. زۆر ناڕەحەت بووم چونکە ئەگەر خواردبایانەوە کاری من هاسانتر دەبوو. چاوم لە پۆلیسەکان داگرت ئەوان زۆریان پێ خۆش بوو بەڵام لە ترسی جەنابی نەقیب نەیان دەوێرا.

دووبارە تکام لێ کردەوە:

ـ بۆ خۆت دەزانی لە بەندیخانە باسی ئەم شتانە نیە. لێمان گەڕێ با نەختێك گەروومان تەڕ کەینەوە.

گوتی:

ـ باشە بەڵام بەو مەرجە کەم بخۆنەوە.

ـ بەسەرچاو، هەر دووسێ ئیستیکان. چایچیەکەش لەوەی موشتەری قەڵەوی بۆ پەیدا بووە زۆر کەیفی ساز بوو. پاش نان خواردن جگەرەکانم وێدان، فەرماندە نەیەویست:

ـ حەز لە جگەرە ناکەم.

ـ دڵم داخورپا. هەموو نەخشەکانم خەریك بوو تێك بچنەوە. تکام لێ کرد:

ـ پاش خواردنەوە جگەرەیەك زۆر باشە.

بە نابەدڵی جگەرەکەی هەڵگرت و وەپۆلیسەکانیشم داو بۆ خۆشم جگەرەیەکی ساغم داگیرساند.

کاتێك سێ چوار مژیان لێدان، زانیم کاریان تەواوە. دڵم ئۆقرەی گرت .

کەوتنە چۆرت لێدان و چاویان لێڵ و پێڵ بوون. بانگی چایچیم کرد سەد لیرەییەکم وێ دا:

ـ وەرە کاکە ئەمە وەرگرەو باقیەکەشی بۆ خۆت. چایچی لە خۆشیان چاوی ببوونە چوار. قووتووە جگەرەکەشم بۆ ڕاگرت:

ـ جگەرەیەکیش بکێشە.

ئەویش جگەرەکەی داگیرساند. هێندەم قسە لەگەڵ کرد هەتا جگەرەکەی تەواو بوو.

جانتایەکەم هەڵگرت و سویچی جێبەکەم لە گیرفانی شۆفێرەکە دەرهێناو بەسپایی لە چاخانە وەدەرکەوتم. دەمزانی ئەگەر بەرەو ئەستەمبووڵ بڕۆم دەگیرێم.

بڕیارم دا بەرەودوا بگەڕێمەوە، بەڵام چونکە شوێنی گەڕانەوەکەم دیار دەبوو، نەختێك چوومە پێش و پاشان لەسەر جادەی قیر گەڕامەوە بەرەو ئەو شوێنەی لێیەوە هاتبووم پێم پێوەنا.

دە پازدە کیلۆمیتر بەولاوەتر لەسەر هەڵدێرێك ڕامگرت، پاڵێکم بە ئۆتومبیلەکەوە نا خستمە خوارەوەو بۆ خۆشم بە جانتا خۆشەویستەکەمەوە چوومە نێو لێرەواری تەنیشت جادەکە.

لێرەوارێکی چڕو پڕبوو. سەد وشتری بە بارەوەت تێدا شاردبایەوە کەس نەیدەتوانی بیان دۆزێتەوە.

ئەو شەوە تا بەیانی لە سەر دارێك ڕامبوارد. بەیانیش تا لای نیوەڕۆ هەر لەوێ مامەوە. ئیتر ماندوویەتی و ناڕەحەتی ناچاری کردم بێمە خوار.

بەڵام زۆر دەترسام. لە هەمووی خەراپتر ئەو ڕیشە پان و پۆڕەم بوو. دەبوو هەرچی زووتر ڕیشم بتاشم و دەستێك چاکەت و شاڵوار پەیدا بکەم. ئەگینا هەر کەس بەو ڕیش و سمێڵەوە چاوی پێم کەوتبا دەیناسمەوەو کار لەکار دەترازا.

لە نێو دارستانەکەدا ماڵێکی بچووکی جووتیاریم دیتەوە... لە پەنجەرەوە سەیرم کرد دیتم کەسی لێ نیە.

بۆ یەکەم جار لە ژیانم دا بڕیارم دا دزی بکەم. چ بکەم؟ لەوە زیاتر چارەم نەبوو. ئەمانە هەموو یاری چارەنووس بوون. منێك کە ئەوەندە لە دزی و کاری خەراپ بێزار بووم تووشی ئەو ڕۆژە ببووم.

چوومە ژوورێ، دەستێك چاکەت و شاڵواری لادێییانەو کۆنە مووسێکی ژیلیت و مەکینەیەکی لێوکەتم هەڵگرت، بەڵام هەرچەندی گەڕام ئاوێنەم نەدۆزیەوە.

جلەکانم گۆڕی و سەر لەنوێ چوومەوە نێو دارستان. لەسەر جۆگە ئاوێك دانیشتم بەهەر کوێرەوەرییەك بوو دەستم کرد بە ڕیش تاشین.

ئەگەر گایەکم بەو کۆنەمووسە سەر بڕیبایە لەو ڕیش تاشینە هاسانتر بوو. هەتا ماوم ئێش و ئازاری ئەو ڕیش تاشینەم لە بیرناچێ. دەتگوت گاجووتت سەر بڕیوە، هەموو گیانم ببووە خوێن.

کاتێك "ڕیش تاشین"ەکە تەواو بوو برسیایەتی تینی بۆهێنام. تا ئەودەم ئەوەندە نارەحەت بووم برسیەتیم لەبیر چووبۆوە. بەڵام ئەمجارە لە برسان ئارامم لێ هەڵگیرابوو.

کاتێك دنیا تاریك بوو کەوتمەڕێ. هەرچەند دەترسام پۆلیسەکان لەو نزیکانە بن بەڵام لەوە زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا.

پاش ئەوەی چەند سەعات بە پێ ڕۆیشتم لە دوور شۆقی چرای ئوتومبیلەکانم لەسەر جادە بەدی کرد.

کاتێك گەیشتمە سەرجادە بۆم نەچۆوە سەریەك لە کوێم و دەبێ بەرەو کوێ بڕۆم: "نەکا قسەیەکی غەڵەت بکەم و شۆفێرەکان لێم وەشك کەون!".

ماوەیەك تەماشای ئەستێرەکانم کرد بەڵکوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای خۆم بدۆزمەوە، بێسوود بوو. لۆرییەك لە دوورەوە پەیدابوو، دەستم بۆ هەڵێنا. کاتێك ڕایگرت گوتم:

ـ برادەر! ئەو چەند کیلومیترە بە چەندم سوار دەکەی؟

ـ شۆفێرەکە بە مۆنی و خەواڵوویی وەڵامی دامەوە:

ـ سەرکەوە منیش لە هاودەنگێك دەگەڕێم.

سوار بووم. شۆفێرەکە تەنیا بوو. پاش بە خێراتن و چاك و خۆشی پرسی:

ـ بۆ کوێ دەچی؟

ـ لەو دێیانەی خوارەوە کارم هەیە. کابرا نەختێك پێکەنی و گوتی:

ـ لێرە دێهاتمان لەسەر ڕێ نیە. تا "ئەرزنجان"هەمووی لێرەوارو چیاو چۆڵە.

دیتم هەڵەیەکی خەراپم کردەوەو کابرا بەرەو هێلانەی ژەنگەسوورەم دەباو بێگومان پۆلیسەکانیش لەسەر جادە ئێشك دەکێشن. گوتم:

ـ کاکە! من بە هەڵە چووم... زۆر ببوورە. بێزەحمەت ڕای گرە من دادەبەزم.

شۆفێر ڕایگرت و بە دەنگێکی زل و بە ماناوە گوتی:

ـ چما مندالّی بە مالّی نازانیەوە؟

جوابێکم نەبوو بیدەمەوە. پێکەنیم و گوتم "ببوورە" دەرگام کردەوەو خۆم فـڕێ دا.

ئێستا دەمزانی ڕێگاکەم بەرەو کام لایە، بەلاّم نەچوومە پێش هەر لە قەراخ جادە لە نێو دارستان دا ڕاوەستام.

بێدەنگی لێرەوارو دەنگی سەیرو سەمەرە کە لە دوورەوە دەهاتن ترس وخۆفێکی سەیریان بۆ پەیدا کردبووم.

ئەم دەزانی تەگبیرم چیە؟!

ڕووناکایی چرای ئوتومبیلێك لە دوورەوە دڕی بە تاریکـایی دەداو دەهاتـە پـێش. خۆم گورج کرد خـەریك بـوو بچمە سـەر جـادە، بـەلاّم نـازانم بۆچـی لاقـم لـە دوا نەهاتن، دلّم خەبەری دابوو کە وریای خۆم بم.

تا ئەوکاتە هیچ لەبیرم نـەبوو کـە لەوانەیـە پۆلیسـەکان بـە شـوێنم دا بگـەڕێن و هاتوچۆ بەو جادەیەدا بکەن.

ئوتومبیلەکە بە توندی دەهاتە پێش، بەلاّم من لە جێی خۆم نەبزووتم. کاتێـك لـە پێشم تێپەڕی سەرو گوێلاکی چەند پۆلیسم لە نێو جیبەکەدا لێك کردەوە.

خوا ڕوحمی کرد نەچوومەپێش. حالّەتێکی سەیرم بەسەردا هات. ئەمـەش یـەکێك لەو وەختانە بوو کە ژیان و مردنی پیاو بە موویەکەوە بەنـدە. ئێسـتا ئەمانـە بـە دەست کێن و ئەم چارەنووسانە لە کوێ دیاری دەکرێن؟ بۆخۆی مەسەلەیەکە کە زۆرکەس نەیان توانیوە وەلاّمی بۆبدۆزنەوە.

هەروا لە قەراخ جادە دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە چرای ئوتومبیلێکی دیکـە لـە دوورەوە دەرکەوت.

دیسان نەختێك پێم گرتەوە، بەلاّم کە نیزیك بۆوە دیتم لۆرییە. ڕاست بوومەوەو دەستم بۆ هەلّێنا. لۆرییەکە چەند هەنگاو بەولاوەتر ڕاوەستاو چوومە پێش:

ـ کاکە! تا ئەنقەرە بە چەندم سوار دەکەی؟ شۆفێر بە دەنگێکی زبرو گیراوەوە گوتی:

ـ مەرحەبا  فەرید بەگ چۆنی، چۆن؟

ژووری شۆفێری تاریک بوو. نەم دەتوانی سەرو چاوی ببینم، بەلام دەنگم ناسیەوە. "ژەنراڵ نیازی" یەکێك لە کۆنە هاوالآنی بەندیخانەم بوو. چەند ساڵ پێکەوە لە ژوورێك دا ژیابووین. ئێستا بۆچی ناومان نابوو ژەنراڵ نیازی بۆخۆی مەسەلەیەك بوو.

دیوتانە هیندێك کەس وێردی زمانیان ئەوەیە تووشی هەرکەس بن پێی دەڵێن "کاکە"، "خۆشەویستم"، "براگیان"، "ئاغا"و ئەم جۆرە شتانە؟

ئەم هاورێیەشمان لەوردو درشت تووشی هەرکەس بوایە دەیگوت "ژەنراڵ"جا بۆیە لە بەندیخانە ناومانە نابوو "ژەنراڵ نیازی".

زۆرم پێ ناخۆش بوو کە منی لەو بەرگەدا دی. پێم خۆش نەبوو کەس بمناسێ، بەلام چارنەبوو، پێکەنینێکم بۆ کردو گوتم:

دەستت ماچ دەکەم "ژەنراڵ" تۆ چۆنی؟

ـ باشم. سەرکەوە.

هەر لە پەنایەوەدانیشتم پرسی:

ئەم تەشك و دیمەنە چیە؟ دیسان چ کەڵەکێکت بە دەستەوەیە؟

ـ هیچ بابە. تازە من پیاوی کەڵەك و مەڵەك نیم.

ژەنراڵ نیازی مستێکی توندی لەسەر شانم دا:

ـ کورە برۆ ئەو چاو و ڕووە هی خۆت بن، درۆ لەگەڵ منیش دەکەی؟!

ـ نا بە گیانی تۆ. شێوەی قسەکانی گۆڕی و پرسی:

ـ بەسەری من ئێستا خەریکی چی؟

ـ خەریکی کشتوکاڵم.

تێگەیشتم باوەڕی نەکرد، شانێکی هەڵتەکاندو گوتی:

ـ زۆر باشە. خۆ شوکور کاروبارت باشە؟

ـ ئێ، خەراپ نیە. تۆ چۆنی؟

ـ ئێمەش نان و ئاوێك پەیدا دەکەین.

من زۆر حەوسەلەی قسەکردنم نەبوو، فکرم هەر لەسەر جادەکە بوو دەترسام تووشی جیبی پۆلیسەکان بین. بەڵام ژەنراڵ نیازی یەك بین قسەی دەکرد. بیرەوەری ڕۆژگاری بەندیخانەی و شیرینکاریەکانی ئەو دواییەی بۆ دەگێڕامەوەو ناوبەناویش پێکەنینێکی پرمانای بۆ دەکرد.

گەیشتینە نیزیك چاخانەیەك. نیازی دەیویست لادەین چایەك بخۆینەوەو نەختێك ماندوومان بحەسێتەوە.

بەڵام من رازی نەبووم. دەمەویست هەتا دنیا تاریکە لە مەڵبەندی خەتەر دوور کەوینەوە... گوتم:

ـ بابە لێدە بابڕۆین یەکسەر بۆ ئەنقەرە.

ـ چما شووتیمان بۆ نەخۆشی هێناوە؟

ـ ئێرە خواردنەکەی باش نیە.

نیازی قاقایەکی بۆ کێشاو گوتی:

ـ یانی لە خواردنی بەندیخانەش پیسترە جەنابی نەجیب زادە. لە کەنگێوە وا نازپەروەردە بووی؟

نەمدەویست زۆری لەسەر بڕۆم، بەڵام لەپڕ لەبەردەمی چاخانەکە چاوم بە جیبی پۆلیسەکان کەوت. وا تێك ڕابووم خەریك بوو بەندی جەرگ و دڵانم بپسێ.

نیازی خەریك بوو ئوتومبیلەکە بەرێتە بەردەرگای چاخانەکە. دیتم ئەگەر بڕۆین پۆلیسەکان وەشك دەکەن و بە دوامان دا دێن. خێرا گوتم:

نیازی گیان! بۆ من باش نیە بێمە چاخانە. دەچم لەولا لەسەر جادە چاوەڕێت دەبم تا دێی. ئەگەر پۆلیسەکان پرسیان بڵێ کەسم نەدیوە.

نیازی بۆ خوی وەستای ئەو مەسەلانە بوو. بە دووقسە هەموو شتێك حالی بوو چاوی دەرپەڕاندو تەماشایەکی کردم:

ـ بێچوە سەگ! نەتدەگوت خەریکی کشتوکاڵم! ئەی بۆچی...؟ بە پاڕانەوەوە گوتم:

ـ بە قوربانت بم جارێ بچۆ چاخانە با پۆلیسەکان نەیەنە دەرێ پاشان هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە. بەڵام وریابە بۆن نەکەن!

خێرا خۆم فرێ داو وەك تاژی بە نێو دارستان دا غارم دا.

دووسەد سێسەد میتر بەرەوژێرتر چوومە سەردارێك و لە دوورەوە چاوم بڕیە چاخانەکە.

نازانی لە چ حالێك دا بووم... تاوانبارو کەڵەکباز ئەگەر شیریان هەوران دابێنێ هێشتا بەدبەخت و بە ستەزمانن.

هەزار میلیۆن پارەو چەندین ساڵ خۆشی سەعاتیك دڵەخورپە نایەنێ. ئەو جەهەننەمەی بۆ گوناهباران دانراوە، باوەڕ ناکەم لەودڵە خورپەو چاوڕوانییە ناخۆشتر بێ. وەك دەڵێن، ترس لە نەخۆشی خەراپترە. ئەوەندە ناڕەحەت بووم ئاواتم بوو پۆلیسەکان بێن و بمگرن تا لەو دڵەخورپەو نیگەرانییە ڕزگارم بێ.

پاش سەعاتێك نیازی هات. سوار بووین و کەوتینەڕێ.

گوتی:

ـ ئێ. پیاوی باش! ئێستا بڵێ بزانم مەسەلە چیە؟

ئێستا کە کارەکە وای لێ هاتبوو ناچاربووم لە سیرێ تا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ بگێڕمەوە.

بەسەرهاتەکەم هەتا ئەنقەرەی خایاند. کە لێ بوومەوە نیازی پرسی:

ـ باشە، ئێستا نیازت هەیە چ بکەی؟

ـ بەڕاستی بۆ خۆشم نازانم.

نیازی کە زۆری بەزەیی پێمدا هاتبۆوە زەردەخەنەیەکی ساردی هاتێ و گوتی:

ـ ئەگەر بە قسەی کاکی خۆت دەکەی لۆرییەك بکڕەو خۆت لەو دەریەدەری و بەدبەختییە ڕزگار بکە.

فکرێکی باش بوو، بەڵام ئەو ڕابردووە نەحلەتییەم چ لێ کردبایە؟ پرسیم:

ـ مەگەر پۆلیس دێڵێ پیاو بەسەر ڕاستی بژی؟

ـ مەترسە، ئەگەر پیاو دەست لە کەڵەکبازی هەڵبگرێ کاریان پێ نیە.

کەوتمە فکرەوە "توخوا تەماشا! ڕێکەوت چ نەخشێکی لە ژیانی بنیادەم دا هەیە. ڕێکەوت هێندێك جار لەوانەیە بتگەیەنێتە سەر تەختی پادشایەتی و هێندێك جاریش تووشی بەدبەختی و چارەڕەشیت دەکا".

من هەمیشە لە پێشهاتەکان دا لە سەرەتاوە باشم بۆ دەهات، بەڵام دوایە تووشی بەڵاو دەردی سەری دەبووم.

بۆیە هەروەخت شانس ڕووی تێ دەکردم هەر لەبیری ئاخرەکەی دا بووم. ئەمجاریش زۆر لەوە دەترسام کەوا هاسان و بێ ژانەسەر لە چنگ پۆلیسەکان ڕزگار ببووم. کە گەیشتینە ئەنقەرە قەول و قەرارمان داناو لێك جیا بووینەوە.

بڕیارم دابوو بەو پارەی هەمە لۆرییەك بکڕم. بەیانی هەوەڵ کارم ئەوە بوو چەند ڕۆژنامەیەکم کڕی.

دەمزانی ڕۆژنامەکان لە بارەی منەوە هێندێك شتی سەرسووڕهێنەر دەنووسن. ئەگەر ئەو خەبەرانەم کۆکردبایەوە کە لە یەکەم ڕۆژەوە ڕۆژنامەکان لەسەریان نووسیوم کتێبێکی گەورەیان تێدەبوو.

ئەوانە زۆر لە ئەسڵی بەسەرهاتەکەی من خۆشترو بە تامتر بوون.

"زۆر سەیر بوو. ئەم جارە ڕۆژنامەکان هیچیان لە بارەی منەوە نەنووسیوو".

ئەو ڕۆژە زۆرم پێ سەیر بوو، بەڵام دوایە تێگەیشتم هۆی چی بووە:
فەرماندەو پۆلیسەکان کاتێك وەهۆش هاتبوونەوەو دیتبوویان "دەلانکەم ناون" دۆسیەو مۆسیەکەیان دڕاندبوون و دیزەبەدەر خۆنەیان لێ کردبوو.
بەوجۆرە کاری من زۆر هاسانتر بوو، لانی کەم دەمتوانی هەتا شتێکی تازەم بەسەر دێ، بەبێ دڵەکوتەو ناڕەحەتی ژیانێك بەرمەسەر. چوومە بازار دەستێکم جلی جوان کڕی.
بڕیارم دا بەرنامەی ژیانم وا ڕێك بخەم کە تازە جارێکی دیکە لاقم بەتەڵەوە نەبێ، بەڵام داخەکەم ئەو بڕیارە زۆر زوو تێك شکا.
وەك قانوونی لەپڕدانراو، کە تەنیا ٢٤سەعات کار دەکا، هێشتا شەو و ڕۆژێك بەسەر بڕیارەکەم دا تێنەپەڕیبوو کە پێشهاتێکی سەیرو چاوەڕوان نەکراوم هاتە ڕێ.
دەمەویست پێش ئەوەی دەست بەکار بکەم سەرێکی دایك و بابەکانم بدەم. بزانم ماون یا مردوون، چیان بە سەرهاتووە؟ و ئێستاش کە پارەم هەیە یارمەتیەکیان بدەم.
حیسابێکم لە بانك کردەوە، هێندێك لە پارەکەم لە بانك داناو ئەوەکەی تریشم لەتەنکەی باخەڵم ناو لەگەڵ نیازی چووم بۆ ئەستەمبووڵ.
لای ئێوارێ گەیشتینە ئەستەمبووڵ. هەوا زۆر خۆش بوو. دیمەنی دەریا ڕوحی بنیادەمی دەگەشاندەوە.
نیازی پێشنیاری کرد "بچین ئەمشەو کەیفێك بکەین".
بەخۆم نەبوو ڕاچەنیم. دەمزانی خۆش ڕابواردن بۆ من حەرامە، بەڵام ئەودڵە ماڵ وێرانەم زۆری ئارەزووی شەوێك خۆشی و ڕابواردن هەبوو. گوتم:
ـ باشە. بابچین... شەوێك هەر شەوێکە.
چووینە دورگەی "بیوك ئادا" لەوێ گازینوی زۆر خۆشی لێن. دیارە جێگای مەمانان نیە، بەڵام ئێمەش ئەوشەوە سەروسەکوتمان زۆر ڕێك وپێك بوو. جلەکانی

مـن سـەرتاپا تـازە بـوون. نیـازیش بـەو قەدوقەوارەیـەوە هـەموو کـەس سـامی لـێدەکرد.

چووینە گازینۆ، یەکێك لە شاگردەکان غاری دا پێشمان:

ـ فەرمـوون.

بۆخۆی وەپێش کەوت و ئێمەی بردە سەر مێزێك کە بەسەر دەریای دا دەڕوانی.

من بە جارێك خۆم لـێ گۆڕابوو. خۆم وەك پیاوێکی ماقووڵ و ناسراو دەهاتە پێش چاو و پێم وابوو "کابرا بۆتە پیاو! !".

نیازییش چـەپی لەبـەر مـن دا نـەبوو. هـەردووکمان بـەفیزو دەمـارەوە لـە پشـت مێزەکە دانیشتین.

شاگردەکە چاوەڕوانی قسەی ئێمە بـوو. زۆر بـە ئەدەبـەوە لـە تەنیشـت مێزەکـە ڕاوەستابوو گوتی:

چ ئەمر دەکەن؟

ڕووم کردە نیازی و هەر وەك جاران و تۆزێکیش زیاتر گوتم:

ـ ژەنەراڵ چ بێنێ؟

نیازیش هەر هیچ ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو. فکری نـەکردبۆوە کـە لـە شوێنێکی گشتی دانیشتووین و ئەم "ناو" گوڕینەو ئەوە کە یەکێك بەدرۆ خوی بە "ژەنراڵ" لە قەڵەم بدا کارێکی خەتەرناکە. زۆر جیدی بە شاگردەکەی گوت:

ـ کوڕی باش! گۆشتی تێکەڵاومان بۆ بێنە.

شاگردەکە پرسی:

ـ قوربان خواردنەوە چ دەفەرموون؟

دووبارە ڕووم کردە نیازی:

ـ جەنابی ژەنراڵ چی ئەمر دەفەرموون؟

نیازی ماڵ بە قوڕگیراویش هەروەك بەڕاستی ژەنراڵ بێ، نەختێك برۆی هەڵتەکاندو وەك داوای پەرداخێك ئاوی سارد بکا زۆر بە بێموبالاتی گوتی:

ـ بتڵێك ویسكی بێنە.

ئەمجارەیان كابرای شاگرد ئیكلامێكی وای كێشا هێندەی نەمابوو لووتی بگاتە زەوی و گوتی:

ـ بەسەر چاو جەنابی ژەنراڵ هەر ئێستا... سەهۆڵیشتان بۆ بێنم جەنابی ژەنراڵ... ئەمر فەرموو جەنابی ژەنراڵ...

شاگردەكە پاشەوپاش كشایەوە. هێندەی نەمابوو لە فیشقەی پێكەنینێ بدەم، بەستەزمانە پێی وابوو نیازی هەر بەڕاستی ژەنڕاڵە ! !

با ئەوەش بڵێم كە ئەودەم ژەنراڵ شتێكی عەجایب بوو.

شاگردەكە یەكسەر دەچێتە لای خاوەن گازینۆو بەداو وناو بۆی دەگێڕێتەوە كە: "ژەنراڵێك هاتۆتە گازینۆ".

بەڕێكەوت خاوەن گازینۆش كاری لەدایرەیەك حاسی بووەو چەند ڕۆژە بەدوای واسیتەیەك دا دەگەڕێ كە كارەكەی بۆ ڕایی بكا. ئیتر هەر كە ئەم خەبەرەی بیست هەموو كارەكانی بەجێهێشت و ڕایكرد بۆ لای ئێمە. هێشتا پێنج شەش هەنگاوی مابوو بگاتە لامان بەو زگە زەلامەوە دەستی كرد بە دوولاهاتنەوەو مەرایی كردن.

ـ بەخێرهاتی جەنابی ژەنراڵ... بەرەكەتت هێنا... گازینۆكەت سەربەرز كرد...

نیازیش زۆر بێ موبالات و لەسەرخۆ سەرێكی بۆ لەقاند:

ـ مەمنوونم.

پاشان بەدەست ئیشارەی بۆ كرد كە خاوەن گازینۆ بچێتەوە سەر كاری خۆی، بەڵام كابرا وازی نەدێناو لەڕوو نەدەچوو:

ـ قوربان خواردن چیتان ئەمر كردوە؟

ـ هەرچی دەمانویست گوتوومانە، مێرسی، سوپاس هەموو شتێك هەیە. بەڵام خاوەن گازینۆ ئەم قسانەی بە گوێدا نەدەچوو.پەیتا پەیتا فەرمانی بە شاگردەكان دەدا:

ـ کوڕە بڕۆ جەرگ ودڵ بۆ جەنابی ژەنراڵ بێنە... بڕۆ زوویە کەبابی گۆشت بەرخ ساز بکە.

نیازی زۆر لەو ڕیابازییەی کابرا قەڵس بوو. شاگردەکەی بانگ کرد:

ـ کوڕە وەرە بزانم.

شاگردەکە گەڕایەوەو نیازی لە خاوەن گازینۆکەی پرسی:

ـ من پارەکەی دەدەم یان تۆ؟

ـ ببوورە قوربان... ئەم قسانە چیە؟ پارە یانی چی سێبەری جەنابت بۆ ئێمە لە ئاڵتوونیش بەنرخ ترە.

پاشان ڕووی کردەوە شاگردەکە:

ـ یاڵڵا بێئاقڵ... ماتڵی چی؟... بڕۆ زووبە...

کاتێك خاوەن گازینۆ ڕووی کردە ئەولاو فەرمانی بەشاگردەکە دا، نیازی چاوێکی لەمن داگرت و بە ئیشارە حاڵی کردم کە خاوەن گازینۆ پێی وایە ئێمە میلیۆنێرین.

منیش شانم هەڵتەکاندو بەسپایی گوتم:

ـ گوێت لەم قسانە نەبێ، لەچی دەترسی؟ پارەمان زۆرە خەمت نەبێ.

خاوەن گازینۆ ڕووی کردەوە ئێمە:

ـ قوربان ئێمە هەرچەندی خزمەتی ئێوە بکەین کەمە. ئیزن دەفەرموون "تف ئەترۆکاتف"ێکیشتان بێنێتە خزمەت؟

من قەتم ئەو خواردنە نەدیتبوو بەڵام نازانم بۆچی لەخۆوە گوتم ناخۆم.

خاوەن گازینۆ گوتی:

ـ با گون و گورچیلەی برژاوتان بۆ بێنن.

ـ نا بابە! ئەمانە چین؟

هەر ئەمەم لەدەم دەپەڕی و نیازی بەڕاوێژێکی تایبەتیەوە گوتی:

ـ بەڕاستی بێچووە ژەنراڵی.

ئەمجار کابرا بای دایەوە سەرمن و زۆر بە ئیحترامەوە تەعزیمی بۆکردم:

- بێگومان جەنابی ژەنراڵ زادە حەز لە مریشکی برژاو دەکەن؟

گوتم:

- بەڵێ، بابێنن.

شاگردەکانیش بەڕاست و چەپ دا ئیکلامیان دەکێشاو هەرکەسە دەیەویست زیاترمان خزمەت بکا. ئەوەندەیان خواردن و خواردنەوە هێنا کە ئیتر لەسەر مێزەکە جێ نەبوو. من بەنیازیم دەگوت ژەنراڵ و ئەویش منی بە "ژەنراڵ زادە" بانگ دەکرد.

ئاخرەکەی هەرچۆنێك بوو خاوەن گازینۆمان لەکۆڵ خۆ کردەوە، بەڵام سێ شاگرد بەرامبەرمان وێستابوون و ئامادەی جێبەجێ کردنی فەرمان بوون. ئێمەش بێ پسانەوە دەمان خواردەوە. دەریا دیمەنێکی جوانی هەبوو موسیقایەکی نەرمیش کە لە بڵندگۆکەوە بڵاودەکرایەوە زۆری کار تێ دەکردین. بەرەبەرە خەریك بوو سەرخۆشی هەموو گیانمان دابگرێ.

ڕاست لەوکاتەدا ژنێك چۆسەر شانۆ و دەستی کرد بەگۆرانی.

ڕەنگە ئەگەر وەختێکی دیکە بوایە پیاو ژانەسەری پێ گرتبا، بەڵام لەو وەختەدا گۆرانی ئەو ژنە بۆ ئێمە ئاوازێکی گیانپەروەر بوو. بۆخۆشی لەبەر چاوی ئێمە ئەوەندە جوان بوو، پێمان وابوو فریشتەیە. پاشان نۆرەی سەما هات. دووسێ ژن بە ئەندامێکی نیوەداپۆشراو و هەوەس بزوێنەوە هاتنە سەر شانۆ.

هەموویان هەر سەرنجی ئێمەیان دەداو ناوبەناو بزەیەکی شیرینیان بۆ دەکردین. وەك ئەوەی بێجگە لەئێمە کەس لەو گازینۆیە نەبێ، دڵم خەبەری دا تووشی شتێك دەبین. گوتم:

- ژەنراڵ! ئەم کارە ئاخری خێربێ.

- کام کار؟

- ئەم بەزمەی ئەمشەومان!

- بۆچی؟ بەپارەی خۆمان ڕای دەبوێرین. چی تێدایە؟!

هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشاو گوتم:

ـ ژەنراڵ ئەمن تا ئێستا زۆر جارم تاقی کردۆتەوە.

هەروەختێك کەیفم زۆر ساز بێ، دەزانم پێمەوە دەدا. هەمیشە بۆ چەند سەعات خۆش ڕابواردن عومرێك کوێرەوەریم کێشاوە.

ئەمشەویش دڵم زۆر دەترسێ!

نیازی شانێکی هەڵتەکاند:

ـ دانیشە. وا دیارە حاڵت باش نیە. ئاخر چ دەبێ؟!

ئەمەی گوت و ئیستیکانەکەی هەڵدا "بەسلامەتیت". منیش ناچار ئیستیکانەکەم هەڵێنا: "بەسلامەتیت".

نیازی چاوی لە ژنێکیان داگرت کە ڕەقسی ئەسپانیۆلی دەکرد. خاوەن گازینۆ وەك دێوێك کە موویان لێ هەڵپروزاندبێ، دەسبەجێ هاتە تەنیشت مێزەکەی ئێمە:

ـ جەنابی ژنرەاڵ ئیزن دەفەرمووی بێتە سەر مێزەکەتان؟

ئەمن هێندە سەرخۆش بووم لەقسەی خاوەنی گازینۆ حالی نەبووم. پێم وابوو دیسان لە خواردەمەنی دەپرسێ، گوتم:

ـ خواردن ئیتر بەسە. تەنیا بتڵێك مەشرووب بێنە.

بەڵام نیازی کە تێگەیشتبوو کابرا چی گوتوە، وەڵامی دایەوە:

ـ بۆخۆی باشە، بەڵام زمانی نازانم.

ـ جەنابی ژنراڵ زمانی ئێمە دەزانێ... ئەسڵەن خەڵکی ئێرەیە.

پاش ئەوەی سەما تەواو بوو، کابرا هێنایە سەرمێزەکەی ئێمە. کاتێك باشی لێ ورد بوومەوە دیتم خەڵکی شارەکەی خۆمانە. دووبارە ئیستیکانەکانمان پڕ کردەوەو هەڵمان دان.

وردە وردە وامان بەسەر هات کە نەمان دەزانی دەڵێین چی؟

نیازی وەزعێکی سەیری هەبوو. دەتگوت بۆ خۆشی باوەڕی کردوەو پێی وایە هەر بەڕاستی ژەنراڵە. دەنگی خۆی نێر دەکردو برۆکانی هەڵدەتەکاندو ملی قیت ڕادەگرت. لەپڕ بەدەنگێکی سەیرەوە بەسەر تیپی موسیقای دا نەڕاند:

- بێدەنگ بن! ئەو قۆریاتە چیە لێی دەدەن. زووکەن ئاهەنگی سەمای شاتری لێدەن.

موسیقاژەنەکان فەرمانەکەیان بەجێ گەیاندو خەڵکی دەوروبەرمان کەوتنە سرتەو خەڵوەو ناڕەزایی دەربڕین. بەڵام خاوەن گازینۆ بەسرتە حاڵی کردن:

- "ژەنراڵە".

ئەو سەردەمی کەس نەیدەتوانی قسە لەقسەی عەسکەرییەکان بکا، هەرچی گوتبایان بێ ئەملاوئەولا جێبەجێ دەکرا.

ئێمە لە هەموو شتێك بێخەبەر بووین و نەمان دەزانی بەدەستی خۆمان چ قوڕێك بەسەری خۆمان دا دەکەین.

موشتەرییەکان هەموو ناڕەحەت بوون و پێکەوە کەوتبوونە سرت و خورت. بۆ بەدبەختی دوونەفسەریش بەژن ومنداڵەوە لەوێ بوون.

تیپی مۆسیقا ئاهەنگی سەمای شاتری لێ دەدا، نیازییش دەرپەڕی و لە ناوەڕاستی شانۆکەدا دەستی کرد بەسەمای شاتری.

پاشانیش دەستوری دا ئاهەنگی قەسابان لێدەن.

سەمایەکی کرد دەماخی هەموو موشتەرییەکانی تێك دا. بۆ ئەوەی پێکەنین نەیانگرێ و ژەنراڵ توورە نەبێ یەك بەدوای یەك دا گازینۆکەیان بەجێ هێشت.

نیازی کە بەتەواوی سەری گەرم ببوو دەستی برد سەرپۆشی مێزێکی ڕاکشا، هەرچی قاپ و قاچاخی لەسەری بوو کەوتنە خوارو وردوخاش بوون.

بەڵام نیازی وەك نە بای دیبێ و نەباران، سەرپۆشی مێزەکەی لەپشتێنی بەست و دەستی کرد بەسەمای عەرەبی.

ئێمە ئاگامان لەهیچ نەبوو. بەڵام گۆیا ئەفسەرەکان کە لەو ئەداو ئەتوارە وەجان هاتبوون بە تەلەفۆن ئینزیباتخانەیان ئاگادار کردبوو.

نیازی کاتێك ماندو و بوو کەوتە هەناسەبڕکە، هاتەوە سەر مێزەکەی خۆمان و هاواری کرد "کاکە حیسابەکەت بێنە بزانم" شاگردەکە ڕای کردە لای بەڕێوەبەری گازینۆ، ئاغا بەپێکەنین و ڕیابازیەوە هاتە پێش:

ـ ببوورن جەنابی ژەنراڵ! قابیلی چیە؟ چۆن من پارە لە ئێوە وەردەگرم؟

لەوکاتەدا سەرۆکی ئینزیباتخانە بەخۆی و چەند ئینزیباتەوە وەژوورکەوت. ئێمە ئاگامان لەهیچ نەبوو و هیچ بایەخمان پێ نەدا.

نیازی کە وەزعی زۆر شپرزە بوو؛ سەری وەسەر مێزەکە کردو منیش چاوم بڕیبووە کەشتییەك کە بە پێش (داردانێل)دا تێدەپەڕی. کەشتی دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو.

کەشتییەکەم بەنیازی نیشان دا. نیازی کە زۆری ئارەق کردبوو، دەستەسڕەکەی دەرهێناو خەریك بوو ئارەقی ناوچاوان و پشت ملی وشك دەکردەوە هەوای شاعیری لەسەری دا. دەستی بۆ لای کەشتییەکە ڕاداشت و گوتی:

"ئەی کەشتی نەناسراو! بۆ هەر کوێیەك دەچی منیش لەگەڵ خۆت بەرە. بۆبەندەرە نەناسراوەکان. ئەو جێگایە کە بنیادەمی لێ نیە".

دیتم نیازی حاڵی زۆر شڕەو باش کەوتۆتە هاتەران پاتەران. بە شاگردەکەم گوت تاکسییەك بانگ کە تا لەتام دەرنەچووە با هەڵی گرم بیبەمەوە.

شاگردەکە ڕۆیشت و منیش گەڕامەوە بۆلای نیازی. ئەو هێشتا هەر خەریکی شێعر وتن و ئارەق وشك کردنەوە بوو.

خەریك بوو قسەی لەگەڵ بکەم، فریا نەکەوتم. یەکێك لەپشتەوە پرسی:

ـ ناوت چیە؟

وەرگەڕام دیتم دووئەفسەری ئینزیبات لەتەنیشت مێزەکەمانەوە ڕاوەستاون، دیسان زۆر وەسەرخۆم نەهێناو ناوی خۆم گوت.

نیازی هێشتا خەریك بوو خواحافیزی لە کەشتی‌یەکە دەکردو دەستی لێ ڕادەوەشاند. بەسپایی پێم گوت:

- وریای خۆت بە.

یەکێك لەئەفسەرەکان پرسی:

- ئێوە پاشای کوێن؟ (ئەودەم بەژەنراڵیان دەگوت پاشا - وەرگێڕ).

نیازی بێئەوەی ئاوڕ بداتەوە جوابی دانەوە:

- مەحموود پاشا، حەیدەر پاشا. (ئەمانە ناوی دوو گەڕەکی بەناوبانگی ئەستەمبوولن - وەرگێڕ).

ئەفسەری ئینزیبات لەو وەڵامەی نیازی کە زیاتر وەك گاڵتە پێکردن دەچوو زۆر تووڕە بوو و لەبن لێوانەوە سێ چوار جنێوی مەزەداری بۆ بەڕێ کرد. لەپاشانیش دەستووری بەئینزیباتەکان دا بمان گرن و بمان بەنە ئینزیباتخانە.

خاوەن گازینۆ کە تا ئەودەم دەست لەسەر سنگ ڕاوەستابوو، هاتە پێش و بە ئەفسەرەکانی گوت:

- قوربان ئەی حیسابەکەی ئێمە کێ دەی دا؟

کابرای تاین وەختێك تێگەیشت ئێمە ژەنراڵ نین قایمەیەکی باڵابەرزی بۆ نووسین کە هەتا دەمرم لەبیرم ناچێ.

پاشان چ ڕووی دا؟چیمان گوت؟ چۆن بوو؟ هیچ لەبیرم نیە. هەر ئەوەندە دەزانم سبەینێ لای نیوەڕۆ هاتمەوە هۆش خۆم. نازانم هۆی خواردنەوەی زۆر بوو یان هۆی لێدانی دوێنێ شەو، هەموو گیانم دێشا. ناوچاوانم بەدوو جێ شکابوو. نیازی لەمنیش خەراپتر بوو. ئەو هەر خۆی بەپێوە ڕانەدەگرت.

لەگەڵ وەهۆش خۆ هاتینەوە لێپرسین دەست پێکرا. لە پرسیارەکان ڕاو لەو هەموو فەرمانبەرەڕا کە بەسەرنجەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، تێگەیشتین کە مەسەلەکە زۆر قووڵ بووەو بەو هاسانیە ڕزگاریمان نابێ. بەڕاستیش هەروا بوو.

مەسەلەکە تەنیا هەڵگرتنی ناوی ژەنراڵی نەبوو، ئێمەیان بەجاسوسی و ناردنی خەبەر بۆ بێگانە تاوانبار کردبوو. ڕۆژنامەکانیش ئەوەندەیان مەسەلەکە گەورە کردبۆوە کە هەموو کەس پێی وابوو ئێمە دووجاسووسی خەیانەتکارین و دەبێ بێمەحکەمە ئیعدام بکرێین. کاتێك سەردێری ڕۆژنامەکانم دیت هەر ئەوەندە بوو شاخم لێ نەڕوان.

"دووجاسوسی خەتەرناك کە خۆیان کردبووە ئەفسەری سوپا، لە کاتێك دا لەسەر داردانێل لەگەڵ کەشتی‌یەکی سۆڤێتی خەریکی گۆڕینەوەی ئیشارەو ناردنی خەبەر بوون دەستگیرکران".

جا برۆ ئەمەی چاك بکە. توخوا قسە لەوە قۆڕتر دەبێ؟ نیازی قوڕبەسەر سەرخۆش بوو و بە مەستی شێعری دەگوت. کەچی ڕۆژنامەکان چ کلك و گوێیەکیان لێناوە.

محقق دەتگوت بابم کوشتوە، زۆر بە ڕووگرژی و تووڕەیی پرسی:

ـ بۆچی دەستت بۆ کەشتیی سۆڤێتی ڕاوەشاند؟

ـ وەڵڵا من دەستم ڕانەوەشاند نیازی ڕای وەشاند.

ـ بۆچی ڕای وەشاند؟

ـ ئەو نەی‌دەزانی کەشتی سۆڤێتی‌یە. ئەگەر زانیبای کاری وای نەدەکرد. پێی وابوو کەشتیی خۆمانە.

ـ ئەگەر وابوو ئەو قسانەی چ بووە دەیگوت "ئێمە بەرە بۆ بەندەرە نەناسراوەکان"چما ئەستەمبووڵ بەلای ئێوەوە بەندەرێکی نەناسراوە؟!

ـ قوربان ئەو برادەرە سەرخۆش بوو نەی‌دەزانی چ غەڵەتێك دەکا.

ـ کەسێك سەرخۆش بێ دەڕشێتەوە دەست ڕاناوەشێنێ.

ـ هێندە تێك نەچووبوو بڕشێتەوە.

ـ باشە بێجگە لە دەست چی تری ڕاوەشاند؟

ـ هیچی تری رانەوەشاند.

ـ ئەی بۆدەڵێن ئاڵای ڕاوەشاندوە. ئەو بەداری ئاڵاکە ئیشارەتی داوە.

ـ ناقوربان ئاڵای لەکوێ بووە؟

ـ بەڵێ ئاڵای پێ بووە ئەویش ئاڵای سپی کە نیشانەی خۆبەدەستەوەدانە. چەند کەس چاویان لێ بووەو شایەتی‌یان داوە.

ـ ئاڵا نەبوو قوربان دەستەسڕەکەی بوو. ئەویش ڕای نەدەوەشاند. گەرمای بوو ئارەقەکەی وشك دەکردەوەو باوەشێنی خۆی پێدەکرد.

ـ تۆ چیت ڕاوەشاند.

ـ من هیچم ڕانەوەشاند.

ـ چۆن. تۆش شتێکت ڕاوەشاندوە. چەندکەس چاویان لێ بووە کە تۆ ئاڵایەکی شینت ڕاوەشاندوە.

بێ ئیختیار دەنگم هەڵبڕی و وەڵامم دایەوە.

ـ قوربان بەو تاریکەشەوە کابرای سواری کەشتی چۆن ڕەنگی سپی و شین لێك دەکاتەوە؟

ـ تۆ چۆن بەو تاریکەشەوە کەشتی‌یەکەت دی؟

ـ کەشتی چرای هەیە. بەچرایەکەی ڕا زانیم کەشتی‌یە.

ـ ئەو ئاڵاشینەی ڕات دەوەشاند لەکوێیە؟

لەپڕ وەبیرم هاتەوە:

ـ بەڕێز ئاڵا نەبوو. ئەوەتا بۆینباغەکەم بوو. وەك دەبینی بۆینباغەکەم شینەو ڕەنگە لەوکاتەدا با ڕای وەشاندبێ.

لەگەڵ هەمووی ئەمانەش دا لێپرسینەوەی ئێمە چەند مانگی کێشا.

ئێمە تەنافی ئیعداممان لەپشت سەری خۆمان هەست پێدەکرد. ڕزگاری لەوداوە بەهیچ جۆر مومکین نەبوو. تەنیا مۆجیزەیەك دەیتوانی ئێمە ڕزگار بکا.

من هەموو هۆش و بیرم لەلای ئەو پارەبوو کەدابووم بەبانك. دەمزانی ئەگەر پێ بزانن کارەکە زۆر گەورە دەبێ! چونکە نە دەمتوانی بڵێم ئەو هەموو پارەم لەکوێ بووەو نە دەمتوانی سەرچاوەی داهاتەکەم باس بکەم.

ئاخرەکەی "لیفە لەسەر هەتیوان هەڵدرایەوە"و پارەکە ئاشکرا بوو. دادگا سەنەدی پارەکەی دۆزیەوەو ئەمە بوو بە بەڵگەیەکی گەورەی تاوانی جاسووسی ئێمە.

هەرچەند تۆمەتەکەمان زۆر گەورەبوو و بەتاوانی جاسوسی و پێوەندی لەگەڵ بێگانەو ناردنی خەبەری نهێنی تاوانبار کرابووین، بەڵام لەبەرئەوەی قازییەکان تێگەیشتن ئێمە کوڕی ئەو مەیدانەو کەری ئەو بارە نین بە مەرجێك باسی پارەکە نەکەمەوە منیان بەناوی شەریکی تاوان بە ساڵێك حەپس و نیازیشیان بەناوی تاوانباری ئەسڵی بەچوار ساڵ حەپس مەحکووم کرد.

لەوەی کە لە جیاتی ئیعدام و تیرەباران بەوەندە ڕزگاریمان هاتبوو زۆر دڵخۆش بووین، بەڵام دوایە کە بردیانینە بەندیخانەی ئینزیبات لەسەگ پەژیوانتر بووین. خۆزگە پێنج ساڵ لەبەندیخانەی گشتی گیرابایین، بەڵام مانگێك لەبەندیخانەی ئینزیبات نەمابایینەوە.

ئاخر لە بەندیخانەی گشتی دا دام و دەزگایەکمان هەبوو، ڕێزمان لێدەگیرا، بەڵام لە بەندیخانەی ئینزیبات ئەو جۆرە قسانە نین.

بەتایبەتی چونکە ئێمە ناوی ژەنراڵ و ژەنراڵ زادەمان لە خۆنابوو، بەندییەکان و تەنانەت فەرمانبەرەکانیش بەچاوی دوژمنایەتی سەیریان دەکردین.

ئەو نیازییە ماڵ وێرانە لە بەندیخانەش هەر دەیەویست پێم بڵێ ژەنراڵ زادەو ئەو زمانە سەگباب خێوەی منیش وا ڕاهاتبوو زۆر جار بانگم دەکرد "ژەنراڵ نیازی".

بەرەبەرە وای لێهات زۆر لەبەندییەکان بەمنیان دەگوت ژەنراڵ زادەو بەتەواوی ئەو ناوەم بەسەردا بڕا.

زۆرم بیردەکردەوە کە بۆچی ئەو هەموو ناوەی هاورێکانم لێیان دەنام هیچیان وەك ئەم ژەنراڵ زادەیە بەمنەوە نەنووسان.

دوایە تێگەیشتم مەسەلە چیە: ئەو کەسانەی تووشی ژێردەستی و چەرمەسەری بوون و لەژێر بەندوباری کۆمەڵدا پلیشاونەوە، پێیان خۆشە پیاوە گەورەکانیش لەگەڵ خۆیان بەرنە ناو ئەو قووڵکە ڕەش و تاریکانەوە.

دڵیان بەوە خۆشە کە ئەگەر ئەوان بێبەشی دەچێژن و کوێرەوەری دەکێشن، چەند کەسێك لەو ناسك و نازدارو نازپەروەرەدانەش ئەو ژیانە تاڵە ببینن. پێیان وایە بەوجۆرە تۆڵەی خۆیان دەستێننەوەو بەشێك لەدەردو مەرگی خۆیان تووشی ئەوان دەکەن!

ناوی ژەنراڵ زادەی منیش بەشێك بوو لەو تۆڵە ئەستاندنەوە. کاتێك بەندییەکان منیان بە ژەنراڵ زادە ناو دەبردو پێیان وابوو بەڕاستی بێچووە ژەنراڵێکیان دەنێودا هەیە نەختێك کفت و کۆی دڵیان دادەمرد.

هەروەك ئینسانە سیل دارو نەخۆشەکان حەز دەکەن خەڵکی تریش بەدەردی ئەوان گرفتار بێ، ئەمانەش پێیان خۆش بوو لانی کەم دووسێ نموونەیەك لەو ژەنراڵ و مەنراڵانەیان لەنێودا بێ.

هێندێك جاریش ئەوەندە بەڕق و کینەوە بانگیان دەکردم دەمگوت ئێستا دام دەگزێنێ و تێرووپڕم دەکوتن.

هەرچی هاوارم دەکرد "بابە وەڵڵا بیللا، تەڵلا بێچووە ژەنراڵ نیم" بێسوود بوو. هەرکەس منی دەبردەوە سەر ئەو پاشا یان ژەنراڵە کۆن و تازەیە کە بۆخۆی دەیناسی. هەر مەپرسە چەندیان درۆی زل زل لە بارەی منەوە ساز دەکردن و بۆ یەکتریان دەگێڕانەوە. ئەم بەدبەختییە لەلایەك و بێپارەیی لەلایەکی تر، بەجارێك ڕیشەیان دەرهێنابووم. نەمدەزانی تەگبیرم چیە؟ ئەوەندەم بەندیخانە دیبوو قەت وەك ئەوجارەم لێ نەقەومابوو.

جاران ئەگەر بە دەست بەتاڵیش چووبامە بەندیخانە، سەرەڕای ئەوەی لەوێ بەکەیفی خۆم پارەم خەرج دەکرد کاتێك بەرەڵا دەکرام نەختێکیشم پاشەکەوت هەبوو.

ئێستا ڕەنگە پرسیار بکەن ئەو پارەم چۆن و لەکوێ پەیدا دەکرد؟ ئەمە ئیتر پیشەیەکی تایبەتی خۆمەو نامەوێ بە ئێوەی بڵێم. تەنیا جارێك کە بێ پارە لە بەندیخانە دەرکەوتووم، ئەم جارەی بەندیخانەی سوپا بوو.

زۆرم پەرۆشی نیازی بوو، تا ئێستا پەرۆشی هیچ کەسم ئەوەندە نەبووە، ڕێژرەشە بەبێ سووچ و تاوان دەبوو سێ ساڵی دیکە بۆی بخەوێ، ئەویش بێ هاودەم و هاوڕاز.

بەڵام چار نەبوو. خواحافیزیەکی ساردمان لێك کردو هاتمەدەر، چیتان لێ وەشێرم؟ وەزعم ئەوەندە شپرزە بوو ئامادە بووم هەموو کارێك بکەم.

کەڵەکبازی بێ؟ فێڵ و تەڵەکە بێ؟ دزی بێ؟ جەردەیی بێ و هەرچی بێ.

من کە سەرەڕای ئەو هەموو ڕەنج و کوێرەوەرییە هەر هەوڵم دابوو پاك و ڕاست بمێنمەوە چ قازانجێکم پێ بڕابوو لەوە زیاتر کە پێم بڵێن گێلە پیاو؟! هەی دادو بێداد ئاخر بۆچی ئەمن تا ئێستا خۆم بە قوربانی خەڵك کردوە؟

ئێستا کەوایە، ئێستا کە قەرارە شەمۆیە بەریبم یەك شەمۆی سەرلەنوێ بگیرێمەوە، بۆچی هەر بەڕاستی نەبمە کەڵەکباز؟! بەڵام بەدبەختی ئەوە بوو نەم دەزانی چ بکەم؟!!

بڕیارم دابوو لەمەولا بەزەییم بەوردو درشت دا نەیە. دەستم وەهەر کەس ڕابگا کەڵەکێکی بۆ ساز بکەم و کڵاوی هەر کەسم بۆ هەڵکەوێ بیڕفێنم.

هەوەڵ کارم ئەوە بوو پارەیەك پەیدا بکەم، دەمزانی کەڵەکبازیش دەسمایەی دەوێ، پیاوی بێدەسمایە قەت هیچ بە هیچ ناکا.

هەروا بەسەر لێشێواوی لە "بی ئۆغلی" پیاسەم دەکردو وەك ڕاوچی بەدوای نێچیردا دەگەڕام. لەناکاو تووشی برادەرێکی ڕۆژگاری قوتابخانەم بووم. ئەو کۆنە

ئاشنایە هەر ئەو "بصری"یە بوو کە ئەگەر لەبیرتان بێ بوو بەهۆی دەرکرانم لە قوتابخانەی عەسکەری.

لەڕۆژەوە کە لە قوتابخانە دەرکرابووم نەم دیبۆوەو نەم دەزانی بۆتە ئەفسەر یان چ کارەیەو دەرەجەی چیە؟

بصری لە قوتابخانە قوتابییەکی رێك و پێك بوو و باشی دەخوێند، بەڵام بەداخەوە دووزمان بوو، هەر لە بەرئەوە کەس خۆشی نەدەویست و ئەویش نێوانی لەگەڵ کەس خۆش نەبوو.

بۆیە کە چاوم پێکەوت رووم وەرگێراو دەمەویست لێی لادەم، بەڵام ئەو باوەشی بۆ گرتمەوەو رای گرتم و هاواری کرد:

- پەتاتە.

زۆرم پێ سەیربوو کە چۆن پاش چەند ساڵ منی ناسیەوە، چونکە سەروسەکوتی من زۆر گۆڕابوو و ئەو فەریدی جاران نەبووم. ئاخر دەزانی پیاو سەروچاوی، ئاکاری، سەروسیمای بەتێپەرینی رۆژگار دەگۆڕێ و دەبێتە شتێکی تر. شوێنی کارو ژیانی پیاو زۆر لەو گۆڕانەدا کاریگەرە. ئەگەر پیاو چل ساڵ لە کتێبخانەدا بێ هەر ئەندازە قەڵەو و بەخۆوە بێ، پاش ئەو ماوەیە رەنگی کتێبەکان دەگرێ و رووەمەتی وەك لاپەرەی کتێبەکان زەرد هەڵدەگەڕێن.

هەروەها ئەو کەسانەش کە ساڵەها لەگەڵ چەتە و پیاو کوژو پیاوخەراپان دادەنیشن ئەگەر لەپێش دا فریشتەش بووبن، ئەو هاونشینییە دەیان گۆڕێ و سەروچاویان شێوەی پیاکوژو تاوانباران پەیدا دەکا.

منیش کە چەند ساڵ لەبەندیخانە ئاوی ساردم خواردبۆوە، هەموو شتێکم وەك پیاو خەراپان دەچوو. تەنانەت خەڵك لە چاوتێبڕینی من دەترسا.جاروبار کە ریشم دەتاشی بۆ خۆشم لەسەروسەکوتی خۆم دەترسام.

ئەوەندە گۆڕابووم کە زۆر لەدۆستە نیزیکەکانم نەیان دەناسیمەوە. چ جای بصری کە لە پێشداش نێوانمان زۆر خۆش نەبوو.

جا بۆیە بێئیختیار ڕاوەستام زۆر بەگەرمیەوە هاوارم کرد:

ـ حمزە ! هەردووك ئامێزمان لێك داو یەكترمان ماچ کرد. بصری چاوی پڕبوو لە فرمێسك گوتی:

ـ چۆنی فەرید؟

ـ سوپاس، باشم، تۆ چۆنی بصری؟

هەروا بەسەرپێوە نەختێك قسەمان کرد، نیزیك نیوەڕۆ بوو بصری گوتی:

ـ با بچین شتێك بخۆین دوایە قسان دەکەین.

بەبەر گازینۆکان دا تێپەڕیین لە هیچیان لای نەدا، هەتا لەبەردەم گازینۆیەکی دەرەجەیەك دا ڕاوەستا. چووینە ژوور، خواردنی زۆر گرانبایی داوا کرد. شەرابمان خواردەوەو دەست بەقسان کرا. ئەمن لەسەرێ تا پیوازێ هەموو بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە. زۆر تێك چوو، زۆر ناڕەحەت دیاربوو، بەناڕەحەتی‌یەوە گوتی:

شتێکم دەزانی، لەڕۆژنامەکان دا باسی کەڵەکبازی تۆم دەخوێندەوە بەڵام پێم وا نەبوو هەمووی هەر خەڵك داری بەروحت دا داوەو بۆخۆت هەر بیریشت لەکەڵەکبازی نەکردۆتەوە.

سوێندم بۆ خوارد کە هەموو قسەکانم ڕاستن.

ـ سوێند خواردنی ناوێ. لەسەروسەکوتت ڕادیارە ڕاست دەکەی، هەرکەس لەجیاتی تۆ بایە ئێستا بەلای کەمەوە میلیونێك پارەی هەبوو.

پاشان زۆرمان قسە کرد، زۆرمان بەسەرهاتی ڕۆژگاری قوتابخانە بۆیەکتر گێڕایەوە. زۆرم هەوڵ دا بزانم بصری چ کارەیە، بەڵام هەموو جارێ سەری قسەی بۆلایەکی دیکە دەکێشا. سەروسیمای زۆر ڕێك پێك بوو، هەرلەوەڕا کە لەو گازینۆ لۆکسە نانمان خوارد دیاربوو کە کاروباری باش هەڵدەسوڕێ.

پاش نان خواردن بانگی شاگردەکەی کرد. شاگردەکە حیسابی بۆ هێنا، بصری بەسیلەی چاو سەیرێکی حیسابەکەی کردو گوتی:

ـ بانگی ئاغات بکە بێ بزانم.

شاگرد ڕۆیشت، بەڵام بصری ڕانەوەستا تا خاوەن گازینۆ دێ. دەستی منی گرت و ڕۆیشتین بۆ لای مەتبەخ.

تەباخ و شاگردەکان بەدیتنی ئێمە زۆر تیك چوون، بصری ڕاستەڕێ چووە سەر مەنجەڵەکان، سەری لەسەر هەڵگرتن و بۆنی پێوە کردن:

ـ ئەمە چ گووکارییەکە؟!!

تەباخەکە بەجارێك دەست و لاقی خۆی ون کردو زمانی ڕەق بوو، بەسپایی و پچڕپچڕ دەستی بەقسە کرد، بەڵام بصری نەڕاندی:

ـ چما بە ئێوەیان نەگوت لەشارەوانییەوە پشکنەر دێ؟

لەوکاتەدا خاوەن گازینۆ وەژوور کەوت و لەدوورەوە ئیکلامێکی دوورو درێژی کێشا:

ـ قوربان خۆ چاوت لێیە مەتبەخەکەمان هەمیشە پاك و خاوێنە.

بصری زۆر توورە بوو هاواری کرد:

ـ ئەمە کوێی خاوێنە ئەمەیە خاوێنیەکەی؟

دەستی درێژ کرد سیسرەیەکی پێ نیشان دا کە لەسەر مەتبەخەکە دەهات و دەچوو:

ـ ئەوەتا. ئەمەیە نموونەکەی!

وەك فیل لە حەمامێ دۆزرابێتەوە تەباخ و ئاغا چاویان پێ دەرپەڕین.

لەدڵی خۆم دا گوتم "سیسرە ئەو هەموو ترس و لەرزەی بۆ چیە؟".

بصری بەو هەموو ڕق و توورەییەوە گوتی:

دەبێ بیکەینە ڕاپۆرت.

ـ جەنابی پشکنەر تکات لێدەکەم... حەزرەتی جەنابی پشکنەر.

بصری وەك جنێویکی گەورەی پێ درابێ نەڕاندی:

ـ پشکنەر و ژەهرەمار. پشکنەر چ کەرێکە؟ دەبێ هەم جەزا بکرێن و هەم گازینۆکەتان دابخەن.

ـ قوربان پارە قیمەتی نیە، بەڵام گازینۆکەمان دامەخە، ئەگەر موشتەرییەکانمان ئەو خەبەرە ببیسن زۆر خراپ دەبێ. بەیارمەتی...

بصری نەیهێشت قسەکەی تەواو بکا پرسی:

ـ تەلەفۆن کوا؟

چووە لای تەلەفۆنەکەو ژمارەیەکی وەرگرت:

ـ بەڕێوەبەرایەتی پشکنینی شارەوانییە!

دەستی کرد بە باسی مەسەلەی گازینۆکەو پاشان گوتی زۆر زوو پشکنەرێك بنێرنە ئێرە.

پاشان تەلەفۆنەکەی داناو بە خاوەن گازینۆکەی گوت:

"پێت وایە دنیا بەرهەڵدایە. هەرچی پێتان خۆش بێ وا بکەن!".

ئاغا بەڕاستی باش تێك چوو بوو، بە دەنگێکی پڕ لە پاڕانەوەو لاڵانەوەوە گوتی:

ـ جەنابی پشکنەر.

بصری نەڕاندی:

ـ پێم گوتی من پشکنەر نیم.

ئاغا ترسی ئەوەی بوو موشتەرییەکان گوێیان لە قسەکان بێ قۆڵی بصری گرت و بردیە قوژبنێك و دەستی کرد بەسرتەسرت.

پاشان ئێمە وەدەرکەوتین و خاوەن گازینۆش تا بەردەرگامان لەگەڵ هات و زۆر بەرێزەوە بەڕێی کردین.

بصری لەبەرخۆیەوە قسەی دەکردو من حەوسەلەم نەبوو بپرسم مەسەلە چ بوو، بەڕاستی قەلافەتی پیاوی دەتۆقاند. بەرواڵەت وا دیار بوو بصری یەکێك لەفەرمانبەرە پایەبەرزەکانی شارەوانییە، دیارە لە پشکنەر گەورەترە، ڕەنگە سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی پشکنین بێ، ڕەنگە سەرۆکی شارەوانیش بێ!

بصری گوتی:

ـ ئەگەر کارت نیە با بچینە مەکتەبەکەم.

پتر سەرم سوڕما. خودایە، بازرگانە؟ نوێنەری پارلەمانە؟ پارێزەرە؟ چ کارەیە کە مەکتەبی هەیە؟

سواری تاکسی بووین و چووین لەبەردەم گوزەرێکی گەورە دابەزیین.

مەکتەبی بصری ژوورێکی زۆر جوان بوو، فەرش و مێزو قەنەفەی زۆر باشـی تێـدا بوون. کچێکی جوان و ڕێك و پێکیش لەژوورەکەی پێشەوە دانیشتبوو کە دیار بوو سکرتێریەتی.

بصری بــە دەنگێکی سەرۆکانەوە پرسی:

ـ کەس داوای نەکردووم؟

کچەکە دەفتەری یادداشتەکەی بۆ ڕاداشت.

ـ دووکەس داوای چاوپێکەوتنیان کرد، شـەش کـەس تەلـەفۆنیان کـردوەو چـوار بروسکەش گەیشتوون.

بصری بروسکەکانی وەرگرت و چووینە ژوورەکەی پشتەوە. ژوورێکی زۆر لـۆکس بوو. لەدڵی خۆم دا گوتم "حەتمەن یەکێك لە بازرگانە گەورەکانە".

بصری سەیرێکی بروسکەکانی کردو گوتی:

ـ سبەینێ لە ئیتالیاوە میوانم دێن.

پرسیم:

ـ کێن؟

ـ وەفدێکی چوار کەسی‌یە.

زۆر لـە ژووریَ نەماینــەوەو وەدەرکـەوتین، بـۆ هــەر جێگایـەك چـووباین سـواری تاکسی دەبووین.

بصری گوتی:

ـ هیچ پێم خۆش نیە ئوتومبیلی تایبەتیم هەبێ.

سەرێکم بۆ لەقاندو گوتم:

- چاك دەكەی. ئۆتومبیلی تایبەتی ژانەسەری زۆرە. ژانەسەری شۆفێرو خراپ بوون تەنەكچی و هەزار ژانەسەری تر.

- ناوەڵلا، مەسەلە ئەوە نیە. لەبەر ئەوەیە من زوو لە مۆدێل وەڕەز دەبم. بەڵام تاكسی وا نیە هەر مۆدێلێك پێم خۆش بێ سواری دەبم، واتە لە ڕاستیدا هەموو تاكسییەكان دەبنە هی من، هەر مۆدێل و هەر ڕەنگێك حەزی لێ بكەم لەبەردەستم دایە.

هیچ وەك ئەو بصری سەردەمی قوتابخانە نەدەچوو، بەتەواوی گۆڕابوو.

شەوێ سەرمان لەچەند گازینۆو بار دا، خواردمان و خواردمانەوەو كەیفمان كرد. هەرلەوێ لەبارەكەدا كە سێ ژنی بێگانەی جوانمان لەلا دانیشتبوون بۆ چەند دەقیقەیەك لەبیرم چوو كێم و لە كوێم، بەڕاستی بنیادەم كوێرزەینە، چەند زوو دەگۆڕێ.

زۆر لەمێژ بوو دەمزانی خۆشی و لەزەت لەمن حەرامە. دەمزانی هەروەختێك خۆش ڕابوێرم و كەیف بكەم وەك مار پێمەوە دەداتەوە، بەوحاڵەش چەند دەقیقەیەك هەموو شتێكم لەبیر چۆ بۆوە.

لای نیوەشەو چووینەوە مەنزڵەكەی بصری، لە شوققەیەكی سێ ژووری دا لەلای ژنێكی یۆنانی دەژیا. كاری ناوماڵیش هەر ئەو ژنە بۆی دەكرد. كاتێك وەژوور كەوتین ژنەكە بەپیرمانەوە هات و بەخەواڵوویی پرسی:

- جەنابی بصری! ئەمڕۆ تەلەفۆنت كرد هیچت لێ تێنەگەیشتم، لە شارەوانی بووی! كوێت دەپشكنی؟!

هەردووكمان سەرخۆش بووین، بصری پێكەنی و گوتی:

- دایە قاوەیەكمان بۆ ساز بكە.

بەدەست ئەو موعەممایەوە وەخت بوو شێت بم. پرسیم:

- بصری گیان تۆ كارت چیە؟

قاقایەكی كێشاو گوتی:

ـ هێشتا حاڵی نەبووی؟

ـ ناوەڵلا.

ـ هەردووکمان هاوکارین، فەرقی ئەوەیە تـۆ ڕابـردووت هەیـە و مـن نیمـە. ئـەمڕۆ نیوەڕۆ نمونەیەکم نیشان دای. چما نەت دی پێنسەد لیرەم لـە خـاوەن گازینۆکـە وەرگرت؟

ـ نازانم چۆنت لـێ وەرگرت؟

ـ ئەی چووینە قوژینەکە ئەو سرتە سرتەمان چ بوو؟!

ـ بەگیانی تۆ پێم وابوو کاربەدەستێکی پایەبەرزی شارەوانی! وەك بەڕێوەبـەری گشتی پشکنین!

ـ باشە. فەرقی من و کەڵـەکبازێکی خـاوەن ڕابردوو ئەوەیـە. ئـەو دەچـی خـۆی دەکاتە پشکنەرو کارەکەی لـێ ئاشکرا دەبێ، بەڵام دیتت من چۆنم ڕۆڵەکەم یاری کرد؟ جنێوم بەکابرادا چونکە لای وابوو پشکنەرم. دەزانی بۆ وام کرد؟ بۆ ئەوەی قەت بـیری ئـەوە نەکاتـەوە شـکایەتم لـێبکا، بـا وابزانـێ هەرشـکایەتێکی بیکـا دێتەوە بەردەستی خۆم.

ڕاستی‌یەکەی ویستم دەرسێکی تۆ دابدەم کە کەڵەکبازێکی لەمێژینەی.

من لە ژیانی خۆمدا ئەوەندە گێراوم و ئەو هەموو دزو درۆزن و کەڵەکبازو پیاوکوژە جۆراوجۆرەم دیوە بەڵام هیچیان وەك ئەو بصری‌یە نەبوون. لە بصریم پرسی:

ـ باشە ئەگەر لە مەتبەخ سیسرەت نەدیتبایە چیت دەکرد؟

وەك قسەیەکی زۆر سەیرم کردبێ قاقا پێکەنی و گوتی:

ـ مەبەستت ئەوەیە کە هێنـدێك میوانخانـە ڕەنگـە خـاوێن بـن و سیسـرەیان لـێ نەبێ!

ـ بەڵێ، ئەگە شانسەکە نەی‌هێنێ و سیسرە نەبێ تەگبیر چیە؟

بصری دەستێکی بۆ گیرفانی چاکەتەکەی بردو گوتی:

- پیاو نابێ هیچ کاتێك کاری خۆی بەشانس بسپێرێ پاشان قوتووە شقارتەیەکی لەگیرفانی دەرهێناو نیشانی دام:

- بڕوانە ئەم قوتووە! هەمیشە پڕە لە سیسرە. هەر ئەو وەختی کە سەری مەنجەڵەکانم هەڵدەدایەوەو تەماشام دەکردن دووم لەمانە لەسەر سەکۆیەکە بەرەڵا کردن. ئێستا تێگەیشتی کەڵەکبازییش ڕێگای خۆی هەیەو دەبێ بەدەرس فێری بی؟!

ژنەکە قاوەی بۆ هێنایین خوادمانەوەو تا لای بەیانی بەقسەی خۆش ڕامان بوارد. بصری کاری وای کردبوو کە من بەخۆم دا دەشکامەوە، ئەقڵی شەیتانیش پێیان ڕانەدەگەیشت. بصری دەیگوت: ئەگەر گوێ بۆ قسەی من ڕابگری ژیانت دابین دەکەم. بڕیارمان دا دەست وەدەستی یەکتر بدەین و پێکەوە کار بکەین. وەسبەینێ ڕا بەدوو ئوتومبێلی ئاخر مۆدیلەوە چووینە فرۆکەخانە بۆ پێشوازی میوانە ئیتالیایییەکان. ئەو ئوتومبیلانەمان لەبنکەیەك بەکرێ گرتبوو.

من و سکرتێرە جوانەکەی لە ئوتومبیلێك دا دانیشتین و خۆشی بەتەنیا سواری ئەوی تریان بوو. کاتێك میوانەکان دابەزین بصری بە خێراتنی کردن، ئەوەندە ڕەوان بە زمانی فەرەنسەیی قسەی دەکرد سەرم سوڕمابوو.

منی بەناوی بەڕێوەبەری دامەزراوەکە (مؤسسە) پێ ناساندن و دیارە کچەکەش سکرتێر بوو.

لە مەکتەب میوانداریییەکی سەیری لێکردن، پێشەکی دووسێ شووشە ویسکی دەرخوارد دان و پاشان گوتی:

"فەرموون دامەزراوەکەمان ببینن". بۆخۆی پێش کەوت. دەرگای کرێ نشینەکانی گوزەرەکەی دەکردەوە دووسێ قسەی لەگەڵ دەکردن ئەحواڵی دەپرسین و پاشان دەرگای پێوەدەداو دەچۆ شوینێکی تر.

بەکورتی وای نیشان دا کە ئەو گوزەرە هەمووی هی ئەوەو خاوەنی ئەودام و دەزگایانە هەموویان بەردەستی ئەون.

تەنانەت دووسێ دوکانی بەرگدرووی تێدا بوون ئەوانیشی بەمیوانەکان نیشان دان و گوتی"ئەمانە جل و بەرگی فەرمانبەرو کرێکارەکانی خۆمان دەدروون".

میوانەکان دوو ڕۆژ لە ئەستەمبووڵ مانەوە. بصری نەخشـەکەی ئەوەنـدە ڕێـك و پێك کێشابوو کە بەستەزمانانە پەیمانێکی بازرگانی زۆر قورسیان لەگەڵ بەسـت و میلیۆنیك لیرەیان دایە کە شتوومەکی بازرگانییان بۆ بنێرێ.

من لەگەڵ زۆر کەسی کەڵەکبازو تاوانبار سەروکارم بووە، هەموویان هەوڵ دەدەن بەڵگەیەك بۆ ئەو کارانەیان بتاشن و ویژدانی خۆیان ئاسوودە بکەن. هیچیان وەك ئەم بصرییە نەبوون. ئەو بە ئاشکرا شانازی بەوەوە دەکرد کە کڵاو لەسەر خەڵك دەنێ.

ڕۆژێکیان لـێم پرسی:

ـ تۆ کە ئەو هەموو گووکارییەت کردوە، چۆن تا ئێستا پێوە نەبووی؟!

ـ ئەمە هۆی زۆرە. من کارەکانی خۆم وا تێکەڵ پێکەڵ دەکەم کە کەس سـەریان لـێ دەرناکا. هەمیشە سێچوار کەسی دیکـەش تێـوە دەگلێـنم تـا ئەگـەر تـووش بووم چوار پێنجێك لەو سەرزلانەش لەگەڵ من پێـوە بـن. هـەر بۆیـە کـەس کـاری بەکاری من نەداوە.

هۆیەکی تری ئەوەیە کە من قەت کارێك دووجار ناکەم. هەمیشە شێوەی کارەکەم دەگـۆڕم. ئەوانـەی پێـوە دەبـن هەمیشـە چەشـنێك کـار دەکـەن. کاتێـك لـە بەندیخانەش دەردەچن سەرلەنوێ هەر وەدوای کارەکەی پشوویان دەکەونەوە.

هۆی سێهەم ئەوەیە کە من لە سەرەتاوە تا ئێسـتا بەتـەنیام کـار کـردوەو کەسـم نەکردۆتە شەریك.

لەوڵاتی ئێمەدا هێشتا تەربیەتی کۆمەڵایەتی نەگەیشـتۆتە ئـەو ڕادەیـە کـە خـەڵك کاری هەرەوەزی بکەن.

لە تەواوی ئەو دامەزراو و کومپانیایانەدا یەکێك نابینی کە سێ ساڵ بێ کـار بکـا. چونکە هەموویان هەر بیر لەوە دەکەنەوە چۆن کڵاو لەسەری شەریکەکانیان بنێن.

هەریۆیە پیاو ناتوانێ هیچ کارێك بە کۆمەڵ بکا. ئەویش دزی بە کۆمەڵ! ئێوەی خاوەن پێشینە بۆیە تووش دەبن کە باوەڕتان بە خۆتان نیەو هەل ومەرجی وڵاتی خۆتان باش ناناسن.

بصری سەرەنجام فەلسەفەی دوورو درێژی خۆی بۆهەڵڕشتم و ئەمجار گوتی:

ـ زوو سازبە بڕۆین.

ـ بۆ کوێ.

ـ بچینە ئەنقەرە.

ـ بۆچی؟!

ـ پێکەنی و گوتی:

ـ بزانە هێشتا چەند کاڵی. کەرە گیان ئاخر نازانی پیاو دەبێ پارە لە جێگایەك پەیدا بکاو لە جێگایەکی تر بیخوا. ئێمە دەبێ هەرچی زووتر لە ئەستەمبوڵ بڕۆین هەتا ئەو ئیتالیایانە نەتوانن شوێنمان هەڵگرن.

بە دوو جانتا پارەوە کەوتینەڕێ. لێم پرسی:

ـ باشە ئەی تەگبیری ئەم شتوومەکەی مەکتەب چیە؟

ـ کوڕە گوێ مەدەرێ. با بۆسکرتێرەکەم بن. بە مەرجێك ئاقڵ بێ و پێش ئەوەی حکومەت دەستیان بەسەردا بگرێ لە ناویان بەرێ.

من زۆرم دەربەدەری کێشاوە، زۆرم ئەم شارو ئەم شار کردوە، بەڵام قەت هێندەی ئەو ڕۆژە خەمناك نەبووم. پێم خۆش نەبوو لە ئەستەمبوڵ بڕۆم. دڵم خەبەری دابوو کە تووشی بەدبەختی‌یەکی تازە دەبم.

بەڵام چارە نەبوو. لەکاتێك دا سەرم لێ شێوابوو و نەم دەزانی بصری چۆنم ڕەفتار لەگەڵ دەکا، سواری قەتار بووین و بەرەو ئەنقەرە کەوتینەڕێ.

لەبەر پەنجەرەی قەتار وێستابووم، تەماشای دەوروبەری ڕێگام دەکردو بیرم لە حاڵی خۆم دەکردەوە. بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕابردوو هەروەك دارتەلەکان بە خێرایی بەبەر چاوم دا تێدەپەڕین. لەدڵی خۆم دا گوتم:

"تۆ کابرایەکی خاوەن ڕابردووی، هەموو ڕێگایەکت لـێ بەسـتراوە، تـەنیا ڕێگـای بەندیخانەت لە پێشە".

بڕیارم دا خۆم بدەمە دەم ئاوەکە. ئیتر لەمەولا نەم دەویست بەبێ ئامـانج هـەوڵ بدەم و بە پێچەوانەی لافاو پێ هەلگەڕێم.

باوەڕم بەقەزاو قەدەر نیە. نازانم ژیانی من بۆچی هێندە سەیرو سەمەرەیەو هـیچ کارێکم بەدەست خۆم نیە.

بصری نەخشە تازەکەی بۆ باس کردم. یارییەکی مەترسیدار بـوو. هـەموو گیـانم لەرزی. ئەگەر لەبەر تەماحی ئەو بەشە نەبایە کە قەرار بوو بمداتێ هەرلەوێ لێـی جیا دەبوومەوەو وەدوای کاری خۆم دەکەوتم، بەڵام مـاڵی تـەماح خرابـێ کـە زۆر کەسی بەدبەخت کردوە، ئەو نەخشەی بصـری کێشـابووی داهـاتی زۆر بـوو، زوو دەبوومە میلیۆنێرو ئـەو ئاواتـە دێرینـەم وەدی دەهـات. کـە گەیشـتینە ئەنقـەرە بصری گوتی:

ـ دەبێ دەسبەجێ دەست بەکاربکەین.

ـ بابە دوسێ ڕۆژ ڕاوەستە پشوویەك بدەین.

ـ نا، گیانەکەم وەخت ئاڵتوونە. نابێ دەرفەت لە کیس خۆمان بدەین. ئـەو کـارە تازە کە دەست پێکرابوو زۆر خەتەر ناك بوو: پارە چاپ کردن!

زۆر ترسان؟ هەقتانە. ئەم کارە گاڵتە نیە. ئەگەر پیاو تووش بێ پەندێکی بەسەر دێنن بۆ حەوت پشتی تەمبێ دەکەن.

خۆتـان بـاش بـیری لـێبکەنەوە منـی قوڕبەسـەر کـە دەمەویسـت ئـەو نەخشـە خەتەرناکە جێبەجێ بکەم لە چ حاڵێك دا بووم؟

دووسێ جار خەریك بووم دەستی لێهەڵگرم و بڕۆم کارێکی دیکە پەیدا بکەم. خۆ پارووەنانێك قات نەبووە. بەڵام ماڵی تەماح خرابێ کە نەیهێشت بڕیار بدەم.

بصری دەسبەجێ ئامرازی کاری ئامادە کرد، ماکینەی چاپ، ڕەنگ و هەموو کەرەستەی پێویست. هەمووی کڕین و خانووێکی دووری لە دەرەوەی ئەنقەرە بەکرێ گرت.

ئەم خانووە لە نیزیك ڕێگای قەتار بوو. دو ئیزگەی قەتار لە ئەنقەرە دوور بوو. هەموو کارەکان بەپێی نەخشەیەکی ورد دەچوونە پێش.

کاتێك ماکینەو کەل وپەلەکەمان بردن کارە بنەڕەتیەکە دەستی پێکرد.

بەڕاستی پێتان وانەبێ دەمانەویست پارە چاپ بکەین؟ نا، ئەو کارە زۆر دژوارەو کاری هەموو کەس نیە. نەخشەکەی ئێمە زۆر لەوە هاسانترو بێ ژانەسەرتر بوو.

بۆ بەیانی بصری چووە لای سەڕڕافێکی گەورە کە یەکێك لە جوولەکەکانی ئەنقەرەیەو پیاوێکی پارەدارو ناسراوە. پێنج هەزار لیرەییەکی دەرهێناو گوتی:

ببوورە دەکرێ ئەمەمان بۆ ورد بکەیەوە؟ مالّ خراپە دەسبەجێ سندووقەکەی کردەوەو بۆی ورد کردینەوە. لای نیوەڕۆ دیسان چووە لای و هەزار لیرەیی یەکی وێ دا:

ــ زۆر ببوورە، ئەمەش ورد بکەوەو هەقی زەحمەتی خۆشتی لێ هەلّگرە.

کابرا کە بەبیستنی هەقی زەحمەت زاری پڕ ببوو لە ناو پێکەنینێکی وای کرد کە ددانە کرمێیەکانی دەرکەوتن:

تکات لێدەکەم. ئەم قسانە چین؟

بەلاّم چونکە جاری پێشو دیتبووی کە بصری پارەکەی نەژماردو هەروا خستیە گیرفانی، بەوهیوایە کە "کوڕە حاجی"یەکی گیر کەوتوە لەجیاتی هەزار لیرە نۆسەد لیرەی ژماردو دایە دەست بصری.

ــ فەرموو قوربان.

بصری دیسان پارەکەی بێ ژماردن خستە گیرفانی و گوتی: "زۆر سوپاس"

ئێوارێ دیسان چووە لای و کاغەزێکی سەد لیرەیی وێدا:

ــ کاکە بمبوورە توخوا ئەمەش...

ـ تکات لـێدەکەم، کاکە؟ کاری ئێمە ئەوەیە. ڕۆژێ دەجار تەشریفتان بێ، سەرسەرم.

ئەمجارەیان هەشتا لیرەی ژماردو دایە دەست بصری.

سەعات هەشت و نۆی شەو کە سەڕڕاف خەریك بوو دای بخا، بصری دووبارە چۆوە لای. سەرراف کە چاوی بەو موشتەرییە دەبەنگە کەوت زەردەخەنەیەکی هاتێ:

ـ ئەمرێکتان هەبوو؟

بصری لە کاتێك دا وای نیشان دەدا کە لەشتێك دەترسێ، تەماشایەکی ئەم لاو ئەولای خۆی کردو پاشان سەری بردە پێش و بەسپایی پێی گوت:

ئەو پارانەی داومن بەتۆ قەڵب بوون.

وەك کوتکت لەسەری کابرای سەرراف دابێ، تێك ڕابوو، هەرئەوەندە بوو دیقی نەکرد:

ـ چی؟ کاکە. توخوا بەڕاستیتە؟

ـ بەڵێ.

سەڕڕاف خەریك بوو هاوار کاو کارەکە پیس بێ!

بصری زۆر هێدی و لە سەرەخۆ گوتی:

ـ کاکە ئابڕووومان مەبە، من هاتووم پارەی ئەسڵت بدەمێ و ئەوانت لێ وەربگرمەوە. فەرموو.

دەسبەجێ سێ هەزار لیرەی دەرهێناو خستیە سەرمێزی سەڕڕافەکە.

کابرای سەڕڕاف کە دەست و لاقی وەك مێژۆك دەلەرزین هەستی دەکرد ئەم ماستە بێموو نیە، ناکا ئەو موشتەرییە بیهەوێ کڵاوێکی لەسەرنێ. نەیدەوێرا سندووقەکەی بکاتەوە. ئیتر نەیدەزانی بصری زۆر لەو کەڵەکبازو دایکی خۆگێتره.

بصری نەختێك کشاوە دواوەو گوتی:

کاکە! ئەم پارەیە لای تۆ بێ. بەکاوەخۆ پارەکەی من بدۆزەوەو جیای کەوە بەیانی بۆی دێمەوە. بەڵام تکات لێدەکەم هەر لەبەر خاتری خۆشت بێ لەلای پۆلیس و خەڵکی تر مەی درکێنە. ئەگینا بۆخۆت پێوە دەبی.

بصری ڕۆیشت و کابرای جوولەکە هەتا نیوەشەو ئەو پارەی کە ئەو ڕۆژە لەخەڵکی وەرگرتبوو خستیە ژێر زەڕەبین، بەڵام هەرچی کرد پارە قەڵبەکانی نەدۆزیەوە.

بصری بەیانی زوو چۆوە:

ـ کاکە دۆزیتنەوە؟

ـ نەخێر. نەمتوانی بیان دۆزمەوە.

بصری زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ دەمزانی بۆت نادۆزرێنەوە. نەك هەرتۆ، گرەو دەکەم هەموو پسپۆڕەکانی دنیا کۆ وەبن ناتوانن ئەو پارانەی من چاپم کردوون لەگەڵ ئەسڵەکان لێك بکەنەوە. بەمەرجێك لەنێو خۆمان دەرنەچێ و بەکەس نەڵێی ئامادەم هەموو مانگێك سەد هەزار لیرەت لەم پارانە بدەمێ.

کابرای سەڕڕاف دەتگوت ئیزرائیلی میوانەو ئێستا نا ئێستا گیانی دەکێشێ. بێدەنگ پاڵی وەکورسیەکە دابوو و گوێی بۆ قسەکانی بصری ڕاگرتبوو. هێشتا نەیدەتوانی باوەڕ بکا کە ئەمە ڕاستە.

بصری بۆ ئەوەی زەبری دووهەم بوەشێنێ و بەشی دووهەمی نەخشەکەی جێبەجێ بکا گوتی:

ـ هەر ئێستا هەستە لەگەڵم وەرە بۆ کارگەکەم. لەو کاغەزە چاپ کراوانە چەندی پێت خۆشە بێنەو بەوردی تاقی بکەوە ئەگەر قسەکەم ڕاست بوو سەودا دەکەین.

بصری و کابرای جوولەکە هاتنەوە کارگە. من لەوێ وەك کرێکاری فەننی کارم دەکرد.

لەیەکێك لە ژوورەکانی بنەوەدا ماکینەی چاپمان دامەزراندبوو. پارەیەکی کاغەزی زۆرمان بەپەرش و بڵاوی لەسەر تاقەکان و لەسەر زەوی دانابوو.

بصری منی پێ ناساندو پارەکانی پێ نیشان دا:

ـ کامەیانت پێخۆشە هەڵی گرەو تاقی بکەوە.

کابرا چەند کاغەزی وردو درشتی جیاکردەوەو ڕۆیشت.

سەڕڕاف بەو مەرجە ڕازی بوو کە ئێمە هەموو پارەکە لە ژووری بژمێرین و تەسلیمی بکەین. پاشان ئەو پارەکەی خۆی کاتی گەڕانەوە لەقەتاردا تەسلیمی ئێمە بکا.

بصری ئەو مەرجەی قبوڵ کرد. ئێمە دەبوو سەد هەزار لیرە لەو پارانە کە دەمانگوت خۆمان چاپمان کردوون و لەڕاستیش دا پارەی ڕاست و حیسێبی بوون بدەین و پەنجا هەزار لیرە لە سەڕڕاف وەربگرین.

دیارە پێتان سەیرە، یانی چی؟ چما ئێمە گیامان بەکێوی یەوە خواردبوو؟ بەڵام نەختێك ڕاوەستن با تەواوی نەخشەکەتان بۆ باس بکەم.

قەرارو مەداری ئێمە ئەوە بوو کاتێك من لەقەتاردا پارەکەم وەرگرت لە یەکەم ئێزگە دابەزم و ڕاستەڕێ بچمە فرۆکەخانەو چاوەڕوانی بصری بم.

کاری بصریش ئەوە بوو پاش ڕۆیشتنی قەتار تەلەفۆن بۆ ئێزگەکەی تر بکاو پۆلیسی ڕێگای ئاسن تێبگەیەنێ کە جانتایەکەی بە سەدهەزار لیرەوە لەفلان فارغون دا لێ بەجێماوەو پاش ئەوەی هەموو نیشانەکانی پێگوتن داوایان لێ بکا کە جانتاکە ڕاگرن تا خۆی دەچێ.

نەخشەکە بەتەواوی ڕاست بوو. ئێمە دڵنیا بووین کاتێك پۆلیس بچێتە کوپەی کابرای سەڕڕاف و پرسیار بکا ئەم جانتایە هی کێیە، سەڕڕاف لە ترسی ئەوەی پارەکان قەڵب بن دەڵێ نازانم. بەوجۆرە بەبێ ماندوبوون پەنجا هەزار لیرەمان دەست دەکەوێ و دەتوانین بەدڵێکی ئاسوودەوە بچینە یەکێك لە وڵاتانی دراوسێو لەوێش شانسی خۆمان تاقی بکەینەوە.

سەرڕاف هاتەماڵێ. بصری سەدهەزار لیرەی خستە جانتایەك. لەپێش چاوی کابرا ژماردمان و دامانە دەست.

منیش لەگەڵ سەرڕاف چووم سواری قەتار بووم کە پەنجا هەزار لیرەکەی لێ وەربگرم.

لە نێو قەتارەکە دا کوڕی کابرای سەرڕاف چاوەڕێمان بوو. جانتایەکی دایە دەستم کە پەنجا هەزار لیرەی تێدا بوو. هەر لەوێ بەسەرم کردەوە تەواو پەنجا هەزار لیرە بوو.

بەم جۆرە بەخاترجەمی چوومە دەرێ.

لە ئێزگەی دواتر دابەزیم. چەند هەنگاوێك ڕۆیشتم دەستم قورس بوو. یەکێك دەستی خستە سەر شانم. ئاوڕم دایەوە دیتم پۆلیسە گوتی:

ـ وەدوام کەوە!

ترسام بەڵام زۆرنا. لەدڵی خۆم دا گوتم: "ئەمجار بەهەڵە چووی".

ئەفسەری پۆلیس گوتی:

ـ ڕاستم پێ بڵێ ئەم پارانەت لە کوێ بووە. ئەمانە قەڵبن...!!

قەڵەمی دەست و پێیانم شکاو زمانم ڕەق بوو. تازە تێگەیشتم کابرای سەرڕاف چ کڵاوێکی لەسەر ناوین. پاش ئەوەی من دابەزیم ئەویش دابەزی بوو و جانتای پارەکەی بردبوو. بصریش دەستی لەهیچ گیر نەبوو.

برایان! بەخۆڕایی پێم پێمەکەنن. پێویستیش نیە بۆم بەپەرۆش بن. بۆخۆشم نازانم چ ناوێك لەو بەسەرهاتەی خۆم بنێم، قیسمەت، چارەنووس، یان هەر ژەهرەمارێکی تر؟!

وەك دەڵێن "فەقیری خۆشە قوڕتی ناخۆشە".

بەڵام هەرچی بێ ئەمجارەیان کەس بەتاوانبار نازانم. ئەمجار من نەبوومە داردەستی کەس. لەسەر هیچ کەس ناچمە بەندیخانە. دەچم سزای کاری خراپی خۆم وەربگرم، سزای کەڵەکبازییەك دەکێشم کە بەئەنقەست خەریك بووم بیکەم.

هەرچۆنێک بێت؛ دڵنیام کە ئەمجار زۆر دەمێنمەوەو بە پێچەوانەی جاران کە چونکە بێ تاوان دەگیرام زوو بەردەبووم، ئەم جار بەخاترجەمی دەبێ پاڵی لێ بدەمەوە. زۆرم کۆمەگ پێبکەن هەرێ لە بیست ساڵ. هەتا بیست ساڵی دیکەش خوا دەزانێ کێ دەمرێ و کێ دەمێنێ.

لەوانەشە قیسمەت جارێکی دیکە دەرەوەی بەندیخانەم پێ نیشان بداتەوە. لەوانەیە بشمێنم و دووبارە پێشهات و کارەساتی سەیرو سەمەرە ببینم. پیاو هەتا نەمرێ نازانێ چی بەسەر دێ.

تەواو